www.alibapir.com

عەلی باپیر

# ڕوانینێکی ئیسلامیانە بۆ واقیعی ئێستامان

## گرفت و چارەسەر



التفسير



# ڕوانینێکی ئیسلامیانە بۆ واقیعی ئێستامان

## گرفت و چارەسەر

**نووســـینـی**
عەلی باپیـــر

**بڵاوكردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە و بــەرگ**
نەوزاد کۆیی

**خـەتی بــەرگ**
نـەوزاد كۆیـی

**قەبارەی كتێب**
١٧×٢٤- ( ٢٩٢ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەكەم ١٤٣٨ ك - ٢٠١٦ ز

**تـــــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان / هەرێمی كوردستان
ژمارەی سپاردنی ( ٤٥٧ ) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com


/TafseerOffice

www.alibapir.com

# ڕوانینێکی ئیسلامیانە بۆ واقیعی ئێستامان

## گرفت و چارەسەر


نووسینی

عـەلی بـاپیـر






بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿..قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥
يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم
مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ
مُّسۡتَقِيمٖ ١٦﴾ (المائدة)

## پێشکەش بێ

بە هەموو ئەوانەی دڵسۆزانە مشووری کۆمەڵگاکەیان دەخۆن و، لێبڕاوانە هەوڵی پارێزگاریی لێکردنی دەستکەوتەکانی و چارەسەرکردنی کێشە و قەیران و گرفتەکانی دەدەن.





# پێشەکی و ڕێ خۆشکردن

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كَلَامُ اللَّهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٍ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ.

## خوێنەری بەڕێز:

حاڵەتی ئاسایی و سروشتی هەر مرۆڤێك، ئەوەیە کە خەلك و وڵاتی خۆی خۆشبوێت و بەتەنگیانەوە بێ و، بە گوێرەی توانای مشووریان لێ بخوات و بەرگرییان لێ بکات و بەرژەوەندییەکان (مصالح)یان بۆ دابین بکات، ئاشکراشە بەرژەوەندیی (مصلحة)بریتیە لە: لێ دورخستنەوەی زیان و هێنانە پێشی سوود (دفع الضرر وجلب النفع).

بگرە لە ڕوانگەی شەرعەوە: خەمخواردن لە کۆمەڵگا و بەتەنگەوەبوونی و دڵسۆزیی بۆ نواندنی، بەمەرجێکی بنەڕەتیی دینداریی و مسوڵمانەتیی دانراوە و، کراوە بە هۆکاریی سەرفرازیی (فلاح)، وەك خوای بەخشندەی بەبەزەیی فەرموویەتی:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٠٤

واتە: دەبا کۆمەڵێکتان هەبێ- ئەی مسوڵمانینە! - بانگەواز بکەن بۆ چاکە و، فەرمان بەهەرچی پەسەندە بکەن و، ڕێگریی لە هەرچی ناپەسەندە بکەن. وە هەر ئەوانەیش سەرفرازن.

پێغەمبەری کۆتاییش(محمد) صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە، کە دەبێ مرۆڤی موسوڵمان خەمخۆر و دڵسۆزی خەڵك و وڵات،بگرە مسوڵمانان بێ بەگشتی فەرموویەتی:

(...ومن أصبح لايهتم بالمسلمين فليس منهم) رواه الحاكم ورمز السيوطي لصحته.[1]

واتە: هەر کەسێك حاڵی وابێ کە خەم لە مسوڵمانان نەخوات لەوان نیە!

هەربۆیەش وەك کوردێك و کوردستانییەکی مسوڵمان: بەردەوام هەم فیترەت و هەم شەریعەت، یان هەم عەقڵ و هەم نەقڵ هانیان داوم و هانم دەدەن، کە بۆ خەڵك

---

(١) فيض القدير: ٨٤٥٣، وضَعَّفه الألباني في ضعيف الجامع.

و وڵاتم - بگرە بۆ تێکڕای بەشەر لەسەر زەمین، دڵسۆز و بە مشۆر و خەمخۆر بم و هەرچی لە دەستم بێ و بۆم بلوێ بیکەم، بۆ بەختەوەرکردنی خەڵك و کۆمەڵگایەکەم و، پاراستن و ئاوەدانیی خاك و نیشتیمانەکەم.

ئنجا بینا لەسەر ئەوە، کە ڕابرد: بەردەوام هەوڵم داوە - بەهەرشێوازێك کە بۆم دەکرێ - چ لە نووسین و، چ لە کۆڕ و سیمینار و، چ لە گفتوگۆ و چاوپێکەوتن و، چ لە کۆبوونەوە سیاسییە تایبەتیی و دوو قۆڵیی و چەند قۆڵییەکان دا بەپێویستی بزانم بۆ هێنانە دی بەرژەوەندییەکانی خەڵك و وڵاتم، بیخەمە ڕوو، بەشێوەیەکی ڕوون و ڕاشکاو و بە زمانێك، کە هەمووکەس لێی تێبگات.

**ئنجا ئەم کتێبەی بەردەستت کۆی ژمارەیەك لەو هەوڵانەی بەندەیە لەو بوارەدا، کە بەگشتی دوو بەشە:**

**بەشی یەکەم:** واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە.
**بەشی دووەم:** قورئان بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخی ئێستامان چیمان پێ دەفەرموێ؟![1]

شایانی باسیشە بەشی یەکەم، کە سێ تەوەرەیە، کاتی خۆی لە ساڵی ٢٠٠٨ز دا لە دوو توێی کتێبێك دا چاپ و بڵاوکراوەتەوە، وەك لە پێشەکی بەشی یەکەم دا باسمان کردووە، هەر بۆیەش ئەم چاپەمان بەچاپی دووە داناوە و هیچ جۆرە دەستکاریەکی هیچ کام لە سێ وتارەکانمان نەکردووە، لەم چاپەدا جگە لە ڕاستکردنەوەی هەندێك هەڵەی چاپیی و باشتر (تخریج) کردنی هەندێك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

جێی سەرنجیشە کە ئەوەی کاتی خۆی- بەر لە هەشت ساڵ (٢٠٠٨ز) - لەبارەی کێشە و قەیرانەکانمان و چۆنیەتی چارەسەرکردنیانەوە، گوتوومانە، دەڵێی تازە گوتراوە!

---

(١) کاتی خۆی لە ژێر ناوونیشانی: (بۆ چاککردنی ئەو دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین!) دا بڵاوم کردەوە، بەڵام بەپەسەندم زانی ئێستا ئاوای لێبکەم، چونکە خوێنەری وا هەبوو وایزانیبوو، کە مەبەستم ئەوەیە: گوێ لە خوێندنی قورئان بگرین بۆچارەسەری گرفت و کێشەکانمان!!

بەڵام بەشی دووەم کۆی ئەو زنجیرە وتارەیە کە بە بیست و شەش(٢٦) ئاڵقە لە لاپەڕەی تایبەتی خۆم دا، لەماوەی دوو سێ مانگی ڕابردوودا - بڵاوم کردەوە، کە بیست و پێنج(٢٥) بنەمای قورئانی گەورەو گرنگم خستووتە ڕوو، کە پێم وایە لێتێگەیشتنیان و پاشان کارپێکردن و پێوەپابەندبوونیان، ڕێیەکی ئاچووخ و تەختە بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانمان و دەربازبوونمان لەو دۆخە ناهەموار و قەیراناویی یەی، کە تێیکەوتووین، چ لەسەر ئاستی هەرێم و چ لەسەر ئاستی عێراقیش بەگشتی.

هیوادارییشم خوێنەر و ڕۆشنبیران بەگشتی و، سیاسییە بەرپرس و کاربەدەست و بڕیار بەدەستەکان بەتایبەتی، بە دڵێکی ساف و ساغ و بێگرێ و گۆڵ و غەرەزەوە، ئەم کتێبە بخوێننەوە و، بۆ چارەسەرکردنی کێشە و قەیرانەکانمان، لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستان بەتایبەت و عێراق بەگشتی، کە پشوویان بە خەڵك و جەماوەرەکەمان سوارکردووە تەواو تەواو بێزار کردووە خەریکە نا ئومێد یشیان دەکات، بەهرەی لێوەربگرن و هەرچی بەهەق و باشی دەزانن، وەری بگرن و ئەوی دیکەش، کە پێیان وایە ناهەق و بێ کەڵکە بەسەرم دا بدەنەوە، چونکەوەك گوتراوە: (ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی!) بەڵام باهەموو لایەك دڵنیا بین کە:

ئەگەر هەرچی زووترە بەرپرس و بڕیاربەدەستانی وڵات - لە هەرێم و عێراق دا- ئیرادەی دڵسۆزانەی جیددیی نەخەنە کار و، وردبینانە و دووربینانە و دەستگەرمانە، قۆڵی پاکسازیی و چاکسازیی لێ هەڵنەماڵن و، گەسك بە ستەم و قۆرخکاریی وگەندەڵیی و، پەکخستنی دامەزراوەکان وپێشێلکردنی یاساو هەموو ئەو دەرهاویشتە خراپانەی لێیان کەوتوونەوە، نەدەن و ڕا نەماڵن، با دڵنیابن کە ئەم بارودۆخە پڕ قەیران و گرفت و کێشە و نەخۆشییە، ڕاگرەکان (مقوِّمات)ی مانەوە و نەماون و بەرەو هەرەس و هەڵدێر دەچن!

هیوادارم ڕەخنە و پێشنیار و سەرنج و، دەست خستنە سەر برین و نەخۆشییەکانی بەندە و خەڵك وکۆمەڵگایەکەم بەگشتی و، ئەوانەی ڕووی قسەکانم لێیانە - کە بەرپرس و بڕیار بەدەستانن - ئەو دێرە شیعرەی (درید بن

الصمة) ی ڕیش سپی هۆزی (هوازن)ی بەسەردا نەچەسپیː، کە لە ئەنجامی گویː لیː نەگرتنی گەلەکەیدا بۆ بیروڕاو پیشنیارەکانی، تووشی زیان و پەشیمانیی بوون:

أمرتكم أمري بمنعرج الّوى فلم تستبينوا النّصْحَ الّا ضُحى الغَدِ[1]

واتە: من ڕای خۆمم پیتان گوت لە (مونعەرەج وللیوا) بەڵام چیشتەنگاوی ڕۆژی دوایی دڵسۆزییەکەمتان بۆ دەردەکەوت. واتە: دوای ئەوەی دوژمن زەفەری پیبردن و تیکشکان! یانی: پاش بارانان کەپەنەك!

خوا بەکەرەم ولوطفی بیː سنووری خۆی، چاوی عەقل و دڵمان بکاتەوە و، کە واقیعەکەمان وەك خۆی ببینین، وە ویڕای دنیا، دواڕۆژیشمان لەبەرچاو بیː و نەکەوینە تەڵە و داوی نەفس و شەیتانەوە، تووشی لە خۆبایی بوون (غرور) نەبین چونکە: (الغرور يَقْصِمُ الظّهور) - لە خۆبایی بوون پشتان دەشکینیː - وەهیچ کات لە خەڵك و جەماوەر، بیː منەت نەبین و لە تۆڵە و سزای خوا تەئمین نەبین، ئامین.

٣رەجەبی ١٤٣٧ کۆچی

١٠مایسی ٢٠١٦ زایینی

تورکیا / مەلاتیا[2]

---

(١) بروانە: نهج البلاغة، ص١٠٠، تحقيق: مؤسسة النشر الإسلامي ٢٠١٣/١٤٣٤.

(٢) لە ڕۆژانی: ١٠و ١١و ١٢ی مایس دا، بە بۆنەی وەرگیڕانی کتیبی: ( (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)ەوە، بۆ زمانی تورکی، لەلایەن شارەوانیی پاریزگای (مەلاتیا) وە بانگهیشت کرابووم.

# پێشەکی بەشی یەکەم

**خوێنەری بەڕێز!**

هیچ گومانی تێدا نیە، کە ئێمەی خەڵك و دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق، هەر عەقیدەو فیکرەو ڕێبازێکمان هەبێ و، چ بەهرەمەند (مُستفید) بین، چ زەرەرمەند (مُتَضَرِّر)، سەرەنجام چارەنووس و ئایندەمان پێکەوە گرێدراو و پەیوەستەو، وەك سواربوانی کەشتییەك واین، کە بە دەربازبوونی، هەموو لایەکمان دەرباز و، بە پەککەوتن و شکانیشی، هەموو لایەکمان کەم و زۆر زیانبار دەبین.

بۆیە خەم خواردن لە واقیعی ئێستای خەڵك و وڵاتەکەمان و، هەوڵدان بۆ پاراستن و گەشەپێدانی دەستکەوت و لایەنە چاکەکانی و، نەهێشتن و چارەسەرکردنی کەم و کووڕیی و کێشەو گیروگرفتەکانی، ئەرکی سەرشانی هەموولایەکمانە.

بەندەش وەك هاووڵاتیی و تاکێکی کۆمەڵگاکەم و، وەك ئەرکێکی سەرشانم بەمەبەستی بەختەوەرکردنی میللەتەکەم و سەرفرازکردنی لە دنیاو دواڕۆژدا، لە سەرجەم قۆناغەکانی ژیان و گوزەرانیدا، بە پێی توانا هەوڵم داوە چی بەڕاست و چاك دەزانم، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت و عەقڵ و مەنتیق و واقیع بینیدا، بیخەمە ڕوو.

ئەم بەرهەمەی بەردەستیشت، بۆ ئەم قۆناغ و هەل ومەرجەی ئێستامان بەرجەستەکەری دیدو بۆچوونی ئیسلامییانەی بەندەیە، بۆ چۆنیەتی خوێندنەوەی واقیعی ئێستامان و، پاراستنی دەستکەوت و لایەنە چاکەکانی و، چارەسەرکردن و بنبڕکردنی کەم وکووڕیی و لایەنە خراپەکانی.

شایانی باسیشه ئەم بەشه، كۆی سێ وتاره، كه له سێ كۆڕدا دراون، بەم شێوەیه، هەڵبەته دوای پێداچووونەوەو دەستكارییی:

یەكەم: (ئیسلام و چارەسەری كێشەو قەیرانەكانمان)[1] كه له (٢٠٠٧/٦/٢٥) له مزگەوتی (حاجی شێركۆی هەمەوەند) له شارۆچكەی چەمچەماڵ لەكۆڕیكدا، كه بەهەمان ناوونیشان بەسترابوو، پێشكەش كراوه.

دووەم: (واقیعی هەرێمی كوردستان: گرفت و چارەسەر)[2] كه له (٢٠٠٨/٣/٤) له هۆڵی ڕۆشنبیریی له شاری هەولێر، له كۆڕێكدا كه به هەمان ناوونیشان بەسترابوو، پێشكەش كراوه.

سێیەم: (ڕووەو چاكسازییەكی بنەڕەتیی، له واقیعی هەرێمی كوردستان دا)[3] كه له (٢٠٠٨/٤/١٧) له هۆڵی ئۆسكار له شارۆچكەی كۆیه له كۆڕێكدا، كه به ناوونیشانی: (واقیعی ئێستامان و ئەركی سەرشانمان) بەسترابوو، پێشكەش كراوه.

هیواداریشم توانیبم، كه له دووتوێی ئەم بەشەدا، بەشێوەیەكی واقیعبینانه و ڕاست و دروست، پەنجه بخەمه سەر كێشەو قەیران و گرفت و كەم وكووڕییه بنەڕەتییەكانی هەرێمی كوردستان و، چۆنیەتی چارەسەركردنیان.

٢٦ / جُمادي الثانية / ١٤٢٩هـ

٣٠ / حوزەیرانی / ٢٠٠٨ ز

هەولێر

-----------------------------

(١) ئەم بابەته به (٢) ئاڵقه له هەفتەنامەی (میدیا)دا بڵاوكراوەتەوه، ژمارەكانی (٢٩٩،٢٩٨).

(٢) ئەم بابەته به (٥) ئاڵقه له هەفتەنامەی (میدیا)دا بڵاوكراوەتەوه، ژمارەكانی (٣٣٦-٣٤٠) سوپاسی سەرنووسەری بەڕێزی هەفتەنامەی (میدیا)و سەرجەم ستافەكەی دەكەم.

(٣) ئەم بابەته به (٨) ئاڵقه له ڕۆژنامەی (ڕۆژنامه)دا له ژمارەكانی (٢٤٢-٢٤٩) بڵاوكراوەتەوه، سوپاسی سەرنووسەری بەڕێزی ڕۆژنامەی (ڕۆژنامه)و سەرجەم ستافەكەی دەكەم.

## تێبینی:

ئەم (وتارە) لەو کۆڕەدا دراوە، کە لە ڕۆژی (٢٠٠٧/٦/٢٥) لە مزگەوتی (حاجی شێرکۆی هەمەوەند) لەشارۆچکەی چەمچەماڵ بەستراو، وەزارەتی ئەوقاف بە کۆبوونەوەیەکی حیزبیی ناوزەدی کردبووو، هەرکام لە ڕۆژنامەی (خەبات)و (کوردستانی نوێ)ی ڕۆژی ٢٠٠٧/٧/٤، ئاماژەیان پێدابوو!!

بۆیەش بەپێویستم زانی، پاش دەستپێداهێنانێکی کەم و بێ دەستکاریی نێوەڕۆکەکەی، بڵاوی بکەینەوە، تاکو هەم نێوەڕۆکەکەی بەخوێنەران بگات، کە پێموایە چەند شتێکی گرنگی تێدان، بۆ ئەم قۆناغ و هەلومەرجەمان و، هەم بشزانرێ کە هەم وەزارەتی ئەوقاف و، هەم هەردووك ڕۆژنامەی (خەبات)و (کوردستانی نوێ)ش خراپ بە هەڵەداچوون، یان بە هەڵەدابراون، کە ئەو کۆڕە جەماوەرییەیان بە کۆبوونەوەی حیزبیی ناوزەد کردبوو، لەحاڵێکدا کە کەم و زۆر باسی حیزبایەتیی و (کۆمەڵی ئیسلامیی) تێدا نەکرابوو!

هەرچەندە قەدەغەکردنی دەرس و دەورو ئامۆژگاریی و وتاری ئیسلامیی بە بیانووی سیاسی بوونییەوە، لە مزگەوتەکاندا، شتێکی بێجێ و ستەمێکی بێ پاساوە، زوڵمێکە هەم لە ماڵەکانی خواو هەم لە مسوڵمانانیش دەکرێ، چونکە مزگەوت جێگاو کانگای خواپەرستیی و پەروەردەبوونی مسوڵمانانەو، هەم خواپەرستیی و هەم پەروردەش لە ئیسلامدا، پێویستە گشتگیرو هەمەلایەنە بن.

# دەستپێك

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه.

جەماوەری مسوڵمانی شاری چەمچەماڵ و دەوربەری!

السلام عليكم و رحمة الله

خۆشحاڵم کە بەدیداری ئێوەی بەڕێزو خۆشەویست شاد دەبم.

**بەڕێـزان!**

ئەو بابەتەی بۆم ئامادە کردووە، کە لەم ئێوارە کۆڕەدا، پێشکەشی ئێوەی بەڕێزی بکەم، بابەتێکە پێموایە، کە خولیای دڵ و دەروونی هەموو لایەکمانە، ئەویش ئەوەیە: کە ئایا ئیسلام دوایین بەرنامەی خواو ڕاستە شەقامی پێغەمبەری سەروەرمان (صلى الله عليه وسلم) چۆن چارەسەر دادەنێ بۆ کێشەو قەیرانەکانی ئێمە، وەك خەڵك و کۆمەڵگای مسوڵمانی کوردستان، لەم هەرێمەی کوردستانی عێراقدا؟!

جارێ لەلای کەسمان شاراوە نیە، کە ئێمە هەم کۆمەڵێك کێشەمان هەن و هەم کۆمەڵێك قەیران، دیارە مەبەستم لە وشەی (کێشە) ئەو شتانەن، کە لەنێوان خۆمان و غەیری خۆمان دان، بۆ وێنە: کێشەمان هەیە لەسەر مەسەلەی فیدڕاڵیی، لەسەر کەرکوك و مادەی (١٤٠)ی دەستووری عێراقی فیدراڵ، لەسەر نەوت و داهاتی عێراق و کوردستان، لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردنی دەوڵەتانی ئیقلیمیی و دەوروبەر

لەگەڵماندا، هەروەها کێشەمان هەیە لەگەڵ ئەو هێزانەی، کە ناویان لەخۆیان ناوە: هێزی داگیرکار، وەك ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانەکانیان، کە ئەگەر کاتێك بەرژەوەندییان لەوەدابوو عێراق بەجێ بهێڵن و بەجێیان هێشت، دەبێ ئێمە چی بکەین؟! ئەوانە کۆمەڵە کێشەیەکن هەمانن و لەگەڵیاندا دەستەویەخەین.

هەروەها ئێمە کۆمەڵە (قەیران)ێکیشمان هەن: ئێمە وەك ئەم خەڵك و میللەتەی خۆمان لەڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوە، قەیرانمان هەیە، هەروەها لەڕووی ئابوورییەوەو، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و، خێزانیی ئەخلاقیی و، ژیان و گوزەران و، کلتوورو فەرهەنگ و عادەت و نەریت و، لەو ڕووەوە کە ئایا ئێمە تا چ ئەندازەیەك سوود لە خەڵکی دیکە وەربگرین و لە چاکەکانیان بەهرەمەند بین، بێئەوەی لە خراپەو زیانەکانیان زەرەرمەند بین، وە چۆن لەگەڵ خەڵکی دیکەدا مامەڵەو هەڵسوکەوت بکەین، بەشێوەیەك کە بە قازانج بشکێتەوە بۆ خەڵك و میللەتمان؟!

جا ئێمە، خوا پشتیوان بێ لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکی قورئان و چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، تیشك دەخەینە سەر ئەو ڕاستییە کە ئیسلام، شەریعەت و بەرنامەی خوای دادگەر (سبحانه وتعالى)، بۆ کەسێك و کۆمەڵێك، کە بەڕاستی هەوڵبدات لێی تێبگات و پێیەوە پابەند بێ، چارەسەری تەواوی پێیە، هەم بۆ کێشەکان و هەم بۆ قەیرانەکان!

بەڵام بەرلەوەی بچینە سەر درێژەی بابەتەکەمان، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم، کە ئەو هەواڵەی دوێنێ (٢٠٠٧/٦/٢٤) هەواڵێکی موژدەبەخش بوو بۆ ئێمەی خەڵکی مسوڵمانی کوردستان، کە بریتی بوو لە حوکم بەسەردادرانی هەندێك لە سەرانی رژێم، کە دەستیان هەبوو لە بەناو ئەنفالکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك و دانیشتووانی کوردستان، لە پیاوو ئافرەت و پیرو گەنج و منداڵ و هەموو چین و توێژەکان، بەڕاستی ئەوە جێگای دڵخۆشییە، کە زۆری نەبرد خوای دادگەر سیفەتی تۆڵەستێنی (منتقم)ی خۆی خستەڕوو، بەرامبەر کەسانێك کە زوڵم و ستەمێکی زۆریان کرد لە خەڵکی مسوڵمانی کوردستان، کە بێگومان گەلی کورد ئەوکاتە، هەتا بڵێی بێکەس و چەوساوە بوو، بەڵام سەرەنجام خوای زاڵ و خاوەن توانا، وەدەنگ هات و سیفەتی تۆڵەستێنی خۆی ئاشکرا کرد:

﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ (آل عمران -٤).
واته: وه خوا زاڵ و خاوەن تۆڵەیە.

ئەو کاته کاتێك بوو، ئێمه جگه له خوا هیچ فریادڕەسێکمان نەبوو، ئەو زلهێزانەش، که ئێستا هاتوون باسی مافی مرۆڤمان بۆ دەکەن، لەبەرچاوی ئەوان و مانگه دەستکردەکانیان، ڕژێمی بەعسی عەلمانیی، گەلی کوردی مسوڵمانی جینۆسایدو بەناو ئەنفال و کیمایی باران دەکردو، کەسیش نێوچاوانی گرژ نەدەکرد، بەڵام وەك له کوردەواریی خۆماندا گوتراوە: خوا به سەبرە، بەڵام به زەبرە، یان وەك له عەرەبیدا دەڵێ: (إنَّ الله يُمْهِلُ ولا يُهْمِلُ)، واته: خوا مۆڵەت دەدات، بەڵام فەرامۆش (إهمال) ناکات، ئەوەتا خوای تۆڵەستێن، تۆڵەو غەزەبی خۆی خستەڕوو، بۆ هەندێك له سەرانی ڕژێم وەك: (عەلی حەسەن مەجیدو هاوەڵەکانی) که ئەوانه ژمارەیەکی زۆر کەمن لەوانەی تاوانی جینۆسایدو قەتڵعامیان دەرهەق به میللەتی مسوڵمانی ئێمه ئەنجامداوەو، ئومێد وایه ئەوانیش و هەرکەسێکی دیکەش که زوڵمی له کوردو تورکمان و عەرەب و هەرکەسێك کردوە، ئاوا خوای باڵادەست له دنیادا پێی بنوێنێ، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی چاویان له زوڵمەو مافی خەڵك زەوت دەکەن، پەندو عیبرەتی لێوەربگرن، پێشینانیش گوتوویانه: (هەموو پەتێك له باریکیدا دەپچڕێ، بەڵام پەتی زوڵم له ئەستووریيدا)، ڕژێمی بەعس دوای ئەوەی، که هیچ نەما بیکات و زوڵم و ستەم و خراپەکەی وشکانی و دەریای داگرت، ئنجا خوا ئاوا وەزعەکەی لێگۆڕی و، بەدەستی خۆی گۆڕی بۆ خۆی هەڵقەند! چونکه ئەگەر ڕژێمی بەعس (کوێت)ی داگیر نەکردبایه، وەك گوتراوە: (ئەگەر بزن ئەجەلی هات، توێشووی شوان دەخوات)، بەڵێ ئەگەر ڕژێم ئەو هەڵەیەی نەکردبایه، پێموایه دەیان ساڵی دیکه، زوڵمی له ئێمەی کورد کردبایەو بیچەوساندبایەنەوە، هەروەك شالاوەکانی دیکەی بۆ سەر گەلەکەمان دەڕۆیی!

بەڵام کاتێك بەرژەوەندیی زلهێزەکان کەوتە مەترسییەوە، ئنجا ئەوانیش کەوتنه جموجۆڵ، نەك لەبەر خەڵکی (کوێت)یش - هەروەك هەرگیز لەبەر بەرژەوەندیی خەڵکی وه دەنگ نەهاتوون - بەڵکو لەبەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان! ئنجا

بەهەرحاڵ هەرچۆنێك بێ، ئەوە ڕژێمی بەعس تەخت و تاجی تێكچوو لە خوا بەزیاد بێ، ئێستاش وردە وردە دەبینین بە سزای خۆیان دەگەن و، ئومێدمان وایە ئەوانی دیكەش كە ماون، بە سزای ڕەوای خۆیان بگەن.

ئێستاش با بچینە سەر ئەسڵی مەبەست:

## یەكەم: كێشەكانمان:

بابزانین كێشەی چیمان هەیە، لەگەڵ ئەو نەتەوەو پێكهاتانەی لە عێراقدا لەگەڵمان دەژین و لەگەڵ وڵاتانی دراوسێشمان دا؟!

**هەر بەكورتیی دەڵێین:**

بەڕاستی بەر لە هەر شتێك، كێشەی ئەوەمان هەیە، كە ئێمە بەو گەلانەی دراوسێمان دەڵێین: وەك چۆن ئێوە هەن، با ئێمەش هەبین! وەك چۆن عەرەب و تورك و فارس و نەتەوەو گەلانی دیكە، قەوارەو دەوڵەتیان هەیە، با ئێمەش كیان و دەوڵەتێكمان هەبێ، ئنجا هەرچەندە سەركردایەتیی سیاسیی كورد، ئێستا باسی دەوڵەتی سەربەخۆ ناكات،[1] كە هەقی خۆشمانە هەمانبێ! بەڵام ئەگەر ئەوەشمان نەبێ، با لانیكەم لە وڵاتی خۆماندا، وەك هەرێمێكی فیدڕاڵ، زوڵممان لێ نەكرێ و خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆمان بین!

ئەوە لای كەمی مافی شەرعیی ئێمەیە لە وڵاتی خۆماندا، كە ئازادو سەربەست بین و نەچەوسێنرێینەوەو مافمان پێشێل نەكرێ، چونكە خوا -سبحانە وتعالى- دنیای بۆ ئەوە دانەناوە، ئەو خەڵكە یەكدی بچەوسێنێتەوە، بەڵكو دنیای بۆ ئەوە داناوە، بەندەكان تێیدا تاقی بكرێنەوە: داخۆ كامیان بەندایەتیی بۆ خوا دەكات و چاكە دەكات و، كامیشیان لەخوای بەدیهێنەر یاخی دەبێ و، خەریكی ستەم و خراپەكاریی دەبێ؟!

---

(١) ئەو كاتە: (٢٠٠٧ز) وابوو، ئێستاش هەرچەندە هەندێک كەس و لایەن بەڕواڵەت باسی دەكەن، بەڵام هەر باسكردنی ڕواڵەت و ڕووتە، چونكە هیچ هەنگاوی كردەیی بەرەو زەمینە بۆ خۆشكردنی نانێن و، بەبێ زەمینەسازیش، ئەو بابەتە هەر بەدروشم دەمێنێتەوە!

بەڵێ، ئەو داوایەی میللەتی کوردی مسوڵمان دەیکات، شتێکی زۆر ڕەوایە، کەواتە: با بزانین ئیسلام لەوبارەوە چی دەڵێ؟ چونکە هەندێك کەس زۆرجار باسی ئەوە دەکەن، کە ئێمە هیچ کێشەی دینیی و ئیسلامیی مان نیە، بەڵکو بەس کێشەی سیاسیی و نەتەوایەتییمان هەیە! بەڵام لە ڕاستیدا هەق ئەوەیە، کە ئێمە هەم کێشەی ئیسلامییمان هەیەو، هەم کێشەی نەتەوایەتییشمان هەیە، چونکە کاتی خۆی کە ستەممان لێکراوە، چ لەلایەن ڕژێمی تورکەوە، چ عەرەبەوە، چ فارسەوە، بێگومان لەبەر ئەوەبووە، کە ئەو ڕژێمانەی تورك و عەرەب و فارس شۆڤێنیی و ڕەگەزپەرست بوونە، ئەگەرنا تورك و عەرەب و فارسی مسوڵمان، ئیمان و ئیسلامەتییەکەیان، ڕێگەیان نادات زوڵم بکەن، بەڵکو ئیمان و ئیسلامەتی پاڵیان پێوەدەنێ کە برایەتیی بکەن، وەك چۆن ئێمەش ئیمان و ئیسلام ڕێگامان نادات ڕقمان لە هەموو تورك و عەرەب و فارسێك ببێتەوە، بەڵکو دەڵێین: چاکیان هەیەو خراپیشیان هەیە، عەرەبێك مسوڵمان و دیندارو خواپەرست و خەڵك دۆست بێ، چاکە، بەڵام ئەوەی زاڵم و ستەمکار بێ، خراپە.

هەروەها لەنێو هەموو نەتەوەکاندا، چاك و خراپ هەیە، هەروەك چۆن لەنێو کوردیشدا چاك و خراپ هەیەو کوردی چاك و پەسندمان هەیەو، کوردی خراپ و ناپاك و نارەسەنیشمان هەیە، هیچ میللەتێك نیە، کە هەمووی چاك، یان هەمووی خراپ بێ!

جا لەڕاستیدا ئێمە، کە زوڵممان لێکراوە، لەبەر ئەوەبووە کە ناحەزانمان بەناشەرعیی و بێدینیی ڕەفتاریان لەگەڵماندا کردوەو زوڵمیان لێکردووین و، لەئەنجامی ئەوەدا زوڵممان لێکراوە، کە ئەو دەرو دراوسێیانەمان - هەڵبەتە وەك خەڵك و جەماوەرەکەیان نا، بەڵکو وەك ڕژێم و دەوڵەتەکان - بە حەق و بەشەرعی خوا لەگەڵ ئێمەدا مامەڵەیان نەکردوە، کەواتە: ئێمە نامسوڵمانێتییمان لەگەڵ کراوەو، ناشەرعیی و بێدینییمان لەگەڵ کراوە، مادام وابێ کێشە نەتەوایەتییەکەمان لەهەمان کاتدا، کێشەیەکی ئیسلامییشە.

شایانی باسیشە کە ئێمەی نەتەوەی کورد، وەك میللەتێکی دیندارو مسوڵمان، لەنێو ئۆممەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) میللەتێکی دیارین و

گەورەپیاوی زۆرمان لەنێودا هەڵكەوتوون، لە هەموو بوارەكاندا، ئنجا زۆر جار بەس نموونە بە (صلاح الدین)ی ئەییوبی دەهێنرێتەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، بەڵام بێگومان لەپێش و لەپاش ئەویش، كەسانی زۆر گەورەو دیارمان لێ هەڵكەوتوون لە هەموو بوارەكاندا، لەبواری مێژوونووسییدا پیاوی وەك (إبن الأثیر)مان هەیەو، لە بواری شارەزایی لە زمانی عەرەبیدا، زانای وەك (إبن الحاجب)مان هەیەو، لەبواری شیعری عەرەبیدا، پیاوی وەك (أحمد شوقي) ناسراو بە (أمیر شعراء العرب)مان هەیەو، لە بواری زانستە شەرعییەكان و فیقهی ئیسلامییدا پێشەوای وەك (إبن تیمیة)مان هەیە، كە زۆر لە مێژونووسان بە كوردی دەزانن و، لە بواری فەرموودەناسیی دا زانای وەك (إبن صلاح الشهرزوري)مان هەیە، كە بە دامەزرێنەری زانیاری فەرموودەناسیی (علم الحدیث) دادەنرێ، كە كورد بووەو خەڵكی شارەزوور بووە، لە بواری تەسەووف و عیرفاندا پیاوی وەك (مەولانا خالیدی نەقشبەندیی)مان هەیە، كە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامییدا ناسراوەو، (إبن عابدین) خاوەنی كتێبی (الحاشیة) یەكێك بووە لە موورییدەكانی، هەروەها (شهاب الدین الآلوسي) خاوەنی تەفسیری (روح المعاني)یش یەكێك بووە لە قوتابیی و شاگردەكانی ئەو خواناسە بەرزە! جگە لەوەش بە دەیان پیاوی هەڵكەوتووی وەك (مامۆستا مەلا سەعیدي نۆرسي) و (كاك ئەحمەدی شێخ) و (سەید عەبدولڕەحیمی مەولەویی) و.. هتدمان هەن.

بەڵێ ئێمە نەتەوەیەكی بێ ناوونیشان نین لە نێو ئۆممەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، بۆیە ئەوەندەی بكرێ، دەبێ ئێمە كێشەكانمان لەگەڵ دەرودراوسێ مسوڵمانەكانماندا، بگێڕینەوە بۆ شەرع، چونكە ئەوە هەم دین و عەقیدەمان لەسەرمانی پێویست دەكات و، هەم بەرژەوەندییشمانی تێدایە، چونكە پێشینانمان گوتوویانە: (ئەو دەستەی شەرع بیبڕێ، خوێنی لێ نایەت)، هەر حەق و مافێكی شەرع بتداتێ، كەس ناتوانێ بۆڵەبۆڵت لەسەر بكات!

وە ئێمە لە ڕووی شەرعییەوە: حەقی خۆمانە قەوارەمان هەبێت بە دەوڵەتی سەربەخۆشەوە، با لەوبارەوە تەماشای ئەم ئایەتەی خوای دادگەر بكەین، كە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ (الحجرات -١٣).

واته: ئەی خەڵكینه! ئێوەمان له نێرو مێ (ئادەم و حەوا)یەك خوڵقاندوە، پاشان گێڕاومانن بۆ چەند گەل و تیرەیەك، تاكو یەكدی بناسن - پێك ئاشنابن و پێكەوە هاوكاریی بكەن و، سەرزەوی خوا ئاوەدان بكەنەوە- ئەوەتان لەلای خوا ڕێزی زیاترە، كه پارێزكارترە - زیاتر پابەندە بە شەرعی خواوە - بێگومان خوا زانای شارەزایه.

لێرەدا خوای بەدیهێنەر ڕوو له هەموو مرۆڤایەتی دەكات، چونكه ئایین و بەرنامەكەی بۆ هەموویان ناردوە بەبێ جیاوازیی و، ئەوە یەكێكه لە تایبەتمەندییەكانی بەرنامەو شەریعەتی خوا، كه بۆ هەموو خەڵكی سەرزەوییە، وەك بەرنامەو بیردۆزە مرۆڤكردەكان نیه، بۆ وێنه: وەك سۆسیالیزم بێ و چینی پرۆلیتار دابنابێ، دژی چینی بورژوا، یان سەرمایەداریی (كاپیتالیزم) بێ، چینی بورژوا دابنابێ دژی چینی پرۆلیتار، یان نەتەوەپەرستیی عەرەبیی بێ، دژی كورد! نەخێر، بەڵكو دینی خوا، بۆ خەڵكی خوایه لەسەر زەوی، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین!

كەواته: له ڕوانگەی ئەم ئایەتەوە - هەڵبەته ئایەت و فەرموودەی دیكەی زۆریش لەوبارەوە هەن - دەگەینه ئەو ئەنجامه: كه كورد كاتێك دەڵێ: با مافم هەبێ و نەچەوسێنرێمەوەو، قەوارەو بوونم هەبێ، شتێك دەڵێ، كه خوای بەدیهێنەر بۆی بڕیار داوەو، شتێك دەڵێ، كه زوڵم نیەو دادگەرییه، ئنجا خواش خۆی دەفەرموێ: ئێوەم گێڕاوە بە چەند گەل و تیرەیەك، كەواته: وەك چۆن خوا (عز وجل) عەرەبی كردوە بە عەرەب و، فارسی كردوە بە فارس و، توركی كردوە بە تورك و.. وە هەروەها، بەهەمان شێوەش كوردیشی كردوە بە كوردو زمانی تایبەتی خۆی بۆ داناوە، وەك سەرجەم نەتەوەكانی سەرزەوی، كه ئێستا زانایانی شارەزای زمان دەڵێن: نزیكەی (٤٠٠٠) زمان له دنیادا هەیه، دیارە هەموو ئەو زمانانەو خاوەنی ئەو زمان و ئینتیماو نەتەوانه، خوا خوڵقاندوونی و خوا (سبحانه وتعالى) ویستی وابووە، كه خەڵك زمان و ڕەنگی جیاجیای هەبێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴾ (الروم -٢٢).

واتە: لە نیشانەکانی دەسەڵات و توانای خوا، دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و، جیاوازیی ڕەنگ و زمانەکانتانە، بێگومان لەوەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ زانایان.

دەجا ئێمەش لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا دەڵێین: ئەگەر کورد بڵێ: با من هەرێمێکی فیدراڵم هەبێ لە عێراقدا، یان لە تورکیاو ئێران و سووریادا، یان تەنانەت، ئەگەر بڵێ: ئەگەر هەلومەرجی نێودەوڵەتیی گونجاوبێ، دەبێ دەوڵەتی سەربەخۆشمان هەبێ، ئەوە بێگومان هیچ شتێکی ناشەرعیی نەگوتوە، بەڵکو شتێکی شەرعیی و ڕەوای گوتوەو، حەقی خۆی داواکردوەو لەسەر حیسابی کەسیش نیەو، حەقی هیچ کەسی دیکەشی پێشێل نەکردوە!

**لێرەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم:** ئەو کێشانەی کە ئێستا هەمانن، وەك مەسەلەی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان و، مەسەلەی نەوت و غازو داهات، کە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و، وانەبێ کە زوڵممان لێبکرێ، خۆ ئێمە نامانەوێ بەشی خەڵکی دیکە بۆ خۆمان بێنین، بەڵکو دەمانەوێ بەشی ئێمە بۆ خەڵکی نەچێ، وەك ساڵەهای ساڵە چووە، بەڵکو زۆرجاران هەر بە داهاتی وڵاتی خۆمان و بە نەوتی خۆمان، وڵاتمان کاولکراوەو خەڵکمان جینۆساید کراوەو، نەتەوەکەمان قڕەبڕ کراوە، کە بەڕاستی ئەوە زوڵمێکی زۆر گەورەیە، دەبێ کۆتایی پێبێ، وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە: شاری کەرکووك و ناوچەکانی دەوروبەریشی، بەگوێرەی دیکۆمێنت (وثيقة)و بەڵگەنامە مێژووییەکان، کوردستانن و ئێمە وەك سەرکردایەتی سیاسی کورد قەناعەتمان وایە کە (کەرکووك) لەنێو جوگرافیای کوردستاندایە، بەڵێ، تورکمان و عەرەبیشی لێ نیشتەجێن و، ئەوانیش بەشیان پێیەوە هەیە.

بەڵێ، ئێمە ئەگەر ئەو کێشانەمان بگێڕینەوە بۆ ئیسلام، کەس بۆی نیە بۆڵە بۆڵمان لەسەر بکات و، هەق و مافمان لێ زەوت بکات.

هەروەها بە هەمان شێوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتی ئاڵۆزی دەستتێوەردانی دەوڵەتانی دەوروبەرو ئیقلیمی لە کاروباری هەرێمدا، بە گەڕانەوەمان بۆ تەرازووی شەرع و، پشت بەستن بە شەریعەت، زۆر قازانج دەکەین، چونکە ئێستا کە سوپای تورك بەین بەین هەڕەشەمان لێدەکات، بە مەنتیقی ئیسلامیی، دەتوانین پێیان بڵێین: ئێوەی تورك ئەگەر مافی کوردەکانی تورکیاش نادەن، لانیکەم لە ئێمە بگەڕێن و وازمان لێ بهێنن! - ڕەنگە زیاتر لە (٢٠) ملیۆن کورد لە تورکیا هەبن - تۆ ئەگەر مافی کوردەکەی خۆیشت نادەی، لانیکەم لە ئێمە گەڕێ، ئێمە کە دەستمان لە شتێك گیر بووە، بۆچی حەسادەتمان پێ دەبەی؟! ئەوە بەرهەمی خەبات و خوێن و خەم و ئارەقەو ئاوارەیی و دەربەدەریی و مەینەتییەکی دەیان ساڵەیەو، کەس خێری پێ نەکردووین، هەرچەندە ئەم حەق و مافانەمان نەدەبوو، هەر خەباتیشیان لەپێناودا بکەین، چونکە حەقی شەرعیی و ڕەوای خۆمانن و، ئەگەر خەڵك بە شەرع لەگەڵمان جووڵابایەوە، ئێمەی کورد پێویستی بەوە نەبوو بچینە شاخ و بڵێین: زوڵممان لێدەکرێ! بەڵکو دەبوو هەر لەڕێوە زوڵممان لێ نەکرابایە!!

**با لێرەدا قوڵە نەنزیلەیەك لەبارەی دادگەریی ئیسلامەوە، بگێڕینەوە:**

لە وڵاتی میسر لە سەردەمی حوکمڕانیی (عومەری کوڕی خەتتاب)دا خوا لێی ڕازی بێ، (عەمری کوڕی عاس) والی ئەو وڵاتە بوو، کە وەك سەرۆك کۆمارێکی ئێستا بووە، ڕۆژێك پێشبڕکێی ئەسپ دەکرێ، کوڕی پیاوێکی قیبتیی نەسڕانیی، ئەسپەکەی پێش ئەسپی کوڕی عەمڕی کوڕی عاس دەکەوێتەوە، کوڕی والی پێیدەڵێ: چۆن دەبێ ئەسپی تۆ پێش ئەسپی من بکەوێتەوە؟ ئیدی دەیداتە بەر قامچی و لێیدەدات، ئەو کوڕەش یەکسەر دێت بۆلای (عومەری کوڕی خەتتاب) لە شاری مەدینەو بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) نامە دەنێرێ بۆ عەمری کوڕی عاس و دەڵێ: خۆت و کوڕەکەت و ئەو قامچییەی، کە پێی لەو کابرا قیبتییە داوە، بە زووترین کات دەگەنە لای من!

ئەوانیش یەکسەر بەڕێ دەکەون و دەگەنە مەدینە، عومەر بە کابرای قیبتیی دەڵێ: قەمچییەکەی لێ وەربگرەو چۆنی لێداوی، ئاوای لێبدەوە، ئەویش لێی وەردەگرێ و لێیدەدات - جا کاتێك لە میسرِ کوڕی عەمری کوڕی عاس

لێی دابوو پێیگوتبوو: (خذها وأنا ابن الأكرمين) بیگرە من كوڕی دوو ئینسانە بەڕێزەكانم، واتە: باب و دایكی من زۆر بەڕێزن و، تۆ كوڕی خێزانێكی قیبتیی و سادەی، چۆن دەبێ پێش بكەویەوە؟- عومەری كوڕی خەتتاب بە كوڕی كابرای قیبتیی دەڵێ: لێیبدە لە كوڕی باب و دایكە بەڕێزەكە! زۆر چاكی لێدەدات، ئنجا پێیدەڵێ: قامچییەكەت وەرسووڕێنە بۆ سەری بابیشی، كابرای (قبطي)یش دەڵێ: ئەی گەورەی مسوڵمانان! بابی لە منی نەداوە و تۆڵەی خۆشم لە كوڕەكەی كردەوە، دیارە هاوەڵانی بەڕێز لەوێ دەبن، تكای بۆ دەكەن، عەمر ڕزگاری دەبێ، ئنجا لەو كاتەدا عومەری كوڕی خەتتاب ڕستەیەك دەڵێ، كە زۆر باوە لەسەر زمانی خەڵك، بە عەمر دەڵێ: (يا عَمْرُو! مَتَى اسْتَعْبَدتُمُ النَّاسَ وَقَد وَلَدَتْهُمْ أُمَّهاتُهُمْ أَحْراراً؟!)، واتە: ئەی عەمر! لە كەیەوە خەڵكتان كردۆتە كۆیلە، خۆ بە ئازادیی لە دایك بوون؟!.

وەك دەبینین خەلیفەو كاربەدەستی هەرە باڵای مسوڵمانان لەسەر كابرایەكی قیبتیی، وەدەنگ هاتوە، كە چەند قامچییەكی بە زوڵم لێدراوە، ئنجا ئایا ئەگەر دەسەڵاتی ئیسلامیی لە ئارادا بوایە، چی دەكرد لەسەر هەزاران گەنج و لاو و پیر و منداڵی كوردستان، كە جینۆسایدو كیمیایی بارانكراون؟!

كەواتە: ئێمە وەك میللەتێكی ستەم لێكراوو خاوەن حەق، دەبێ وریابین و كێشەكانمان بگێڕینەوە بۆ شەرع، ئنجا ئێمە گەر مسوڵمان بینو دەبێ قەناعەتمان وابێ و سەداسەد دڵنیابین، كە شەریعەتی خوا دادگەری (عدل)ی تەواوی تێدایەو، بە هیچ شێوەیەك حەق و مافی ئێمە، مسقاڵێكی نادات بە كەسانێكی دیكە، وەك چۆن مافی خەڵكی دیكەش نادات بە ئێمە، ئەوەش مانای وایە قازانجی ئێمەی بەشخوراوە!

بەڵام وەختێك ئێمە ئەو بنەڕەتە شەرعییە لە كێشەكانمان دادەبڕین، زیانێكی گەورە لەخۆمان دەدەین و ناحەزانیشمان پاساوی گومانی خراپ پێبردنمانیان، دەبێ، هەرچەندە ئەگەر گریمان میللەتی ئێمە، یان هەر میللەتێكی دیكە، مسوڵمانیش نەبێ، مافی ئەوەی هەر هەیە، كە بە ئازادیی بژی و، لە وڵاتی خۆیدا سەربەخۆ بێ و نەچەوسێنرێتەوە.

بەڵام ئێمە وەك میللەتێكی مسوڵمان، بۆچی شەرع نەكەینە سەنەدو پاڵپشتێكی بەهێز بۆ كێشە ڕەواكانی گەلەكەمان و داوا ڕەواكانمان؟! مادام میللەتەكەمان

مسوڵمانەو خۆی بە مسوڵمان پێشان دەدات، پێویستە هەر بە مەنتیقی ئیسلامییش، بەرانبەرەکانمان بدوێنین! من زۆرجار لە بۆنەو کۆڕو کۆبوونەوە سیاسییەکاندا گوتوومە: ئێمە زۆر زەرەر دەکەین کاتێك، دێین ئیسلام لە هاوکێشە سیاسی و نەتەوەیی یەکانمان دوور دەخەینەوە، بەپێچەوانەشەوە زۆر قازانج دەکەین، کاتێك ئیستیناد دەکەینە سەر ئیسلام، چونکە هەرکەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، لەبەرانبەر ئایەت و فەرموودەدا دەوەستێ و قسەی نامێنێ، بۆ وێنە فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ((**من اقتطع أرضاً ظالِماً لقيَ الله وهو عليه َغضْبانُ**) رواه أحمد ومسلم عن ابن عمر، واتە: هەرکەسێك بە ستەم زەوییەك داگیر بکات، کاتێك بە دیداری خوا دەگات، بە تووڕەیی دەیبینێ.

کەواتە: کاتێك دەبینین لە سەردەمی حوکمڕانیی خۆیاندا، بەعسییەکان لەخوارووی عێراقەوە، ماڵی عەرەبیان هێناونە سەر ماڵ و حاڵ و خانووبەرەی خەڵکی کوردو، لە کەرکووك و شوێنانی دیکەدا نیشتەجێیان کردوون، بێگومان ئەوە زوڵمێکی زۆر گەورەیە کراوەو، ئەگەر شەرع حاکم بێ و دەسەڵاتی شەرعیی لە ئارادابێ، شتی وا قبووڵ ناکات.

چارەسەری مەسەلەی کەرکووکیش، کە ئێستا خراوەتە نێو ماددەی (١٤٠)ی دەستوورەوەو، دەستووریش زۆرینەی خەڵکی عێراق (٤/٥)ی (بەڵێ)یان بۆ کردوە، دیارە بەڵگەیەکی باشە بەدەستمانەوەو، نابێ دەستی لێ شل بکەین و هەرکاتێك لەسەر بناغەی ڕاپرسیی (إستفتاء)یەکی ڕاست و بێ فێڵ، ئیسپات بوو، کە زۆرینەی خەڵکی ئەو شارە کوردن و، داواشیان کرد کە شارەکەیان لە بازنەی جوگرافیای کوردستان دابێ، هیچ کەس بۆی نیە ئەو مافەمان لێ زەوت بکات، بەڵام پێویستە ئاگادار بین و لەیادمان نەچێ، کە ئێمە وەك گەلێکی مسوڵمان، پێش ئەو دەستوورەش، کە (بەڵێ)مان بۆ کردوە، ئەو دەستوورو شەریعەتەی کە ئیمانمان پێ هێناوە، ئەو مافەمان پێدەدات و، ئەگەر گریمان دەستووری زەمینیش پێمان نەدات، هەرکەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، نابێ لاملیی بکات لە حەق و مافێك، کە شەریعەت و دەستووری خوا پێماندەدات.

## دووەم: قەیرانەکانمان:

لەبارەی قەیرانەکانیشمانەوە: کە ئایا ئیسلام چۆن قەیرانەکانی نێوخۆمان چارەسەر دەکات؟! دیارە وەك سەرەتا باسمکرد، ئێمە کۆمەڵێك قەیرانمان لەنێوخۆماندا هەن:

جارێ لەڕووی ناسنامەی ئایینییەوە، ئێمە قەیرانێکی گەورەمان هەیە، چونکە لەلایەکەوە: خۆمان بە میللەتێکی مسوڵمان دەزانین و، لەلایەکی دیکەشەوە: گەلێك لە هەڵوێست و هەنگاوەکانمان، دژو پێچەوانەی ئیسلامن!

پاشان ئێمە لە هەموو بوارەکانی: سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، ئەخلاقیی و، کلتورییدا، کۆمەڵێك گرفت و قەیرانی جۆراوجۆرمان هەن، کە بەتەواویی پشوویان پێ هەڵچنیوین و، ئەگەر بەو شێوەیە بڕوا، میللەتەکەمان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بەرەو گەندەڵیی و پووچەڵیی دەچێ، بۆ وێنە: لەڕووی ئابوورییەوە، قڕیی و پڕیی و چینایەتییەکی زۆر بێڕەزا پەیدا بووە، ژمارەیەکی کەمی خەڵك سەروەت و سامانەکانیان زۆر زیادی کردووە، ژمارەیەکی زۆری خەڵکیش، دەرامەت و داهاتیان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو خوار دەچێ، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە: نەبوونی بەنزین و نەوت و کارەباو چۆڵبوونی دێهاتەکان و داڕمانی ژێرخانی ئابووریی و.. هتد، هەموو ئەوانە گرفتی گەورەن بۆ میللەتێك، کە بیەوێ کیان و بوونی خۆی هەبێ!

تەماشا دەکەین هەر لە کلێنس و ئاوی خواردنەوەوە، تا هەر جۆرە کەلوپەلێکی دیکەی پێویست لە گەورەو بچووك، پێویستمان بە غەیری خۆمانەو، هیچی لە وڵاتی خۆماندا بەرهەم نایێت![1]

دەشزانم کەسانێك کە گوێبیستی ئەم قسانە دەبن، بەسەرسوڕمانەوە پرسیار دەکەن و دەڵێن:

ئیسلام چ پەیوەندییەکی بە: سیاسەت، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، کولتوور، فەرهەنگ و، چارەسەری ئەو قەیرانانەوە هەیە، کە پێیانەوە پەیوەستن؟!

---

(١) ئێستاش (٢٠١٦/٩/١٤ ز) دەڵێم: ئایا واقیعەکەمان هیچ گۆڕاوە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: لەڕاستیدا ئیسلام بۆ دابینکردنی بەختەوەریی مرۆڤ هاتوە، چ لە دنیاو، چ لە دوارۆژداو، ئینسانیش کاتێك لەژیانی دنیایدا بەختەوەر دەبێ، کە وڵاتی ئاوەدانبێ و، زوڵم و فەسادو گەندەڵیی نەبێ و، برایەتیی و تەبایی بچەسپێ و، کۆمەڵگا بە تاك و کۆمەڵییەوە، بڕازێتەوە بە ڕەوشتە بەرزو جوان و پەسندەکان و، ئەو نەخۆشییانەی، کە وەك گیاکەڵەو بژار وان بۆ کۆمەڵگا، ڕیشەکێش بکرێن، دیارە تەنیا کاتێکیش ئەو ئامانجانە دێنەدی، کە مرۆڤەکان هەموویان بەندەی خوا بن و پێکەوە برا، یان لانیکەم تەبا بن و، دادگەرییش چەسپاوو سەقامگیر بێت، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ، کە باسی حیکمەتی نێررانی پێغەمبەران (عَلَيْهِم السَّلام) دەکات لە دوو شتاندا کورتی هەڵدێنێ: (بەندایەتیی بۆ خوا کردن)و (دادگەریی چەسپاندن)، وەك فەرموویەتی:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾ (الأنبياء -٢٥).

واتە: لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە، کە جگە لە من هیچ پەرستراو نین، دەجا بەس من بپەرستن!

هەروەها فەرموویەتی: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ ...﴾ (الحديد -٢٥).

واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە ناردوون و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوارێ، تاکو خەڵکی بەدادگەریی بەڕێوە بچن...

بەڵێ، پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِم السَّلام) بۆ دوو شتان هاتوون: یەکەم: کە خەڵك فێری بەندایەتیی بکەن بۆ خوا، دووەم: کە خەڵك لەنێو خۆیاندا دادگەریی بچەسپێنن و، نەهێڵن کەس زوڵم لە کەس بکات.

ئنجا ئێمە کاتێك تەماشای ژیانی خۆمان دەکەین، لە زۆر ڕووەوە دوور لەخوایی و، بێ سەرەو بەرەییەکی زۆر دەبینین:

یەكەم: جاریٚ لەڕووی كۆمەڵایەتیی و ئەخلاقییەوە چەندین عادەت و نەریٚت و شتی سەیرو سەمەرەو خراپ دەبینین و، كۆمەڵێك دیاردەی داڕووخانی ڕەوشت و خووی پەسندو، تەشەنەكردنی خوو و خدەی نزم و قێزەون دەبینین!

بەداخەوە ژمارەیەك لە گەنجەكانمان بە كوڕو كچەوە، كە سەیری ڕواڵەتیان دەكەین لە مسوڵمان نەبیٚ، لە هەموو شتێك دەچن! ئنجا ئایا ئێمە وەك میللەتێكی مسوڵمان، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بین، تا چ ئەندازەیەك دەتوانین بڵێین مسوڵمانین؟! ئایا سەرەنجامەمان چی لێدیٚت؟!

ئێستا سەدان كێشە لە دادگاكان هەیە، خیانەتی هاوسەریی هەیە، ئافرەتان خۆیان دەكوژن و دەسووتێنن، ئنجا زۆرجار خەڵكی نەفام و نەزانیش وادەزانن ئەوە خەتای ئیسلامە! بەڵام نەخێر، بەڵكو لەڕاستیدا ئەوە بە پلەی یەكەم سووچ و تاوانی ئەو كەناڵانەیە[1] كە فەسادو خراپەو بەدڕەوشتیی، پەرە پێدەدەن و غەریزەو ئارەزووی گەنجەكانمان بەرەو خراپە دەجووڵێنن!

ئنجا دەسەڵات و ئیدارەی هەرێمیش، هەتا ئێستا بیری لەوە نەكردۆتەوە، كە بەشێوەیەكی شەرعیی و ڕێكوپێك، ژیانی هاوسەرگیریی بۆ گەنجەكان دابین بكات و، ئەو هەموو پارەو ئیمكانیەتەی سەرف دەكریٚ، بۆ ئەو بەناو هونەرمەندانەی، كە ئارەزووی گەنجەكان بەرەو گوناهو بەڕەڵڵایی دەجووڵێنن و، خەڵات دەكرێن و، دەعوەتی تایبەتییان بۆ سازدەكریٚ، لە ئوتێل و هۆڵەكاندا! لەجیاتی ئەوەی حكومەت و دەستەڵات بێنیٚ سەرفی بكات، بۆ ئاسانكاریی پرۆسەی هاوسەرگیریی گەنجەكان، نەك ڕەواج پێدانی ئەو هەموو كلیپ و گۆرانی و ڕەقس و سەمایەی، كە جگە لە پەرەپێدانی ڕەوشت نزمیی و بەرهەڵدایی و وروژاندنی غەریزەی جینسیی و گەندەڵیی ئەخلاقیی، هیچ بەرهەمێكی دیكەی نیەو، نەك هەركەسێكی ئیسلامیی، بەڵكو عەلمانییەكیش ئەگەر بە ئینسافەوە سەیر بكات، هەروای دەبینیٚ!

پاشان دەپرسین؟ ئایا خەڵكی ڕۆژئاواو ئەورووپا، بەو شتانە بەرەوپێش چوون؟! ئایا ئەو شارستانیەتە ماددییەی، كە دەبیٚ چاكەكانیان لێوەربگرین، لەسەر ڕەقس و

---

(١) ئەو كەناڵانەش بەدەست حیزبە سیكۆلاریستە بڕیار بەدەستەكانەوەن.

سەماو هەڵپەڕین بنیات نراوە؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو وەك لەشوێنی دیکەشدا گوتوومانە: ئەو شارستانێتیی و بەرەوپێشچوونە ماددییەی ڕۆژئاوا، بەرهەمی کارکردن و ڕەنج و زەحمەت و بیرکردنەوەو داهێنان و، کۆمەڵێك بەهاو ڕەوشتی دیکەی بەرزو جوانە، ئەگەرنا هەرگیز نەبووەو ڕووینەداوە، گەل و میللەتێك بەڕەقس و سەماو گۆرانیی و، ڕەشبەڵەك بەرەو پێش بچێ!!

هەڵبەتە ئێمە دژی هونەری سروودو گۆرانی و جۆرەکانی دیکەی هونەریش نین، بەڵام بێگومان هونەری میللەتێکی مسوڵمان، دەبێ گونجاو بێ لەگەڵ عەقیدەو ڕەوشت و کلتوورو فەرهەنگیدا[1].

**ئێستاش با سەرنج بدەین:**

**داخۆ ئیسلام لەو بوارەدا چیمان پێدەڵێ و، چۆن ئامۆژگارییمان دەکات و، لەوبارەوە ڕێنمایی چییە؟**

**یەکەم: لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوە:**

پێش هەموو شتێك، کۆمەڵگای مسوڵمان نابێ غەریزەو ئارەزووەکانی تێدا بورووژێنرێن، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾(النور-٣٠).

واتە: بەپیاوانی ئیماندار بڵێ: با لە ڕوانینی چاویان بگرنەوە، داوێنی خۆیان بپارێزن، ئەوە پاکترە بۆ ئەوان، بێگومان خوا دەزانێ چی دەکەن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ

---

(١) لە زنجیرە باسی (چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)، کە ئێستا بە ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (کۆمەڵ)دا بڵاو دەکرێتەوەو پاشان دەکرێتە کتێب، بەدرێژی قسەمان لەبارەی هونەرەوە کردوە.
دوایی بوو بە کتێب و دووجاریش چاپ کراوە، وەرگێڕاوە بۆ زمانی فارسیش.

﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ (النور -٣١).

واتە: وە بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: با لە ڕوانینی چاوی خۆیان بگرنەوەو - زۆر چاو نەبڕنە پیاوان - و داوێنی خۆیان بپارێزن و، با جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی بە ناچاریی دەردەکەوێ - مەبەست پێی دەم و چاوو دەستەکانن، تاکو مەچەك -.

هەروەها هەر لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ﴾ (الأحزاب -٥٩).

واتە: ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) بە هاوسەرەکانت و کچەکانت و ئافرەتانی مسوڵمان بڵێ: با باڵاپۆشەکانیان بەخۆیانەوە بگرن و، دەسماڵەکانیان بەخۆیاندا بدەن، ئەوە نزیکترە لەوەی بناسرێن و ئازار نەدرێن.

واتە: بزانرێ کە ئەو ئافرەتە پۆشتەیە، ئافرەتێکی بە حەیاو حەشمەت و خاوەن شەرم و شکۆیەو، خەڵکی نەفس نزم تەماعی تێنەکات و، چاوی تێنەبڕێ و ئازاری نەدات بە قسە پێگوتن، یاخود بەهەر شێوەیەك لەشێوەکانی ڕەفتاری ناشایستە، ئەوە بۆ مەسەلەی نەورووژاندنی غەریزەکان، بەتایبەت غەریزەی جینسیی و پاکڕاگرتنی کۆمەڵگا.

لەوبارەشەوە کە دەسەڵات و قەوارەی سیاسیی بەرپرسیارە بەرانبەر بە دابینکردنی پێداویستییەکانی پرۆسەی هاوسەرگیریی، بۆ ئەو گەنجانەی دەیانەوێ هاوسەرگیریی بکەن، لە هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ، خوای بەبەزەیی فەرموویەتی:

﴿ وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٣٢) ﴾ (النور -٣٢).

واتە: ئەوانەتان کە هاوسەریان نیە - لە ژن و پیاوو کوڕو کچ - هاوسەرگیرییان بۆ بکەن، هەروەها کۆیلەو کەنیزەکە چاکەکانیشتان، بەهەمان شێوە، ئنجا ئەگەر هەژار بوون، ئەوە خوا لە بەخششی خۆی بێنیازیان دەکات، خوا فراوانە - لەدەسەڵات و بەزەیی و بەخشش دا- و زانایە.

كەواتە: كۆمەڵگاو كیان و قەوارەیەكی مسوڵمان، بەرانبەر بە پڕۆسەی هاوسەرگیریی هاووڵاتییان بەرپرسیارەو، لەسەری فەرزە هەل و مەرج و پێداویستییەكانیان بۆ بڕەخسێنێ و، ئاسانكارییان بۆ بكات.

دووەم: ئنجا با سەرنج بدەین، كە ئایا خەڵك و كۆمەڵگایەكی مسوڵمان، چۆن قەیرانی ئابووریی و ژیان و گوزەرانی تێدا چارەسەر دەكرێ و، دادگەریی كۆمەڵایەتیی تێدا دێتەدی؟!

**لەوبارەوە پێویستە ئاماژە بە چەند ڕاستییەك بكەین:**

١- لە سۆنگەی ئەوەوە، كە غەریزەی شت هەبوون (التملّك) یەكێكە لە غەریزە خوارسكەكان، ئیسلام وەك سەرجەم غەریزەكانی دیكەی مرۆڤ دانی پێداهێناوەو ڕێوشوێنی تێركردنیشی بۆ داناوە، وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی:

﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ (النساء -٣٢).

واتە: وە خۆزگە بەوە مەخوازن، كە خوا كردوویەتی بە پلەو ئیمتیازی هەندێكتان بەسەر هەندێكتاندا - مەبەست جیاوازییە خوارسكەكانی نێوان پیاوان و ئافرەتانە- پیاوان بەشیان هەیە لە بەرهەمی كردەی دەستیان و، ئافرەتانیش بەشیان هەیە، لەوەدا كە وەدەستیان هێناوە (لە ماڵ و سامان)، وە خوا فەرموویەتی:

﴿... فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ٢٧٩﴾ (البقرة -٢٧٩).

واتە: ئنجا سەرمایەكانتان هی خۆتانن، نە ستەم و بكەن و، نە ستەمتان لێ بكرێ.

٢- بەڵام ئیسلام بەپێچەوانەی سیستمی سەرمایەدارییەوە، دەستی تاكی ئاوەڵا نەكردوە، لەبواری كارو كاسبیی و بازرگانییدا، بەڵكو كۆمەڵێك مەرج و بەند

(شرط و قید)ی بۆ داناون، کە ڕێگریی لێبکەن، لە زیانگەیاندن بە کۆمەڵگاو بەرژەوەندییە گشتییەکانی، وەك خوای بەرزو مەزن فەرمووویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ۚ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ (النساء-٢٩).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ماڵ و سامانتان بە ناهەق لەنێوانتاندا مەخۆن، مەگەر بازرگانییەك بێ، بە ڕەزامەندیی نێوانتان و، خۆتان مەکوژن، بێگومان خوا لەگەڵتان بە بەزەییە!

وەك دەبینین خوای کاربەجێ لێرەدا (ماڵ و سامان بە ناهەق خواردن)و (خەڵك کوشتن)ی پێکەوە باسکردوون!

ئنجا لەو بەند (قید)انەی کە ئیسلام خستوونیە سەر تاك، لەبواری ئابوورییدا، تاکو زیان بەبەرژەوەندیی گشتی نەگەیەنێ، بریتیە لە قەدەغەکردنی بازرگانییکردن بە شتی پیس و زیانبەخش، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووویەتی: ((**إنّ الله تعالى حرَّم بيع الخمر والميتة والخنزير والأصنام**)) رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن عن جابر.

واتە: بێگومان خوا فرۆشتنی شەڕاب و مردارو بەرازو بتەکانی قەدەغەکردوە.

هەروەها یەکی دی لەو بەندانە، بریتیە لە قەدەغەکردنی پاشەکەوتکردنی شت، لەکاتی پێویستیی خەڵکیدا (إحتكار) وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووویەتی: (**لا يحتكر إلاّ خاطيء**) رواه مسلم.

واتە: هەر کەسێك ئیحتیکار بکات، خەتابارە.

٣- هەروەها هەر لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندیی گشتیدا، ئیسلام قەدەغەی کردوە، کە سەرچاوە سروشتییەکان و هەموو ئەو شتانەی، کە خەڵکی بەگشتی پێویستییان پێیانە، بکرێنە موڵکی تایبەت، وەك: ئاو، ئاگر، پاوان، کانزایەکان..

هتد، وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**المسلمون شركاء في ثلاثة: في الكلأ والماء والنّار**) رواه أبو داود.

واتە: مسولْمانان لە سێ شتاندا هاوبەشن: لەوەڕگاو، ئاوو، ئاگر.

هەروەها (أبوداود) گێڕاویەتەوە، کە پیاوێك لە پێغەمبەری پرسیوە: ((**يا نبيَّ الله ما الشيء الذي لا يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قال: المِلْحُ**)).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شتە چیە، کە ڕەوانیە قۆرخ بکرێ؟ فەرمووی: خوێیە.

شایانی باسیشە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆیە باسی ئەو چوار شتانە (ئاو، ئاگر، لەوەڕگا، خوێ)ی کردوە، چونکە لەو ڕۆژگارەدا، ئەو چوار شتە خەڵکی بەگشتی بۆیان ئاتاج بووە، ئەگەرنا هەر شتێکی دیکەش، خەڵکی ئاوا پەکیان لەسەری بکەوێ و، بۆی ناچار بن، هەمان حوکمی هەیە، لەسەر بنەمای (قياس)، کە یەکێکە لە چوار بنچینە گەورەکانی یاسا دانان، لە شەریعەتی ئیسلامییدا.

هەرچەندە وشەی ئاگر (النّار) کە لە فەرمایشتەکەدا هاتوە، هەموو سەرچاوەکانی سووتەمەنیی وەك: نەوت و گازو خەڵووزی بەردو، کارەباو، تیشکی خۆرو وزەی نێوکی (الطاقه النووية) دەگرێتەوەو، وشەی خوێ (الملح) یش سەرجەم کانزایەکان (المعادن) دەگرێتەوە، بە هەموو جۆرەکانیانەوە.

٤- دەسەڵات بۆی هەیە لەپێناو بەرژەوەندیی گشتیدا، نرخ لەسەر کەلوپەل دابنێ، بۆ ئەوەی بازرگان و سەرمایەدارە بێویژدانەکان، بەهۆی زیادکردنی نرخەوە، خەڵکی نەچەوسێننەوەو ئیستیغلالیان نەکەن، (إبن تيمية) لەوبارەوە پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گوتوویەتی: {وجماع الأمر: أن مصلحة الناس إذا لم تتم إلاّ بالتَّسعير، سعَّر عليهم تسعير عدلُ، لا وكس ولا شطط، وإذا اندفعت حاجتهم وتمت مصلحتهم بدونه، لم يفعل}[1]، واتە: کورتەی قسان: هەرکات بەرژەوەندیی خەڵکی

---

(١) بڕوانە: (الحسبة)ی إبن تيمية.

پەكی لەسەر (نرخ دانان) كەوت دەسەڵات بەشێوەیەكی دادگەرانەی بێ كەم و زیاد، نرخ لەسەر كەلوپەلەكانی بازرگانان دادەنێت، بەڵام ئەگەر پێویستییان پێی نەبوو و بەبێ ئەوە بەرژەوەندییان دەهاتەدی، نرخ دانانێ.

٥- ئیسلام دیاردەی زێدەڕۆیی (إسراف)و خۆشگوزەرانیی لەڕاددەبەدەر (إتراف) بە نیشانەو هۆكاری ڕووخان و هەرسهێنانی كۆمەڵگا دادەنێت، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴿١٦﴾ ﴾ (الإسراء -١٦).

واتە: هەركات ویستمان ئاوەدانییەك بفەوتێنین، فەرمان بە خۆشگوزەرانەكانی دەكەین - چاكە بكەن - ئەوانیش خراپەكاریی تێدا دەكەن و، سەرەنجام بڕیاری (خوای) لەسەر دێتەجێ و، بەتەواویی كاولی دەكەین.

بۆیە لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا، بوار بە ئەهلی فەسادو خراپەكاریی نادرێ، كە وڵات بكەنە مەیدانی تەراتێنی خۆیان، ئنجا گومانیشی تێدا نیە، كە وەك چۆن لەپەنای چیای بەرزو سەركەشدا، شیوو دۆڵی چاڵ و قووڵیش هەن، هیچ كاتێكیش خۆشگوزەرانیی لەڕادەبەدەرو زێدەڕۆیی خراپەكاران مەیسەر نابێ، مەگەر لەسەر حیسابی خەڵكی چەوساوەو ڕەش و ڕووت!

وە بەڕاستی زۆر جێگای داخ و ئەسەفە، كە واقیعی ئێستای میللەتەكەمان لەڕووی ئابووریی و كۆمەڵایەتییەوە، لە حاڵەتی (قڕیی و پڕیی)دا دەبینین، بۆوێنە: ئەوە كەی حاڵەتێكی سروشتی و ئاساییە، كە لەماوەی چوار پێنج ساڵدا كەسێك هێندە دەوڵەمەند ببێ، ملیارێك دۆلاری هەبێ، بەڵام خەڵكی دیكە هەر لەپەنای ئەودا، هەرچەندە هەوڵبدات، خانوویەكی بچووكی پێ دروست نەكرێ؟!

باشە ئەو بەرپرسە ساماندارە، ئەو ملیار دۆلارەی لە كوێ هێنا، ئەگەر بەدزیی كردن نەبێ؟ ئنجا بێگومان وشەی گەندەڵییش، هیچ لە نێوەڕۆكی دزیی كردن ناگۆڕێ!

یان بەرپرسی وا هەیە، خانووەکەی بە چەند سەد دەفتەر دۆلار کڕیوە، ئنجا ئەگەر خانوو بەوەندە بکڕێ، دەبێ بایی چەندەش کۆمپانیاو ڤیللاو سەیارەو.. هتدو پارەی دانراوی هەبێ؟! یان دەوڵەمەندی وا هەیە، ئەگەر سەروەت و سامانەکەی بەسەر کاتەکانی ژیانیدا دابەش بکەیت، ڕەنگە هەموو ڕۆژێك دەفتەرێك بکەوێ، واتە (١٠،٠٠٠) دە هەزار دۆلار! باشە لە کوێی هێنا؟ ئەدی بۆچی خەڵکی دیکە، دۆش داماوە بۆ دابینکردنی پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیانی؟

بەڕاستی سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان، دەبێ زۆر بە جیددیی بیر لەوە بکاتەوە، کە بۆچی خەڵك هێندە بێزارو نارەحەتە؟ بێگومان تەنیا لەبەر ئەوەنیە، کە چاوەڕوانی پێشهاتی خراپ دەکات بۆ ئایندەی کوردستان، لەلایەن وڵاتانی دراوسێ و لەلایەنی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانییەوە، کە ئایا کەی هێزەکانیان دەکێشنەوەو پێشینان گوتەنی (بەگورگان خواردوومان دەدەن)؟!

بەڵکو لەڕووی نێوخۆشمان، بێزاریی و نیگەرانیی زۆر هەیەو، چارەسەریش تەنیا لە گەڕانەوەماندایە بۆ ئیسلام، چونکە هەرگیز لەسایەی کۆمەڵگاو قەوارەیەکی ڕەسەنی ئیسلامییدا، ڕێ بەو هەموو قڕیی و پڕیی و نادادگەرییە نادرێ، ئەوەتا خوای کاربەجێ دەفەرموێ: کە نابێ سەروەت و سامان لەدەستی دەوڵەمەندەکاندا کورت هەڵبێ و پەزمەندە بێ:

﴿ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ ... ﴾ (الحشر -٧).

وە خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴾ (الرحمن -١٠).

واتە: خوا زەوی بۆ هەموو خەڵك داناوەو، پێویستە هەموویان لێی بەهرەمەند بن.

وە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ... ﴾ (البقرة -٢٩).

واتە: ئەو خوایەی هەرچی لەسەر زەوییە، بۆ هەمووتانی خوڵقاندوە.

کەواتە: شتێکی زۆر نارەواو ناشەرعییە، لەکاتێکدا کەسانێکی کەم پانتاییەکی زۆری زەوی بۆ کۆشك و تەلارو ڤیللاکانیان قۆرخ دەکەن و، خەڵکێکی زۆریش

بستە خاکێکی چنگ ناکەوێ! ئاخر مادام خوا (عزوجل) بژێوی ئەو خەڵکەی خستۆتە ئەم وڵات و نیشتیمانە، دەبێ جێگاو ڕێگای هەموانی تێدا ببێتەوە، ماڵ لەماڵ خۆ حەرام نەکرێ!

سێیەم: هەروەها لەڕووی فیکریی و کولتوورییەوە: ئەگەر سەیربکەین، دەبینین گەنج و لاوەکانمان و قوتابییەکانمان، هاندەدرێن بۆ لاساییکردنەوەی کوێرانەی خەڵکی ڕۆژئاوا، هەڵبەتە باکەس وا حاڵی نەبێ، کە ئێمە دژی هەموو شتەکانی ڕۆژئاواییەکانین، بەڵکو شتی بەسوود لە هەر کەسێکەوە‌و لە هەر شوێنێکەوە هەبوو، وەریدەگرین، خوای کاربەجێ لەوبارەوە دەفەرموێ:

﴿...فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٨﴾ (الزمر: ١٧-١٨).

واتە: وە موژدە بدە بە بەندەکانم، ئەوانەی کە گوێ لە هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام کامەی چاکترە، بەدوای ئەوە دەکەون، ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، وە ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

بەڵێ، ئێمە با سوود لە ئەزموونی خەڵك ببینین و، لە زانیاریی و شارەزاییان بەهرەمەند ببین، بەڵام با خۆمان لە شتە خراپەکانیان بپارێزین، ئاخر بۆچی دەبێ بە بیانووی پێشکەوتنەوە، لە ڕاگەیاندنماندا، خەڵك بۆ لاساییکردنەوە کوێرانەی بیری ڕزیو و عادەت و نەریتی خراپی ئەهلی کوفر، هانبدرێ؟ ئایا خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا، بەخۆ ڕووتکردنەوەی ئافرەتەکانیان و، قومارکردن و شەڕابخۆریی و سەرخۆشیی و بێ هۆشیی، بەرەوپێشچوون؟!

یان بەرەوپێشچوونی ئەوان لەئەنجامی ئەوەدایە، کە زۆر بایەخ بە کارکردن دەدەن و، سوود لەکاتەکانی خۆیان وەردەگرن و، کۆمەڵێك ڕەوشت و بەهای دیکەی باشیان هەن، وەك: ڕاستگۆیی و، بیرکردنەوە، توێژینەوەی زانستیی و، ڕێکوپێکیی ئیش و کاروباری ڕۆژانەو، دڵسۆزیی بۆ خەڵك و وڵات و.. هتد؟!

بەڵام بەداخەوە، ئەوەی لە وڵاتی ئێمەدا ڕەواجی پێدەدرێ، بەزۆریی شتە خراپ و کەموکورتیی و ڕەوشتە دزێوەکانی ئەوانە، ئەگەرنا، با لە ڕاگەیاندنەکانماندا ڕەواج بدرێ بە زانست و زانیاریی و، پیشەسازیی و، گەشەکردنی ئابووریی و دەوڵەمەندکردنی بیروهۆشی خەڵك بەگشتی، ئاخر پێشکەوتن لەمێشکی ئینساندایە، نەك لە بەرگ و پۆشاکیدا! ئەگەر کەسێکی نەزان بێنین -کە وەك دەڵێن (قُل)و (فل) لەیەك جیانەکاتەوە، قاتێکی جوانی لەبەر بکرێت و بۆینباغێك ببەستێ و، سەرو قژی شانە بکرێ، ئایا هەر بەوەندە دەبێتە کەسێکی خوێندەوارو شارەزاو زانا؟ نەخێر، بەڵام کەسێك با بەرگی (کوردیی)شی لەبەربێ، مادام زانیاریی پێبێ، ئایا ئەو بەرگ و پۆشاکە کوردییە بەرەو دواوەی دەبات؟ بێگومان نەخێر!

بەداخەوە تەوژمی عەلمانیی ئێستا وایکردوە، کە بەرگی کوردیی ببێتە دروشم و نیشانەی خەڵکی دواکەوتوو و نەخوێندەوار! واتە: ئێمە لە بەرگ و پۆشاکە نەتەوەیی یەکەشمان هەڵگەڕاوینەوە، بەناوی کوردایەتییەوە، بگرە زۆرمان هەن ئەگەر بۆیان بکرێ، هەر بە کوردییش قسە ناکەن، هەتا ئینگلیزیی و زمانە بیانییەکان هەبن! ئنجا تۆ ئایین و زمان و بەرگ و پۆشاك و ئەخلاقی کوردەوارییت نەمێنێ، ئەدی کوردایەتییەکەت لەکوێ دایە؟!

**لەکۆتاییدا دەڵێین:**

ئێمە ئەگەر بمانەوێ وەك میللەتێکی مسوڵمان گۆڕانکاریی و چاکسازیی لە حاڵ و وەزعی خۆماندا بکەین، دەبێ سەرەتا بەربەستێك دابنێین، لەبەردەم ئەو داڕووخان و بێزاریی و نائومێدییەی کە لەئارادایەو، ئەگەری ئەوەی هەیە بەرەو ئاکامێکی خراپتریشمان بەرێ!

دیارە ئێمە بۆیە باسی ئەو واقیعە دژوارەی میللەتەکەمان دەکەین، چونکە ئێمەش خۆمان بە بەرپرسیار دەزانین بەرانبەر بەو کێشەو قەیرانە جۆراوجۆرانەی، کە لەگەڵیاندا دەستەو یەخەین، بێگومانیش دەردەکانمان بە هەموو لایەکمان چارەسەر دەکرێن و، وەزعەکە هی ئەوە نیە هیچ کەس ئەو کۆڵە بە تەنیا بەکۆڵدا بدات، بەڵکو دەبێ هەموومان دەستبار بۆ یەکتر بگرین، بەڵام هیچ

گومانی تێدا نیە، کە هەتاکو جیددیتر بەرەو ئیسلام و پێوە پابەند بوونی هەنگاو هەڵێنین، دەرمانەکانمان زووتر دەستگیر دەبن و برینەکانمان زووترو ئاسانتر سارێژو چارەسەر دەکرێن، با ئەو پەندە کوردییەشمان بەسەردا نەچەسپێ، کە دەڵێ: (ماڵیان پڕ بوو لە ڕازیانە، منداڵیشیان بە سك ئێشە دەمرد).

ئێمە ماڵمان، کە ماڵی ئیمان و ئیسلامە، پڕە لەشیفاو، چارەسەری هەموو کێشەو قەیرانەکانمان، لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەدەست دەکەوێ، بەمەرجێك باش لێیان تێبگەین و، چاك پێیانەوە پابەند بین، دیارە ئەگەر واش نەبین ناتوانین باسی مسوڵمانەتیی خۆمان بکەین.

خوای پەروەردگار سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات و، ئومێدیشمان بەڕەحمەتی خوا هەیە، کە ئەو هەڕەشەو مەترسییانەی چاوەڕوانیان دەکەین، خوای باڵادەست لێمان وەدوور بخات و، خوا پشتیوان بێ، کەرکووك و ناوچەکانی دیکەش ئەمڕۆش نەبێ بەیانی، هەر دەگەڕێنەوە حاڵەتی ئاسایی خۆیان، خوای بەرزو توانا وڵات و میللەتمان سەربەرزو سەلامەت بکات و، لە ستەم و زۆری دوژمن و ناحەزان چەپاڵەی بدات و بیپارێزێ و، خوا بە لوتفی بێسنووری خۆی یاریدەمان بدات، کە لەنێو خۆشماندا دادگەریی و برایەتیی و تەبایی بچەسپێنین، چونکە هەتا لەنێو خۆماندا ڕیزەکانمان پتەوترو تۆکمەترو مەحکەمتر بن، بێگومان لە تەماع تێکرانی دوژمنانیشمان دوورتر دەبین.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين،
والحمد لله رب العالمين.

## دەستپێك

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله محمد و آله المهتدين بِهداه .

**بەڕێزان، خوشكان، برايان!**

بە گەرمییی بەخێرهاتنی هەموو لایەكتان دەكەم و، خۆشحاڵم كە بە دیدارتان شاد دەبم، لەم ئێوارە كۆڕەماندا.

(واقیعی هەرێمی كوردستان: گرفت و چارەسەر) ناوونیشانی ئەو بابەتەیە كە ئامادەم كردوە پێشكەشی ئێوەی بەڕێزی بكەم، دیارە ئەم ناوونیشانە فراوانەو شتی زۆری تێدا جێ دەبێتەوە، بەڵام من هەوڵم داوە ئەوەی، كە لە قەرەی ئەم كاتە كەمەدایە، بە پوختیی و گوشراویی لە سێ خاڵی سەرەكییدا پێشكەشتانی بكەم، بۆ ڕوونكردنەوەی بۆچوون و هەڵوێستی خۆمان، یاخود خۆم وەك ئینسانێكی مسوڵمان، لە بەرانبەر گرفت و كێشەكانی هەرێمی كوردستانداو چارەسەریشیان.

# خاڵی یەکەم: چەند سەرنج و تێبینییەک

**سەرەتا بە پێویستی دەزانم، سەرنجتان بۆ چەند تێبینییەک ڕابکێشم:**

**یەکەم:** ئەم قەوارەو واقیعە سیاسییەی هەرێمی کوردستان، زادەو بەرهەمی خەبات و بەرخۆدان و تێکۆشان و قوربانیدان و کوێرەوەیی و دەربەدەریی و شەونخوونی و شەبەیخوونی ساڵانێکی دوورو درێژی گەلەکەمان و خەڵکی کوردستانە، بە هەموو پێکهاتەکانی و بە هەموو چین و توێژەکانییەوە.

بۆیە پێویستە چەندەمان زەحمەت و ناڕەحەتیی کێشاوە لە پێناو هێنانەدییدا، هێندەو زیاتریش زەحمەت وەبەرخۆ بدەین و، دڵسۆزیی بنوێنین و خەبات و تێکۆشان بکەین، لە پێناو بەرەوپێشبردنی و پارێزگاریی لێکردنی و چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکانیدا.

چونکە بێگومان هەرشتێك ئینسان بە نرخێکی گران بەدەستی هێنابێ، عەقڵ و مەنتیق داوای لێدەکەن و دەخوازن، کە نەشهێڵێ بە ئاسانی لە دەستی بچێ و، هەر سروشتی ئینسانیش وایە، کە هەر شتێك زەحمەتی پێوە کێشابێ، زیاتر بە تەنگییەوە دەبێ، لەو شتەی کە بە ئاسانیی هاتبێتە دەستی.

**دووەم:** ئێمە هەموو لایەکمان لە بەرانبەر خەڵك و کۆمەڵگای خۆماندا بەرپرسیارین و، نابێ هیچ کامێکمان درێغیی بکات لە دڵسۆزیی نواندندا.

دیارە ئەوەش هەرکەسە بە ئەندازەی توانای خۆی، گێڕراوەتەوە کە دوای ئەوەی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەخرێتە (مەنجەنیق)ەوەو پێی فڕێدەدرێتە نێو ئەو ئاگرەی بۆی ئامادەکراوە، لە سەردەمی (نەمروود)دا، پەڕەسێلکە، یاخود

باڵندەیەکی ئاوا گچکە، بە دەندووکی ئاو دەبات بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە، لێی دەپرسن: خۆ ئاوەکە هێندە نیە کاریگەریی لەسەر کوژاندنەوەی ئەو ئاگرە هەبێ؟

ئەویش دەڵێ: من هەر ئەوەندەم لە تواناداا هەیەو، گرنگ ئەوەیە بە ئەندازەی خۆت دڵسۆزیی بنوێنی!

ئنجا بەهەرحاڵ ئێمە هەموو لایەکمان لە بەرانبەر ئەم واقیعەی ئێستا و ئەم کۆمەڵگاو خەڵکەماندا، بەرپرسیارین، هەرکەسە بە ئەندازەی تواناو بۆکرانی، وە بێگومانیش ئەگەر هەرکەسە بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵسێ بۆ چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکان و، نەهێشتنی کەم وکوورِییەکان، کاریگەریی خۆی دەبێ، وەك فارس دەڵێن: (قطره قطره دریا میشود) واتە: لە دڵۆپە دڵۆپەی باران دەریا پێکدێت.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ: ((**الدِّين النَّصيحة**))، واتە: دینداریی و مسوڵمانەتی دڵسۆزییە.

هاوەڵانی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دڵسۆزیی بۆ کێ؟

فەرمووی: ((**لله ولِكتابهِ ولِرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم**)) رواه مسلم.

واتە: دڵسۆزیی بۆ خواو بۆ کتێبی خوا- قورئان- و بۆ پێغەمبەر خوا (صلی الله علیه وسلم) و بۆ کاربەدەستانی مسوڵمانان و پێشەوایانیان، وە بۆ خەڵکی بە گشتی.

هەروەها فەرموویەتی: ((**كلكم راعٍ وكلكم مسؤول عن رعّيته**)) متفق علیه.

واتە: هەرکامێك لە ئێوە چاودێرەو، بەرپرسە بەرامبەر بە کۆمەڵگایەکەی، کەواتە: لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، هیچ کەس هەڵنەهاوێردراوەو جیانەکراوەتەوە، لەوەدا کە لە بەرانبەر خەڵك و کۆمەڵگای خۆیدا هەست بە بەرپرسیارێتیی بکات.

**سێیەم:** هەبوونی گیروگرفت و کەم وکووڕیی، هەمیشە لە ژیانی تاك و کۆمەڵدا شتێکی چاوەڕوانکراوە، واتە نابێ پێمان سەیر بێ و، پێمان شتێکی ناسروشتی و نائاسایی بێ، کاتێك کە باسی گرفت و کێشەی کۆمەڵگایەك بگرە خێزانێك و بەڵکو تاکێکیش بکەین و، زۆر شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراوە، چونکە خوای کاربەجێ ئەم ژیانی دونیایەی واهەڵخستوە، کە هەرگیز لە گرفت و کێشە خاڵی نابێ، وە تاقیکردنەوەی ئینسانیش لەوەدا بەرجەستە دەبێ، کە چۆن لەگەڵ گرفت و کێشەکاندا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو، چۆن چارەسەریان دەکات!

کۆمەڵگاو میللەتی ئێمەش، وێڕای ئەو حاڵەتە سروشتیی و ئاساییەی، کە هیچ کەسێك و هیچ خێزانێك و هیچ کۆمەڵگایەك بێگرفت و کێشە نابێ، سێ هۆکاری دیکەش هەن، کە بەهۆیانەوە گرفت و کێشەمان هەر دەبن:

أ- نەبوونی ئەزموونی حوکمڕانیی: ئێمەی گەلی کورد ئەزموونی حوکمڕانییمان زۆر کەمە، فەرهەنگ و کلتووری ئێمە، زیاتر فەرهەنگ و کلتووری شۆڕش و خەبات و بەگژ ستەمکارو داگیرکەراندا چوونەوەیە، بۆیە ئێمە زۆرباش دەزانین شۆڕش بکەین، بەرەنگار بینەوە، شوێنێك برووخێنین و تێکیبدەین، بەڵام ڕەنگە باش نەزانین چاکسازیی بکەین، بینا بکەین و دروست بکەین، چونکە مێژووی میللەتەکەمان و ئەزموونی ڕابردوومان، لە ڕووی فەرمانڕەوایی و حوکمڕانییەوە نەدارە!

ب- کێشەو شەڕی نێوخۆشمان، شوێنەواری زۆر خراپی بەجێهێشتوە، کۆمەڵێك گرێکوێرەی لەسەر دڵ و مێشکی زۆر لە خەڵکمان دروستکردوە.

ج- هەبوونی خەڵکی ناحەز، بێگومان زۆرن ئەوانەی کە ئەو حەقەی خوا بەهەموو گەل و نەتەوەیەکی داوە، پێمان ڕەوا نابینن و، زوڵم و ستەممان لێدەکەن، چ لە دەرو دراوسێ، چ لە خەڵکی دیکەش.

**چوارەم:** هیچ کەس لەوە گەورەتر نیە ڕەخنەی لێبگیرێت و، هیچ کەسیش لەوە بچووکتر نیە ڕەخنەی بەجێ بگرێ!

وە لە ڕاستیدا كەسێك ڕەخنەی لێدەگیرێ، كە لە ئیشدابێ و هەبێ و بوونی هەبێ، ئەسڵی ڕەخنە لێگیران و تێبینی و سەرنج لەسەردرانی مانای ئەوەیە ئیشێكی هەیەو، كاری بەدەستەوەیەو بوونێكی هەیە، پێشینانی خۆشمان زۆر جوانیان گوتوە: (دۆست ئەو كەسەیە دەتگریەنێ، بەڵام دوژمن و ناحەز كەسێكە، دەتهێنێتە پێكەنین)، چونكە كەسێك دۆستی ئینسان بێ و بۆی دڵسۆز و بەپەرۆش بێ، كاتێك عەیب و كەم وكووڕییەك دەبینێ، ئەگەر بزانێ ئەو كەسە پێشی قەڵس دەبێ و، لەسەر دڵیشی تاڵ دەبێ، هەر ئاگاداری دەكاتەوە، بۆ ئەوەی ناتەواویی و كەم وكووڕیی یەكانی لابەرێ، تاكو كامڵترو چاكتر بێ، بۆیە هیچ كەس نابێ بەڕەخنە قەڵس بێ، بەڵام وەك گوتم، دەبێ ڕەخنەكەش بەجێبێ و، لە قاڵبی ئەدەب دەرنەچێ!

خوای بەرز و مەزن، دوان لەو چوار سیفەتانەی بۆ ئینسانی سەرفرازیان دیاریی دەكات، بریتین لە یەكدی ڕاسپاردن بە شوێنكەوتنی حەق، وە یەكدی ڕاسپاردن بە خۆڕاگریی، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣ ﴾ .

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بێگومان مرۆڤ لە زیانباریی دایە، بێجگە لەوانەی ئیمانیان هێناوەو، كردەوە باشەكان ئەنجام دەدەن، وە یەكدی ڕادەسپێرن بە حەق وە یەكتر ڕادەسپێرن بە خۆڕاگریی.

عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازیبێ) جێنشینی دووەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جوانی گوتوە، كاتێك كە لە دانیشتنێكدا پیاوێك ڕەخنەیەكی لێگرت، یاخود پێی گوت: لە خوا بترسەو پارێز لە خوا بكە، كەسێكی ماستاوچیی (متملّق) كە لەوێ بوو - دیارە هەمیشە كەسانی ئاوا بە دەوری حوكمڕان و كاربەدەستانەوە زۆرن- گوتی: چۆن ڕەخنە لە فەرماندەی مسوڵمانان دەگری و پێی دەڵێی: پارێز لە خوا بكە؟!

عومەر (خوا لێی ڕازیبێ) لە دەمی کابرای دووەمی دایەوەو، گوتی: وازی لێ بهێنە، ئنجا ئەم وتە جوانەی گوت: (لا خیر فیکم إن لم تقولوها، ولا خیر فینا إن لم نسمعها)، واتە: ئێوە خێرتان پێوەنیە ئەگەر نەیڵێن، ئێمەش خێرمان پێوەنیە، ئەگەر نەیبیستین و وەری نەگرین.

بەڵام بێگومان پێویستە (ڕەخنەگرتن)یش چەند شتێکی تێدا ڕەچاو بگرێن، ئەگەر بویسترێ بەرهەمداربێ:

**یەك:** لە دڵسۆزیی یەوە بێ، نەك لە کینەو بوغزو غەرەز، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: دینداریی دڵسۆزیی یە، (**الدِّین: النَّصیحة**).

**دوو:** پێویستە بە ئینساف و بە ویژدانەوەبێ، واتە: ئەگەر ئینسان خراپەی بینی، چاکەکانیش ببینێ و، هەر لەپشت پەردەی ڕەشەوە سەیر نەکات، هەربۆیەش فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شێوازی ڕەخنەگرتنمان فێر دەکات کە دەفەرموێ: ((**المؤمنُ مِرآة المؤمنِ ..**))[1]، واتە: ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره.

ئاوێنە خۆتت پێشان دەدات وەك خۆت، چاکەکانیشت پێشان دەدات و خراپەکانیش، جوانییەکان و ناشیرینییەکانیش.

**سێ:** دەبێ ڕەخنەگرتن بۆ ڕاستکردنەوەبێ، نەك بۆ ناوزڕاندن و ناشیرینکردن و بریندارکردن، بۆیە مەرج نیە ڕەخنەگرتن هەموو کاتێك لە ڕاگەیاندنەوە بێ، یاخود لە نێو خەڵك و جەماوەردا بێ، جاری وایە پێویستە ڕەخنەگرتن بەنامەیەکی تایبەت، بە قسەیەکی تایبەت بێ، یاخود لە دیدارو دانیشتنێکی تایبەت دابێ، ئەگەر مەبەست ڕاستکردنەوەبێ، ئەگەر مەبەستیش ناوزڕاندن بێ، ئەوە شتێکی دیکەیە.

**چوار:** هەروەها دەبێ ڕەخنەگرتن بابەتیی (موضوعي)یانە بێو لەسەر بناغەی زانیاریی ڕاست و دروست بێ، نەك لەسەر بناغەی تۆمەت و گومان!

---

(١) رواه أبو داود عن أبي رفعة والعسكري عن أبي هريرة والطبراني والبزار والقضاعي عن أنس.

پێنجەم: واقیعی ئێستای هەرێمی کوردستان، هەرچەندە گرفت و کەم وکووڕیی هەن، کە هەموو لایەك دان بەوەدا دێنن، بەڵام بێگومان لایەنی چاك و شتی باشیشمان هەیە، دیارە وەك پێشتر باسم کرد، هەر دروستبوونی ئەم واقیعە، کە هەتا ئەندازەیەك هەموومان تێیدا ئازادین و ڕێژەیەك (نسبة) ئازادیی بۆ هەموو لایەك هەیە! هەر ئەوە خۆی دەستکەوتە، وە ئێمە کە خاوەنی ئیدارەی خۆمانین، بێگومان ئەوە دەستکەوت و نیعمەتێکە، نابێ بە کەمی بگرین، وە ئەوەش کە ئێمە ڕەخنەی لێدەگرین، مانای وایە واقیع و بوونێکمان هەیە، بۆیە بە ڕەخنە لێگرتن دەمانەوێ چاکی بکەین.

مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە لەگەڵ گرفت و کەم وکووڕیی یەکانیشدا، لایەنی چاکەو ئیجابییشمان هەن و، دەستکەوتی باشیشمان هەن، لەبەرئەوە وەك چۆن نابێ بە هۆی لایەنە چاك و ئیجابییەکانمانەوە، گرفت و کەم وکووڕیی یەکانمان نادیدە بگرین، بە شێوەیەك کە هەر باسی چاکەکانمان بکەین و بڵێین ئەوەمان کردووەو هەیە، بۆ ئەوەی هەڵەو ناتەواویی و کەم وکووڕیی یەکانی پێ داپۆشین، کە ئەوە هەڵەیە، بە هەمان شێوەش، بە هۆی گرفت و کێشەو کەم و کووڕییەکانیشەوە، نابێ لایەنی چاکەو ئیجابییەکانی خۆمان بەگشتی و، هی هەر کەسێکیش بە تایبەتی، داپۆشین، خوای کاربەجێ کە هەموو فەرمایشتەکانی جوانن، چەند جوان دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ .... ﴾ (الشعراء-١٨٣).

واتە: وە شتی خەڵکی بە کەم مەگرن، ئەگەر شتێکی باشیان هەیە بیڵێن و، چەند دێنێ ئەوەندە نرخەی لەسەر دابنێن، ئینسان نابێ بێویژدان بێ، عەرەب گوتوویانە: (الإنصاف خير الأوصاف). واتە: بە ویژدان بوون چاکترین سیفەتە.

دیارە دەبێ ئەو ڕاستییەش بزانین، کە کۆمەڵێك گرفت و کێشەمان هەن لە توانا و ئیرادەی خۆمان بەدەرن، شتێك کە لە توانای خۆمان بەدەرە، نابێ بیکەینە ڕەخنە لەسەر یەکدی، مەگەر هۆکاری ئەو چوونەدەرە لە ئیرادەی خۆمان، تاوانی خۆمان بێ و، کاردانەوەی هەڵوێستی خۆمان بێ، ئەوکاتە

دەبێ ئەو قسەو هەڵوێستانە، چارەسەر بکرێن، کە بوونەتە هۆکاری چوونەدەری لەئیرادەو توانای خۆمان!

**شەشەم:** ئەو گرفت و کێشانەی باسیان دەکەین، مەرج نیە هەموویان تەنیا بەدەستەڵاتەوەو بە دام ودەزگاکانی حکوومەتەوە، پەیوەست بن، بەڵکو زۆربەیان کەم و زۆر، پەیوەندییان بە سەرجەم کۆمەڵگاو تاکەکانیشەوە هەیە، وە من بە گشتی خۆمانم وەك گۆشتی سەر چەپەرێ هێناوەتە گۆڕێ، واتە: من باسی حاڵەتەکەم کردوە بەگشتی، بەڵام بێگومان لە چاککردن و چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکاندا، دەستەڵات و حکوومەت و دام و دەزگاکانی، پشکی شێریان بەردەکەوێ، وە هەرکەسێك دەستەڵاتی زیاتر بێ زیاتر بەرپرسیارە.

بەڵام دیسان مەرجیش نیە، کە سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگا و تاکەکانیشی لەو گرفت و کەم وکووڕیی یانەدا، وەك یەك بەشدار بن، بەڵکو هەیە بەشی زیاتری بەردەکەوێ و، هەیە کەمتر، وە ڕەنگە هەشبێ هیچی بەرنەکەوێ، ئەم کەم وکووڕیی یانەی تێدا نەبن، بەڵام وەك گوتمان من لێرەدا وەك حاڵەتی گشتی قسە دەکەم.

**تێبینیی حەوتەم و کۆتایی:** پێویستە هەر لە سەرەتاوە ئەو ڕاستییە بڵێم کە: خستنەڕووی گرفت و کەم وکووڕیی یەکانی هەرێمەکەمان و، دەستنیشانکردنی چارەسەرەکانیش، بەڕاستی لە قەرەی کوڕ و وتارێك ئاوای ئێمەدا نیە، بەڵام (مالا يُدْرك كُلُّهُ لا يُتْرك بَعْضُهُ)، بۆیە هیوادرم تیشکێکی باش بخەینە سەر گرفت و کەم وکووڕیی یەکانمان و، خاڵە سەلبییەکانی ئەم واقیعەمان، وە ئەو چارەسەرانەش، کە پێویستە بگیرێنەبەر.

هەڵبەتە ئەوەش، کە من لێرەدا دەیڵێم و دەیخەمەڕوو، تێڕوانینێکی ئیسلامییانەیە، بۆ ئەو واقیعەی خۆمان بە کورتیی و پوختیی، هەم گرفت و کێشەو کەم و کووڕیی یەکان و، هەم چارەسەرەکەشیان، بەڵام ناڵێم دەقاودەق ئەوەی دەیڵێم هەموو ڕاوبۆچوونی ئیسلامە، بەڵکو ڕاوبۆچوونی خۆمە، وەك تێگەیشتنم بۆ ئیسلام.

## خاڵی دووەم: گرفتەکان

من گرفت و کەم وکوورِیی یەکانی واقیعی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستانم خستوونە (٦) شەش بوارەوە، کە بێگومان دەگونجێ بۆ زۆر بواری دیکەش دابەش بکرێن، وەك سەرەتاش باسم کرد، وە دیارە من هەوڵم داوە بە پوختیی و گوشراویی بیانخەمەڕوو، وە شتی سەرەکیی باس بکەم، واتە: ئەوەی بەلای منەوە گرنگ بوون، ئەمانەی خوارەوەن، کە لە هەر ڕووێکەوە، باسی چەند کێشەو گرفتێکم کردوە، بەم شێوەیە:

١- لە ڕووی فیکرییەوە.

٢- لە ڕووی سیاسییەوە.

٣- لە ڕووی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە.

٤- لە ڕووی ئابووریی و ژیان و گوزەرانەوە.

٥- لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە.

٦- لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە.

هەڵبەتە لێرەدا بە خێرایی بەسەر گرفتەکاندا دەڕۆین، بۆ ئەوەی کە بەنەفەسێکی درێژتر، باسی چارەسەر بکەین، چونکە گرفتەکان لەبەرچاومانن و زۆرجاریش باسکراون، بەڵام بەڕاستی، هونەر هەر ئەوە نیە، کە ئینسان هەمیشە ڕەخنە بگرێ و عەیب بدۆزێتەوە، بەڵکو هونەری گەورە ئەوەیە، کە چارەسەر بۆ گرفت و نەخۆشییەکان دابنرێ، وە هونەری گەورەتریش ئەوەیە، کە گیروگرفت و کێشەکان پاش دۆزانەوەی چارەسەریان، بە کردەوە چارەسەر بکرێن! وەك من زۆرجار گوتوومە: وەرە سەد عەیبم لێبگرەو لێم بدۆزەوە، بەڵام یەکێکیانم لەگەڵ چاك بکە!

بەڵێ، بەڕاستی ڕەخنەگرتن ئاسانەو، چارەسەر دۆزینەوە زەحمەتە و، چارەسەرکردن زەحمەتتریشە!

## ١- لە ڕووی فیکرییەوە:

**١- بزرکردنی ناسنامە:** کەسێك لە دەرەوەی واقیعی هەرێمی کوردستان تەماشای هەرێمەکەمان بکات، لە ئاوێنەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا، بە زەقیی هەست دەکات، کە بەشێکی ئەم میللەتە ناسنامە (هوية)ی خۆی بزرکردوە، ئایا مسوڵمانە یان نامسوڵمانە؟! وە ئایا هەڵوێستی بەرامبەر بە ئیسلام چییە؟ هەر بەڕاست وەك ئیددیعا دەکات، ئیسلام بە عەقیدەو بەرنامەی خۆی دەزانێ؟ ئەگەر وایە، بۆچی سەدویەك شتی تێدایە، کە ئیسلام پێی ڕازی نیەو وەك هی مسوڵمانان ناچێ؟!

**٢- لاساکردنەوەی کوێرانەی ئەملاولا بەتایبەت ڕۆژئاوا،** وە وەرگرتنی شتە خراپەکانیان، یان ئەو شتانە کە تایبەتمەندیی خۆیانە، ئاخر هەندێك تایبەتمەندیی هەیە، هی میللەت و کۆمەڵگایەکە، بەکەڵکی ئێمە نایەت و بە هیچ جۆرێك لەگەڵماندا ناسازێ و، لەگەڵ ئایین و مێژوو و کلتوورماندا ناگونجێ.

**٣- متمانە بەخۆ نەمان و لەبیرکردنی:** دین و مێژوو و کلتوور، وە چەسپینی ئەو وەهمە، کە بەبێ دەستبەرداربوونی (دین)مان، ناتوانین پێشبکەوین!!

## ٢- لە ڕووی سیاسییەوە:

١- حیزب کردنە ئامانج و زاڵکردنی بەرژەوەندیی تایبەتیی و حیزبیی، بەسەر بەرژەوەندیی گشتییدا.

کە ئەوە لە ڕاگەیاندندا، لە بەڕێوەبردندا، لە پەرلەماندا، لە هەموو دام و دەزگاکاندا، ئەو دیاردەی حیزبگەرایی و حیزب کردنە ئامانجە شتێکی بەرجەستەیەو، زۆر بەزەقیی دەبینرێ و بەڵگەنەویستە.

٢- دەربازنەبوون لە گرێ و گۆڵی ڕابردووی تاڵ، کە مەبەستم شەڕو کوشتاری نێوخۆیە.

٣- گەرم و گــوڕیی لە کۆبوونەوە و ڕێککەوتننــامــەکاندا و، ســاردوسڕیی لە جێبەجێکردن و پێوە پابەندبوونیاندا.

٤- هەبوونی گیانی پاوانخوازیی، بەڵێ کراوەییەك هەیە، بەڵام بێگومان تا ئێستاش ڕووحی پاوانخوازیی و، تەنیا خۆ بینین و، حیساب بۆ خەڵکی نەکردن هەیە.

## ٣- لە ڕووی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە:

١- کاڵبوونەوەی ئینتمای نەتەوەیی و نیشتمانیی، بە قازانجی ئینتمای حیزبیی و ناوچەیی و...هتد.

من لەبیرمە: کاتی خۆی کە لە گەرمەی خەباتی شاخ و خەباتی ڕزگاریخوازییدا بووین، کوردایەتیی وشەیەك بوو ڕەونەقێکی زۆری هەبوو، هەروەها وشەکانی: (پێشمەرگە) و (شۆڕش) و (خەبات) و (بەرخۆدان) ڕەونەقێکی زۆریان هەبوو، هەروەها وشەکانی: (نیشتمان پەروەریی) و (نەتەوایەتیی) هەروا، بەڵام پێم وایە ئێستا ئەوانە هەموویان تا ڕاددەیەکی زۆر کاڵبوونەتەوە!

٢- کوردایەتیی و نیشتمانپەروەریی کردنە پاساوی زۆر دیاردەی خراپی وەك: حیزبگەرایی، گەندەڵیی، کەم چیکڵدانەیی لە بەرانبەر ڕەخنەو نارەزایی خەڵکدا، هەروەها پشتگوێ خستنی چارەسەری زۆر گرفت و نەخۆشیی و، فەرامۆشکردنی چەسپاندنی گەلێك شتی باشی پێویست، بە بیانووی ناسکیی هەلومەرج و، بە پاساوی هەستیاریی قۆناغی سیاسیی و نەتەوەییمان.

## ٤- لە ڕووی ئابووریی و ژیان و گوزەرانەوە:

١- پەرەستاندنی حاڵەتی ستەمی کۆمەڵایەتیی و، ڕۆژ بۆ ڕۆژ زیاتر قووڵبوونەوەی دیاردەی چینایەتیی و قڕیی وپڕیی و...هتد.

٢- ڕوو بە تەنبەڵیی و بەکاربەریی (مستهلك) چوونی کۆمەڵگا[١] و نەبوونی ژێرخانی ئابووریی و، خاوەن نەبوونی هیچ کام لە پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانە.

٣- پێشبڕکەکردن لە زێدەڕۆیی و خۆشگوزەرانییدا.

٤- پەرەستاندنی گیانی خۆویستیی (أنانية)و کزبوونی گیانی بەزەیی و خێرخوازیی و بەتەنگ یەکدییەوە بوون.

٥- لە ئەندازە دەرچوونی ڕێژەی مووچەخۆریی، لەسەر حیسابی کاروکاسبی و گوندنشینیی، بەهۆی مونافەسەی حیزبییەوە، کە بێگومان مەبەست لێرەدا مونافەسەی نێوان هەردوو حیزبی حوکمڕانی (پارتی، یەکێتی)یە، کە بەپێی هەندێك سەرژمێر، ڕێژەی مووچەخۆران بە هەموو جۆرو شێوەکانیانەوە، گەیشتۆتە زیاتر لە ملیۆنێك و سێسەد هەزار کەس، کە بۆ دانیشتوانێکی چوار پێنج ملیۆنیی کەمتر، یان زیاتر، ئەم ڕێژەی مووچەخۆرییە، یەکجار زۆرە.

## ٥- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

١- داڕووخانی ڕەوشت و، پەرەستاندنی چەندان نەخۆشیی و دیاردەی ترسناکی کۆمەڵایەتیی وەك: کوشتنی بەناهەق، دزیی و جەردەیی، داوێن پیسیی و، مەیخۆریی و تلیاك کێشان.

٢- تەشەنەکردنی سەرگەردانیی و نائومێدیی و، لاسایی کردنەوەی کوێرانە لەنێو چینی گەنج و لاودا بە (نێرو مێ)وە و، بە پاشەوە چوونەوە لە بواری خوێندن و زانستدا.

---

(١) واتە کۆمەڵگا بەگشتی بە حکوومەت و میللەتەوە، بەڵام بێگومان خەڵکی ئیشکەرو گورج و گۆڵ و ماندووش زۆرە، تەنبەڵکردنی خەڵکیش زیاتر فیتی دەستەڵاتی سیاسی یە، کە بەهۆی مونافەسەی حیزبییەوە، خەڵکێکی زۆر کراوەتە مووچەخۆرو، پشتی لەکاروکاسبیی ساردبۆتەوە.

٣- سست بوونی پایەکانی خێزان و، زۆربوونی ڕێژەی جیابوونەوە (طلاق) بە هۆی ناپاکیی هاوسەریی (الخیانة الزوجیة)یەوەو، ساردیی لە پێکەوەنانی خێزان.

٤- خۆکوشتنی ئافرەتان، یاخود کوشتنیان.

### ٦- لە ڕووی ڕاگەیاندنـەوە:

١- بەرجەستەکردنی کلتوورێکی نامۆ بە کۆمەڵگای کوردەواریی، لە ڕووی فیکریی و هونەریی و ئەخلاقیی و...هتدەوە.

٢- بێهێزیی لە ڕووی زانستییەوە.

٣- جەخت کردنە سەر سەرگەرمکردنی خەڵك و، جووڵاندنی غەریزەی جینسیی لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکەی پێویست بۆ کۆمەڵگای ئەمڕۆمان، لەڕووی ڕاگەیاندنەوە.

# خاڵی سـێیەم: چارەسـەر

## ١- لە ڕووی فیكرییـەوە:

من پێم وایە ئەو دەردو گرفتە فیكرییانەی هەمانن، بە ڕەچاوكردنی ئەم خاڵانە، زۆریان چارەسەر دەكرێن:

یەك: جەخت كردن لەسەر ناسنامەی ڕاستەقینەمان، هی هەموو خەڵكی كوردستان، یان زۆربەی هەرەزۆری كۆمەڵگاكەمان، كە مسوڵمانەتییە:

چونكە ئەگەر بە پێی سیستمی دیموكڕاسییش بێ (دیارە من وەك ئیسلامییەك ئەگەر ناچاری نەبێ، باسی دیموكڕاسی ناكەم، ئەویش لەبەرئەوەنا كە ئیسلام دژو پێچەوانەی دیموكڕاسییە، هەرچەندە بێگومان خاڵی جیاوازو تێككگیراویشیان هەنە، بەڵكو لەبەرئەوە، كە ئیسلام سەرجەم لایەنە چاكەكانی دیموكڕاسی بەشێوەیەكی چاكتر تێدان و، لە لایەنە خراپەكانیشی دوورە، بەڵام لەكاتی غیابی سیستمی حوكمڕانیی ئیسلامدا، وەك زۆرجار گوتوومە: دیموكڕاسی چاكی نێو خراپانەو، كاتێك ئیسلام وەك عەقیدەو، پاشان وەك شەریعەت و سیستمی حوكمڕانیی، بەرجەستە نەبێ لە ژیانی خەڵكدا، بێگومان ئەوە دیموكڕاسی لەهەموو سیستمەكانی دیكە باشترە) حیساب بۆ زۆرینە دەكرێ، وە دەبێ كەمینە خۆی لەگەڵ زۆرینەدا بگونجێنێ، بێئەوەی كە مافەكانی بفەوتێن، بەڵێ، پێویستە جەخت لەسەر ناسنامەی ڕاستەقینەمان بكەین، كە مەبەستمان مسوڵمانەتییەو، نابێ بە مسوڵمانەتیی خۆمانمان شەرم بێ، بەڵكو دەبێ شانازیی پێوەبكەین.

پاشان پێویستە مسوڵمانەتییەكەمان بژار بكەین لە هەڵەوپەڵە! لەو كەم و كووڕیی یانەی، كە خۆمان تێمانخستوون، بەڕاستی من زۆر خەفەت دەخۆم وەختێك دەبیستم ئافرەتان خۆیان دەكوژن، یاخود تاوانی كوشتنی ئافرەتان ئەنجام دەدرێ و ئیسلامیشی پێ تۆمەتبار دەكرێ! یان كە دەبیستم لە لایەن كەسانێكی نەزان، یان زۆرزانەوە، تاوانی زۆر كێشەو كەم وكووڕیی كۆمەڵایەتیی پاڵدەدرێتە لای ئیسلام، كە ئیسلام لە ئەسڵدا بۆیە هاتوە هەموو ئەو دەردو نەخۆشیی و گیروگرفتانە چارەسەر بكات.

بەڵێ، زۆر جۆرە ستەم لە ئافرەت دەكرێ، كە ئەگەر ئیسلام كاری پێبكرێ و، خەڵك پێیەوە پابەند بێ، هیچ كام لەو ستەمانەی لێ ناكرێن.

هەروەها لە زۆر ڕووی دیكەوە، لە ڕووی سیاسییەوە لە ڕووی ئابوورییەوە، لەڕووی ڕەوشت و خوو و كۆمەڵایەتییەوە، ئێمە وەك میللەتێكی مسوڵمان، ئەگەر پابەندبین بە دینەكەمانەوە، ئەو گرفتانە هەر دروست نابن، چ جای تۆ بێنی ئەو تاوان و كەم وكووڕیی یانە، بگێڕیەوە بۆ ئیسلام!

بۆیە ئێمە هاوكات لەگەڵ جەخت كردنەوەمان لەسەر ناسنامەی مسوڵمانەتیی خۆمان و، پابەندییمان بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، بۆ ئەوەی بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دوارۆژ بین، بەڕاستی دەبێ خۆشمان بژار بكەین لەو كەم و كووڕیی و، لەو شتە خراپانەی كە هاتوونە نێو مسوڵمانەتیی و دینداریی‌یمانەوە، لەو بیدعەت و داهێنراوە نابەجێیانەی كە بەدەستی خۆمان خزاندوومانە نێو دینداریی و مسوڵمانەتییمانەوە، كە دەرفەت نیە لێرەدا ئاماژە بەوە بكەم، چۆن و لە چ ڕێیەكەوە، ئەو شتانە دزەیان كردۆتە نێو ئیسلامەتیی.

كە بەداخەوە زۆرجار كەسانی ڕۆشنبیر و نائاشنا بە ئیسلام، یاخود خەڵكانێك، كە ڕەنگە لە ئیسلامیش شارەزا بن، بەڵام خۆیانی لێ نەزان دەكەن، ئەو كەم و كووڕییانەی مسوڵمانان دەكەنە بیانووی ڕەخنەگرتن لە ئیسلام، كە لە ڕاستیدا ئەوە بێویژدانیی و بێئینسافییە، چونكە بێگومان هەر بەرنامەیەك دەبێ بەوە دادگایی (محاكمة) بكرێ، كە بۆخۆی فەرمانی پێكردوەو لە خودی خۆیدا هەیە، بەڵام هەر كاتێك شوێنكەوتووەكانی پێچەوانەی خۆی ڕەفتار بكەن، نابێ

گلەیی لە بەرنامەکە بکرێ، بەڵکو عەقڵ و مەنتیق وا دەخوازن، کە گلەیی لە شوێنکەوتووانی بکرێ، دیارە ئەوە بۆ ئیسلام و غەیری ئیسلامیش هەر وایە.

بەڵێ، ناسنامەی ڕاستەقینەی ئێمە مسوڵمانەتییەو، ئەوەش جێگای ئەوپەڕی شانازییمانەو، مایەی سەربەرزیی دنیاو سەرفرازیی دواڕۆژمانە، وەك خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ ... هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ... ﴾ (الحج- ٧٨).

واتە: خوا (جل شأنە) ناوی لە ئێوە - واتە: ئۆممەتی ئیسلام - ناوە مسوڵمان، لە پێشداو لەم قورئانەشدا، تاکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چاودێر - و بەڵگەو شایەد - بێ بەسەر ئێوەوە، وە ئێوەش چاودێر - و بەڵگەو شایەد - بن بەسەر خەڵکەوە.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئیسلامی بەتەواوی لە خۆیدا بەرجەستە کردبوو، واتە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) یەکسان بوو بە ئیسلام، وەك لە دایکمان (عائیشە) خوا لێی ڕازیبێ گێڕراوەتەوە، کە گوتوویەتی: ((كانَ خُلُقهُ القرآن)) رواه مسلم، واتە: ڕەوشت و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قورئان بوو، بۆیە ئەو بەڵگەبوو بەسەر ئێمەوە، کە ئیسلام حەق و ڕاستەو بەرنامەی خوایە بۆ بەختەوەریی و سەرفرازیی ئینسان لە دنیاو دواڕۆژدا، ئێمەش دەبێ وابین و ئیسلام وا لەخۆماندا بەرجەستە بکەین، کە بەڵگەی ڕاستیی ئیسلام بین بەسەر خەڵکەوەو، شایەدی ڕاستیی و تەواویی ئیسلام بین بەسەر خەڵك و دەوروبەرەوە، وەك چۆن کاتی خۆی، کە ئیسلام باش پراکتیزە کراوەو مسوڵمانان پێیەوە پابەند بوون، بەشێوەیەکی حەق و ڕاستەقینە، مسوڵمانان بەڵگەی ڕاستیی ئیسلام بوون بەسەر مرۆڤایەتییەوەو، سەرجەم ئەو گەل و نەتەوانەی سەر زەویشیان بەهرەمەند کردوە، لە هەموو ئەو خێرو بێرو بەرەکەتەی، کە لە ئیسلام و ئایینی خوادا هەیە.

واتە: ئەو گەل و نەتەوانەی دەنگیان پێیان گەیشتوە.

دوو: وەرگرتنی شتە باشەکانی خـەڵك و،
خۆپاراستن لە لاسایی کردنەوەی کوێـرانە:

بەڕێــزان!

هەمیشە لاسایی کردنەوە، دەردێکی کوشندەو شتێکی خراپە، بۆ؟ چونکە ئەو کەسە کە تۆ وەك ئەو دەکەی، بەبێ ئەوەی کە لە فەلسەفەی بیرکردنەوەو ڕەفتارو هەڵس وکەوتەکەی تێبگەی، ئەوە شتێکی زۆر ناپەسندو دزێوە، چونکە ڕەنگە ئەو ڕەفتارەی ئەو دەینوێنێ، یان ئەو قسەیەی ئەو دەیکات و، ئەو حاڵەتەی ئەو لە خۆیدا بەرجەستەی دەکات، بۆ ئەو پاساوو بەڵگەیەك هەبێ، بەڵام کە تۆ وەك ئەو دەکەی، بێئەوەی لێی تێبگەی، شتێکی زۆر سەیر دەکەوێ، وە دیارە لە نێوخەڵکیشدا باوە کە مەیموون بە ڕەمزی لاسایی- کردنەوە دادەنرێ! واتە ئینسان چی بکات، ئەویش وادەکات.

بەڕاستی لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە، دەردێکی کوشندەیە، مێژوونووسی بەناوبانگ (إبن خلدون) لە سەرەتای کتێبەکەی (المقدمة)دا قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: (المغلوب مُولَعٌ بتقليد غالِبِه)، واتە: کەسێك کە هەست بە تێشکاویی دەکات، هەمیشە سەرگەرمی ئەوەیە، خۆی وەك ئەوکەسە لێبکات، کە تێکیشکاندوەو بەسەریدا زاڵ بووە.

بۆیە بێگومان حاڵەتی لاسایی کردنەوە، زیاتر لە کەسانێکدا بەرجەستە دەبێ، کە لە بەرانبەر ڕۆژئاواو لە بەرانبەر ئەوانەدا، کە هەڵگری فیکرو فەلسەفەیەکن کە نەیارە بە ئیسلام، هەست بە تێشکاویی دەکەن و، هەست بەوە دەکەن، کە دەست بەتاڵن و ڕووت و ڕەجاڵن و، پێیان وایە هیچیان نیە، بۆیە ئەو هەست کردن بە تێشکان و نەزانیی و ئاتاجییە، پاڵیان پێوە دەنێ، کە وەك ئەوان بکەن، لە بیرکردنەوەو هەڵس وکەوت و ڕەفتارو، تەنانەت بەرگ و پۆشاکیشدا!

بەڵێ، پێویستە ئێمە شتی سوودبەخش و باشی خەڵك وەربگرین، جوانیش گوتراوە: (أنظر الى ما قيل، ولا تنظر الى من قال)، واتە: تەماشا بکە چی گوتراوە،

تەماشا مەکە کێ گوتوویەتی، وە ئەوە ئایەتی خوای کاربەجێشی لەسەرە، کە دەفەرموێ:

﴿...فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ...﴾ (الزمر: ١٧-١٨).

واتە: مژدە بدە بە بەندەکانم، ئەوانەی گوێ بۆ هەر قسەیەك دەگرن، بەڵام دوای چاکترینی دەکەون، واتە: نەك وەك سەبەتە هەر شتێکی تێبکرێ، وەریبگرێ، بەڵکو وەك بێژینگ شتەکە لە بێژینگ دەدەن و، ئەوەی بە کەڵك بێ، وەریدەگرن و، ئەوەش کە سەرکوێرو سەرکۆتەڵیش بێ، لایدەدەن و فڕێی دەدەن.

خوای کاربەجێ وەك چۆن مەدحی کەسانێك دەکات، کە شتی باش لە خەڵك وەردەگرن، جا خەڵکەکە هەر کەسێك بن، سەرزەنشتی ئەو کەسانەش دەکات کە لاسایی خەڵك دەکەنەوە، با ئەو خەڵکە باب و باپیرانیشیان بن، لە چەند شوێنێکی قورئانێدا خوا (سبحانە وتعالی) سەرزەنشتی کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەران دەکات، بەوەی کە ئەگەرپێیان بگوترێ: بڕوا بێنن و وەرنە سەر ڕاستە شەقامی خوا، دەڵێن:

﴿بَلۡ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ﴾ (الزخرف- ٢٢).

واتە: ئێمە باب و باپیرانمان و پێشینانمان لەسەر ڕێبازێك بینیوە، ئێمەش بەدوای ئەوان دەکەوین و ڕچەی ئەوان دەگرین و بەرینادەین، خوای دادگەریش لەوەڵامیاندا فەرموویەتی:

﴿...أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ﴾ (المائدة- ١٠٤).

واتە: ئەدی ئەگەر باب و باپیرانیان و پێشینانیان، نەیانزانیبێ و ڕێگایان نەدۆزیبێتەوە، دەبێ هەر بەدوایان بکەون؟!

کەواتە لە ئیسلامدا بۆت نیە بەدوای باب و باپیرانیشت بکەوی، لە شتی ناحەق و بەتاڵ و پووچدا، چ جای بەدوای بێگانەیەك بکەوی، کە بڕوای بە ئایین و بەرنامەی تۆ نیە!

ئنجا هەندێك كەس وادەزانن، كە ئێمەی ئیسلامیی، هەستیاریی مان هەیە بەرانبەر بە هەر شتێك، كە لە لایەن غەیری مسوڵمانانەوە هاتبێ! بەڵام بێگومان ئەوە وانیە، بەڵكو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فێری كردووین، كە زانیاری و حیكمەت لە هەر كوێیەك و لە هەر كەسێكەوە بێ، وەریبگرین، وەك فەرموویەتی: ((الحكمة ضالّة المؤمن فيحثما وجدها فهو أحق بها)) رواه الترمذي، واتە: حیكمەت بزربووی ئینسانی بڕواداره، لە هەر شوێنێك بیدۆزێتەوە، لە هەموو كەس زیاتر پێی شایستەیە، واتە: وەك چۆن كەسێك شتێكی لێ ون دەبێ و زۆر بە تامەزرۆیی و عەوداڵیی بەدوایدا دەگەڕێ، حیكمەت ئاوا لە ئینسانی مسوڵمان بزر بووە، حیكمەتیش، واتە زانیاریی و كردەوەو قسەی بەجێ و پڕ كەڵك و سوود.

ئنجا لە شوێنەوار (أثر)[1]دا هاتوە: (أطلبوا العلم ولو بالصين)، واتە: بەدوای زانیارییدا بگەڕێن، ئەگەر لە وڵاتی (چین) یش بێ، دیارە ئەو كاتە وڵاتی چین كافرستان بووە، بەڵام دیارە زانایانی ئیسلام ئیشیان بەم وتەیە كردوەو، ئاشكرایە مەبەستیش لە زانیاری، زانستە شەرعییەكان نیە، بەڵكو هەموو جۆرە زانست و زانیارییەكی بەكەڵكە وەك: پیشەسازیی، پزیشكیی، فەلسەفە،...هتد. بەڵێ، ئیسلام دەڵێ: بێژینگبەو شتی چاك وەربگرەو، هی خراپیش ڕەت بكەوە، وە ئیسلام دەڵێ: وەك هەنگ (مێش هەنگوینە)بە، شیلەی گوڵان بمژە، مێشەڕەشە مەبەو، بەدوای خاڵی ڕەش و شتی پیس و پۆخڵدا مەگەڕێ! وە ئیسلام دەڵێ: شتە باشەكانی خەڵك وەربگرەو، خۆت لە شتە خراپەكانیان بپارێزە، لێیان بەهرەمەندبە، بەڵام لاساییان مەكەوەو لێیان زەرەرمەند مەبە.

### سێ: باوەڕو متمانە بەخۆبوون:

واتە: ئێمە وەك مسوڵمان، پێویستە باوەڕو متمانەی تەواومان بەخۆمان بێ، كە ئێمە دەست بەتاڵ و ڕووت و ڕەجاڵ نین، وانین كە هیچمان نەبێ، بەڵكو ئێمە خاوەنی زۆر شتین و، گەورەترین دەستمایەمان هەیە، بەڵام تا ئێستا نەمانتوانیوە

---

(١) شوێنەوار (أثر) زاراوەیەكە مەبەست پێی ئەو قسەو بیروبۆچوونانەن، كە لە زانایانی هاوەڵان و شوێنكەوتووان و ئەوانەی دوای وان گێڕاونەوە.

كه وەك پێویست لێی بەهرەمەند بین، وەك پێشینانی خۆمان دەڵێن: ماڵیان پڕبوو له ڕازیانه، منداڵیشیان به زگ ئێشه دەمرد!

ئێمەش خەریكه ئەو پەندەمان بەسەردا بچەسپێ، زۆركەس خۆی ماندوو دەكات له ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، له زانكۆكان بڕوانامەیەك بەدەست دێنێ، كەچی دەبینین ئەو بابەته له گۆشەی ئایەتێكی قورئان، یان گۆشەی فەرموودەیەكی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هەیه! من بۆخۆم ئەوەم به كردەوە هاتۆته ڕێ، له كۆبوونەوەو دانیشتنمدا لەگەڵ سەركردایەتیی سیاسیی و، لەگەڵ ئەهلی فیكرو قەڵەمدا!

بەڵێ، بەداخەوە زۆر له خەڵكی ئێمه بەتایبەت له ئاستی سەركردایەتی سیاسیی و فیكرییماندا، بێئاگان له ئیسلامی خۆیان و، نازانن لەنێو ماڵی خۆیاندا چی هەیه! بۆیەش وا هەست دەكەن كه هیچیان نیەو، بۆ هەموو شتێك پێویستییان به خەڵكی ئەملاولاو غەیری خۆیانه، باشه ئەوە گوتمان بۆ فڕۆكەو سەیارەو كۆمپیوتەرو تەكنۆلۆژیای سەردەم، پێویستیمان به خەڵكه، بەڵام بۆ دەبێ بۆ ئیمان و عەقیدەو ئەخلاق و ئەدەبیش پێویستیمان پێیان بێ؟! یان بۆ دەبێ بۆ فیكرو فەرهەنگ و، بۆ لایەنی كۆمەڵایەتیش، هەر پێویستیمان پێیان بێ؟! له حاڵێكدا كه ئەوان لەو ڕووانەوە، زۆر دەستەپاچەو هەژارو نەدارن!!

ئنجا بێگومان ڕۆژئاواییەكان به دانپێداهێنانی خەڵكێكی بەویژدانی خۆیان، ئەو پێشكەوتنەی ئێستایان، چ له بواری پیشەسازیی و تەكنۆلۆژیاو، چ له بواری ئیداریی و سیاسیی و دەوڵەتدارییدا، بەرهەمی ئەو هەڵسانەوەو هۆشیارییەیه، كه له ئێمەوە فێری بوون و له دەوڵەتی ئیسلامیی یەوەو لەسەر دەستی زانایانی مسوڵمان پێیانگەیشت، بەڵام دواتر بۆخۆشیان شتیان خستەسەرو زیاتر گەشەیان پێداو، دەوڵەمەندیان كردو، گەیاندیانه ئەم قۆناغەی ئێستا[1].

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو دانپێداهێنانەوە، سەرنجی ئەم كتێبانه بدە: ١-(حضارة العرب)ی (گوستاف لوبون)، ٢- (بناء الإنسانية)ی (بیرفلت)، ٣- (النزاع بين العلم والدين)ی (درايبر)، ٤- (تأريخ العلم)ی (جورج سارتون)، ٥- (شمس الله تسطع على الغرب)ی (زيغريد هونكة)، ٦- (أثر العرب والإسلام في النهضة الأوروبية)ی (اليونسكو)، ٧- (تأريخنا المفترى

ئنجا وەك زانایان دەڵێن: زانیاری موڵكی كەس نیە، چونكە زانیاریی بریتیە لەئەزموونی كەڵەكەبووی بەشەر، پشتاوپشت و میللەت بە میللەت، دەستاو دەستی پێدەكرێ، ڕۆژگارێك میسری یەكان خاوەن شارستانیی بوون و، دوایی گوازراوەتەوە بۆ هیند، بۆ ئیغریقییەكان و یۆنانییەكان، پاشان ئەوانەی لەسەر ڕووبارەكانی دیجلەو فوڕات (میزوپۆتامیا) بوون ئەكەدییەكان و بابلییەكان و ئاشوورییەكان و هتد.

ئیدی هەرجارە وڵاتێك و نەتەوەیەك زیاتر گەشەی بە زانست و زانیاری داوە، بەتایبەت لە بواری پیشەسازیی و تەكنۆلۆژیادا، كەواتە: ئەمڕۆ كە زیاتر لە دەستی ڕۆژئاواییەكان دایە، وەنەبێ كات خۆیشی هەروا بوو بێت، بەڵكو ڕۆژگارێك بوو، كە لەدەستی خەڵكی دیكەداو، لە شوێنێكی دیكەدا بوو.

**ئنجا پێویستە ئێمە چەند ڕاستییەك بزانین:**

**ڕاستی یەكەم:** ئیسلام دوایین نوسخەی ڕێڕوونیی و هیدایەتی خوایە بۆ مرۆڤ، وە دوای ئیسلام شەریعەتێكی دیكە لە خواوە نایەت بۆ ئینسان، وە لە دوای (محمد) (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەرێكی دیكە نەهاتووەو ناشیەت:

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ... ﴾ (الأحزاب- ٤٠).

واتە: محمد (صلی الله علیه وسلم) بابی هیچ كام لە پیاوانتان نیە، بەڵكو ڕەوانەكراوی خواو كۆتایی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام).

وە لە دوای قوڕئانیش، خوا كتێبێكی دیكە بۆ ئادەمیزاد نانێرێ، بۆچی؟ چونكە ئەگەر لەپێش قوڕئاندا پارێزگاریی لێكردنی كتێبەكانی خوا بە زانایان سپێررابوو، وەك خوا (عزّ وجلّ) لەبارەی زانایانی جوولەكەوە فەرموویەتی:

﴿ ...يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ... ﴾ (المائدة- ٤٤).

علیه)ی (د. یوسف القرضاوي) ص١٠٩-١٢٣.

واتە: ئەو پێغەمبەرانەی (بۆخوا) ملکەچ بوون و ڕەببانییەکان و زانایەکانیان حکومیان پێ (بەتەوڕات) دەکرد بەسەر جوولەکەکان دا، بەهۆی ئەوەوە کە پارێزگاریی لێکردنی کتێبی خوایان پێ سپێررا بوو وە بەسەریشیەوە چاودێر بوون.

دیارە لەم مەسەلەیەدا جوولەکەو نەسڕانییەکان و ئەوانەی پێش وانیش، یەکسان بوون، بەڵام دوایین کتێبی خوا کە قوڕئانە، خوا بۆخۆی بەڵێنی پاراستنەکەی داوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ (الحجر- ٩).

واتە: ئێمە خۆمان قوڕئانمان ناردۆتە خوارێ و، هەر خۆشمان پارێزەرینی.

کەواتە: قوڕئان دوایین کتێب و دوایین نوسخەی هیدایەتی خوایە، کە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی نێرراوە، پاشان خوا خۆی پارێزگاریی لێکردوەو نەگۆڕراوەو ناشگۆڕرێ.

مەبەستم ئەوەیە ئێمەی مسوڵمان، شوێنکەوتووی کۆتا نوسخەی هیدایەتی خواین، وە هەڵگری دوایین کتێبی خواین، وە پەیڕەوی پێغەمبەری کۆتایین، کە (محمد)ە (صلی الله علیه وسلم)، کە کتێبەکان و پێغەمبەرەکانی خوایان پێ خەتمکراون و، لە هەموو ڕوویێکیشەوە سەلامەت ماون و پارێزراون.

کاتی خۆی لە زیندانی ئەمریکییەکان دا، زۆرجار قسەوباس و موناقەشەمان لەگەڵ ئەمریکیی و بەریتانییەکان دەکرد، لەسەر مەسەلەی ئایین، دیارە ئەوان هەندێکیان جوولەکەو هەندێکیشیان نەصڕانیی بوون، ئنجا پێم دەگوتن: ئێمەی مسوڵمان کێشەمان نیە لەگەڵ پێغەمبەرانی ئێوەدا، نەلەگەڵ مووسا، نەلەگەڵ عیسادا (علیهما الصلاة والسلام) بەڵام ئێوە کێشەتان هەیە لەگەڵ پێغەمبەری ئێمەدا (محمد)(صلی الله علیه وسلم).

دەیانگوت: چۆن؟

دەمگوت: قوڕئانی ئێمە لەسەر زمانی مسوڵمانان دەفەرموێ:

﴿ ...كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ... ﴾ (البقرة - ٢٨٥).

واتە: جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و ئیمانمان بە هەموو پێغەمبەرانی خواو، هەموو کتێبەکانی خوا هەیە، بەڵام ئێوە کێشەتان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (محمد)دا (صلى الله عليه وسلم) هەیەو، کێشەشتان لەگەڵ قورئاندا هەیە.

پاشان پێم دەگوتن: ئەگەر ئێوە مسوڵمان ببن، چەندان قۆناغ دێنە پێش، بەڵام من ئەگەر ببمە جوولەکە، یان نەسرانیی، چەندان قۆناغ بەرەو دوا دەگەڕێمەوە، چونکە ئەو کتێب و بەرنامانەی، کە خوا بۆ مووساو بۆ عیسا (سەلامی خوایان لێبێ)ی ناردوون، بۆ چەند قۆناغێکی پێشتر لە ژیانی مرۆڤ ناردوونی، بەڵام قورئانی ناردوە بۆ قۆناغی کۆتایی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی.

**ڕاستی دووەم:** مسوڵمانان بە پێچەوانەی خەڵکی ڕۆژئاواوە، کاتێك پابەند بوون بە دینەکەیانەوە، بەرەو پێشەوە چوون، کاتێکیش دەستیان لێی شل بوو، بەرەو دوا گەڕانەوە، ئەوە ڕاستییەکە مێژوو لەسەری شاهیدە.

**بۆیەش ئاماژە بەم ڕاستییە مێژووییە دەکەم، چونکە:**

هەندێك خەڵکی عەلمانیی بانگەشە دەکەن و دەڵێن: خەڵکی ڕۆژئاوا کاتێك بەرەو پێشەوە چوون، لە ڕووی سیاسیی و ئیداریی و ڕێکخستنی ژیانیان و لەڕووی تەکنۆلۆژیاوە، کە دەستبەرداری دینەکەیان بوون، منیش وەك لە کتێبی (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)[1]دا باسم کردوە، ئەو بۆچوونە، تا ئەندازەیەك ڕاستە و ئێمەش ئەو ڕاستییە دەیسەلمێنن، بەڵام بێگومان ئەوە بۆیە وابوو، چونکە ئەو دینەی کە خەڵکی ئەورووپاو ڕۆژئاوا ڕەفزیان کرد، ئەو دینە نەبوو، کە خوا بۆ عیسا (علیه السلام) ناردبووی، بەڵکو دینێکی شێوێندراو بوو، دینێك بوو وەك کاڵایەك بەدەست چینی ئەکلیرۆسەوە، بەدەست پاپاو قەشەکانەوە بوو و بازرگانییان پێوە دەکرد، ئەوانە کە ناویان لەخۆیان نابوو (پیاوانی ئایینی، رجال الدين)، وەك ئەوە، کە هەر ئەوان عایدی

---

(١) بڕوانە: چاپی یەکەم ساڵی (٢٠٠٨) نووسینگەی تەفسیر.
هەروەها بڕوانە کتێبی: (سیکۆلاریزم و دیموکراسی لە ئەزمونی کوردستاندا).

دین بن و هەر ئەوان لە بەرانبەر دیندا بەرپرسیار بن، کە بەداخەوە ئێستاکە هەندێك لەمامۆستایانیش (زانایانی ئیسلام) ئەو زاراوەیە بەهەڵە بەکاردێنن، بەڵام ئاشکرایە کە لە ئیسلامدا هەموو پیاوان، پیاوی دینن و، هەموو ئافرەتان ئافرەتانی دینن، ئنجا ئەو دینەی، کە لە نێوەڕۆکی خۆی خاڵی کرابۆوەو، پڕکرابوو لە شتی پڕوپووچ و ئەفسانە، ئەورووپا وازی لەو دینە هێنا، کە ڕێگر بوو لەبەردەم پێشکەوتن و ئازادییداو، لەبەردەم زانست و زانیاریی و داهێنان و دۆزینەوەداو، لەبەردەم مافەکانی جەماوەردا، وە بازیچەیەك بوو بەدەستی دەستەڵاتداران و پاپاو پادشاو دەرەبەگ و خاوەن زەوی و زارەکانی ئەو کاتەی ئەورووپاو ڕۆژئاواوەو، بۆ هێنانەدی مەرامەکانی خۆیان بەکاریان دێنا!

بەڵام مسوڵمانان هەرگیز کێشەیەکی ئاوایان نەبووە، چونکە دینەکەیان بەهۆی پارێزگاریی کردنی خواوە لە کتێبەکەی، دەستکاریی نەکراوەو نەشێوێنراوە، بۆیە ڕۆژئاواییەکان، کە دەستبەرداری ئەو دینە گۆڕاوەی خۆیان بوون، بەرەو پێشەوە چوون، بەڵام ئێمە بە پێچەوانەوەوە: تا دەستمان بە ئیسلامەوە بوو، لە پێشەوە بووین، کاتێك دەستمان لێی شل بوو، هاتینەوە دوا!!، بۆیە ئەگەر بمانەوێ لەڕووی تەکنۆلۆژیاو هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیانەوە، بەرەو پێشەوە بچین، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ دینەکەمان و بەڕاستیی و بەجیددیی دەستی پێوە بگرینەوە.

**ڕاستی سێیەم:** پێشکەوتن و دواکەوتنیش لە ڕووی تەکنۆلۆژیاوە، زۆر پەیوەندیی بەعەقیدەو بیروبڕواوە نیە! بە بەڵگەی ئەوە کە دەبینین وڵاتانێکی وەك (چین و یابان) کە ئێستاش هەر بت پەرستن، یاخود (هیند) کە ئەویش خەریکە بچێتە ڕیزی چین و یابانەوە، لە ڕووی پیشەسازییەوە، تەماشا دەکەین ئەو وڵاتانە، مەگەر چۆن، دەنا هەموویان بت پەرست و مشك و مار پەرست و گاومانگا پەرستن، کەچی بەردەوامیش لە بەرەوپێشچوونی زیاتردان، لە ڕووی تەکنۆلۆژیاوە.

بەڵێ، بەرەوپێشچوون لە ڕووی پیشەسازیی و تەکنۆلۆژیاوە، پەیوەندیی بەکۆمەڵێك هۆکاری دیکەوە هەیە، ئنجا ئەگەر گریمان ئایین و عەقیدەو بیروبڕواش پەیوەندیی هەبێ بەبەرەوپێشچوونەوە، لە ڕووی پیشەسازیی و تەکنۆلۆژیاوە، ئەوە بێگومان ئیسلامی بەرجەستە لە عەقیدەی ڕاست و دروستی ئیسلامییدا، کە عەقیدەی خوا بەیەکگرتن (توحید)ە، وە لە شەریعەتی دادگەرو کاربەجێیانەی ئیسلامییدا، کە

هەمووی فەرمانە بە هەرچی خێروچاکەیەو، ڕێگرییە لە هەرچی زیان و خراپەیەو، هاندانە بۆ بیرکردنەوەو تێوەڕامان و، سەرنجدانی بوونەوەرو، گەڕان بەنێو بوونەوەرداو دۆزینەوەی یاساکانی خوای پەروەردگار، بێگومان ئەو ئایین و عەقیدەیە، هەتا زیاتر لێی حاڵی بین و، لە مەبەستەکانی تێبگەین و، دەستی پێوەبگرین، زیاتر بەرەو پێشەوەمان دەبات، لە تێکڕای بوارەکانی ژیاندا.

## ٢- لە ڕووی سـیاسییەوە:

**کێشەو گرفتە سیاسییەکانیشمان، پێویستە لەسەر بناغەی ئەم بنەمایانە چارەسەر بکەین:**

١- پشت بەخوا بەستن و، لەسەر پێی خۆ وەستان:

دیارە ئەویش بە بەهێزکردنی پێگەی جەماوەریی، وە بەشداریی پێکردنی جەماوەر لە بڕیاری سیاسییدا، وە دڵخۆشکردنیان بەهۆی زیاتر چەسپاندنی دادگەریی کۆمەڵایەتییەوە، وە چارەسەرکردنی ئەو گرفت و کێشانەی ڕۆژانە لەگەڵیاندا دەستەویەخەن، وەك: دابینکردنی پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیان، کە زۆرجار باسیان کراوە، وە بە هیوای ئەم و ئەو نەبوون، بەتایبەت زلهێزەکان و، لەپێش هەموویانەوە ئەمریکا و بەریتانیا، کە ئێمە وەك میللەتی کورد، ئەزموونی زۆر تاڵمان لەگەڵ ڕووسیاو بەریتانیاو ئەمریکادا هەیە، کە هەر کامێکیان بەلای کەمەوە، جارێك کڵاویان لەسەری ئێمە ناوەو، پردی ئێمەیان بە ئاودا داوە!! خوای باڵادەست و تواناش، فەرمان بە بڕواداران دەکات و دەفەرموێ:

﴿ ... وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ (آل عمران- ١٢٢).

واتە: با ئیمانداران بەس پشت بەخوا ببەستن.

هەروەها لە وەسفی شوێنکەوتووانی پێغەمبەر (محمد)دا (صلی الله علیه وسلم) لە ئایەتی کۆتایی سووڕەتی (الفتح) دەفەرموێ:

﴿ ...وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ... ﴾
(الفتح-٢٩).

واتە: وێنەی شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی (محمد) (صلی الله علیه وسلم) وەك درەختێك وایە، کە لەسەر ڕەگ و ڕیشەو قەدی خۆی وەستاوەو دامەزراوە.

ئێمەی گەلی کوردی مسوڵمانیش، دەبێ هەوڵبدەین لەسەر پێی خۆمان بوەستین، بەڵێ، دەزانین ئەوە بەزەحمەتە، بەڵام بە تەئکید لەسەر پێی هەرکەسێك بوەستی، هەرکات پێی لەژێر پێت دەرهێنا، پێش هەموو شوێنێك پشتی سەرت بە زەوی دەکەوێ! پێشینانی خۆشمان زۆر جوانیان گوتوە: (ڕووبار بتبا، نەك بە پردی نامەرددا بڕۆی)، چونکە ڕووبار کاتێك لێی دەپەڕیەوە، ئەگەر بشتبا، ڕەنگە بە پچکێك خۆت بگریەوە، بەڵام کە پردیان لەژێر دەرهێنای، خراپ چاوت بە خۆت دەکەوێ[1]!

**٢- حیزب وەسیلەیەو نەکرێتە ئامانج، وە لە کاتێکدا جڵەوی حوکمڕانیی بەدەستەوە دەگرێ، عەقڵییەتی حیزبی واز لێبێنێ و عەقڵییەتی حوکمڕانێتیی لە خۆیدا بەرجەستە بکات:**

**بەڵێ خوشك و برایانی بەڕێز!**

حیزب بەتەنیا بەرانبەر بە ئەندامەکانی خۆی بەرپرسیارە، دیارە دەبێ وەسیلە بێ بۆ خزمەتی هەموو خەڵك، بەڵام پێش هەموو کەس بەرانبەر بە ئەندامەکانی خۆی بەرپرسیارە، بەڵام وەختێك تۆ جڵەوی حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنی خەڵك و وڵات بەدەستەوە دەگری و، دەبیە حکوومەت، نابێ بە عەقڵییەتی حیزبایەتیی حوکمڕانیی بکەی، بەڵکو دەبێ خۆت بگۆڕی و، بێگومان عەقڵییەتی دەوڵەتدارییش، جیایە لە عەقڵییەتی حیزبایەتیی.

چونکە حکوومەت هی هەموو خەڵکە، بەڵام حیزب تەنیا هی ئەندامەکانی خۆیەتی، پێشینان دەڵێن: حکوومەت بابی میللەتە، دیارە بابیش هی هەموو منداڵەکانیەتی و، نابێ فەرق و جیاوازییان لە نێواندا بکات.

---

(١) ئاشکرایە کە (موداراکردن) لە (پشت پێبەستن) جیایەو، هیچ عاقڵێك نکووڵیی لەوە ناکات، کە پێویستە مودارامان لەگەڵ هەموو کەسدا هەر هەبێ.

٣- خۆ ڕزگاركردن لە گرێ وگۆڵی ڕابردوو:

چونكە بەڕاستی زۆر بە زەقیی هەستی پێدەكرێ، كە هەرچەندە زۆر كۆبوونەوە دەكرێن و، ڕێككەوتننامەی جۆراوجۆر ئیمزا دەكرێن، بەڵام گرێ و گۆڵی ڕابردوو، ئێستاش هەر كاریگەریی هەیە لەسەر ئیش وكارەكان، بۆ وێنە: یەك نەكەوتنەوەی حكوومەت، ئێستاش ئەوە شتێكی ئاشكرایە دوو حكوومەتیی هەر دیارە، لە زۆر لە شتەكانەوە دووانەیی و دوو فلیقانەیی هەر دیارەو بەڵگە نەویستە![1]

ئنجا پێویستە هەموو لایەكمان ئەو حەقیقەتە زۆر چاك بزانین، كە بەهەمووومان نەبێ، ناتوانین ئەم وڵاتە بپارێزین و ئەم قەوارەو ئەزموونەی كوردستان پتەو بكەین و، بە باشی ئیدارەی بكەین، وە هیچ كەسێك نابێ پێی وابێ بەتەنیا دەتوانێ ئەم وڵات و خەڵكە بەڕێوەبەرێ و، خەڵكی دیكەی لێ زیادە، بەڵكو بەڕاستی ئەو كەسەی دەستەڵاتی ئیداریی و سیاسیی بەدەستە، دەبێ زیاتر لە خەڵكی دەرەوەی بازنەی دەستەڵات، خوازیاری ئەوەبێ، كە لێی بێنە پێش و دەستباری لەگەڵ بگرن.

لێرەشدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بكەم كە: ئێمە لەو ماوەیەی پێشوودا وەك چوار لایەنی سیاسیی (كۆمەڵی ئیسلامیی، یەكگرتووی ئیسلامیی، سۆشیالیست، زەحمەتكێشان) یادداشتنامەیەكمان دا بە سەرۆكایەتیی هەرێم، پاشان كردمانە پرۆژەیەك و گەیاندوومانەتە شوێنی خۆی، جا ئایا لە كاتێكدا ئێمە، یان غەیری ئێمە، هەر كەسێك بێ، ڕەخنەیەكی بەجێ دەگرێ، یان تێبینیی و سەرنجێك، یان پێشنیازو چارەسەرێك دەخاتەڕوو، ئەو كەسە كە دەستەڵاتی بەدەستەو، سیاسەت و ئیدارەی وڵات و خەڵكی بەدەستەوەیە، كاتێك كە ئەو تێبینیی و پێشنیاز و ڕەخنەو چارەسەرە وەردەگرێ و لێی بەهرەمەند دەبێ، ئایا پێش هەموو كەس بۆخۆی قازانج ناكات؟! بێگومان با، بۆیە پێویستە ئەوكەسەی كە ئەرك و بەرپرسیارێتییەكی پێ سپێرراوە، ئنجا سەرۆك كۆمارە،

---

(١) ئێستاش (٢٠١٦/٥/١٠ ز) بارودۆخەكە هەروەك ئەوساكەیە!

سەرۆك هەرێمە، سەرۆکی حکوومەتە، سەرۆکی پەرلەمانە، یان وەزیرە، یان هەرچییەکە، مادام ئەرك و ئەمانەتی بەرپرسیارێتیی خراوەتە سەرشان، دەبێ لە خەڵکی دیکە زیاتر پێی خۆش بێ، کاروبارەکەی بەرەوپێش بچێ و باش بێ و، کەم وکووڕییەکانی چارەسەر بکرێن، بۆیە دەبێ زۆر بە پشوو درێژیی و سینەفراوانیی، هەم ڕەخنەی خەڵك و، هەم پێشنیازو تێبینیی و سەرنجی خەڵك، وە ئەو چارەسەرانەی دەیانخەنە ڕوو، وەربگرێ، چونکە پێش هەموو کەس، بەبەرەوپێشچوون و چاکبوونی کارەکەی، خۆی قازانج دەکات و، سوودمەند دەبێ، وە ئەگەر بە باری خراپەش دابێ، پێش هەموو کەس، خۆی زەرەرمەندەو، شتەکە لە دەستی ئەودا دەشکێ.

وە دەبێ ئێمە لەوەش دڵنیا بین، کە هیچ بەدیلیشمان نیە بۆ پێکەوە ژیان و تەبایی و حیساب بۆ یەکدی کردن، جگە لە شەڕو هەراو دووبەرەکێ، وە هەرکاتێك میللەتێك نەیتوانی لەنێو خۆیدا ڕێز لە یەکدی بگرێ و پێکەوە بژی، ئەوە دەبێ بیر لەوە بکەنەوە چۆن دەست بخەنە یەخەی یەکدی و، لە یەکدی دەربکەن و،(١) پێکەوە شەڕی دەوەن بە ئاش بەرپا بکەن، وەك پێشتر زۆر کراوە!

بۆیە بە تایبەت بۆ میللەتێکی وەك ئێمەی کورد، کە لە زۆر شتدا جارێ هەر لە نیوەی ڕێگای گەیشتن بە مەنزڵ داین و، زۆرمان ماوە بگەینە جێ، پێویستە هیچ لایەکمان، جگە لە تەبایی و پێکەوە ژیان و هاوکاریی پێکەوە کردن، یان لانی کەم ڕێز لە یەکدی گرتن و، یەکدی تەحەممول کردن، بیر لەهیچ شتێکی دیکەی پێچەوانە نەکەینەوەو (عەلی کوڕی ئەبووتاڵیب)یش (خوا لێی ڕازی بێ) زۆر جوانی گوتوە: (وَمَن ضاقَ بِهِ العَدلُ، فَالجَوْرُ عليه أضْيَقُ)، واتە: هەرکەسێك بە دادگەریی سەغڵەت و تەنگەتاو بێ، بێگومان بە ستەم و بێدادیی تەنگەتاوتر دەبێ.

---

(١) لەیەکدی دەربکەن: یەکیان ئەوی دیکە بخات!

## ٣- لە ڕووی نەتەوایەتیی و نیشتمانپەروەرییەوە:

پێم وایە ڕەچاوکردنی ئەم سێ خاڵە، کێشەو گرفتی زۆرمان لەو بوارەدا لەکۆڵ دەکاتەوەو بۆ چارەسەر دەکات:

١- زاڵکردنی ئینتیمای نەتەوەیی و نیشتمانیی بەسەر هی حیزبییداو، بەرژەوەندیی گشتی بەسەر هی تاکیی و بنەماڵەیی و حیزبیی دا.

واتە: ئێمە کاتێك بیر دەکەینەوە، کاتێك هەڵس و کەوتێك دەنوێنین، با هەموو میللەتەکەمان بێنینە پێش چاوی خۆمان و، هەموو هەرێمی کوردستانمان لەپێش چاوبێ، نەك تەنیا هەر شارێك، یان حیزبێك، یان دەوروبەری خۆت و بەس، کە بێگومان ئەوە هەتا ئێستا، زەرەری زۆر کوشندەی لێداوین.

٢- دەرککردنی ئەو ڕاستییە: کە هەڵگرتنی دروشمی کوردایەتیی و نیشتمانپەروەریی، ئەگەر نێوەڕۆکێکی باشی نەبێ، تەنیا قاوغ و چوارچێوەیەکی بۆش و، عاتیفەو سۆزێکی ئاسایی یە!

مەبەستم ئەوەیە زۆرجار کوردایەتیی و نیشتمانپەروەرێتیی، دەکرێتە پاساوو بیانووی ئەوە، کە بێدەنگت بکەن، دەگوترێ: هیچ مەکەن، با هیچ کەس ناڕەزایی دەرنەبڕێ، بۆچی؟ چونکە وەزعەکەمان ناسکە و بۆ کوردایەتییمان زەرەری تێدایە! دەی باشە کوردایەتی یەك گیرۆدەبووبێ و دەستەویەخەبێ لەگەڵ کۆمەڵێك گرفت و کێشەداو، چارەسەر نەکرێن، ئەوە چ کوردایەتییەکە؟ بێگومان کوردایەتیی وا کەس دڵی پێخۆش نابێ، کەواتە: بە پێچەوانەوە بۆ ئەوەی خەڵك دڵی بە کوردایەتیی و نیشتمانپەروەریی و وڵاتپارێزیی و خاك و ئاو و ئەزموونی خۆی خۆشبێ، پێویستە زۆر بە خێرایی و جیددیی گرفت و کێشەکان چارەسەر بکرێن!

٣- ئاڕاستەکردنی وزەو توانایەکان، بەرەو هێنانەدی ئامانجە نەتەوەیی و نیشتمانییە باڵایەکان:

واتە: هەموو لایەك، لایەنە سیاسییەکان، نووسەران و ڕۆشنبیران، بیر لەوە بکەینەوە، چۆن ئامانجێك بێنینە دی، کە بۆ هەموان بێ، نەك هەر لە بیری حیزبەکەی خۆیدا بێ، چونکە وەختێك نەتەوەو میللەت قازانج دەکات حیزبیش قازانجی کردوە، ئەدی ئەو حیزبە ئامرازێك نیە بۆ خزمەتی ئەو میللەت و کۆمەڵگایەو، بەشێك نیە لە جەماوەر؟! وەختێك میللەت قازانج دەکات، هەموومان قازانجمان کردوە، وەختێکیش میللەت زەرەر دەکات، ئەگەر حیزب قازانجیشی کردبێ، هەر زەرەی کردوە!

## ٤- لە ڕووی ئابووریی و ژیان و گوزەرانەوە:

پێم وایە بۆ چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانەی لەوبارەوە هەن، پێویستە ئەو خاڵانە ڕەچاو بکرێن:

ا- کارکردنی جیددیی بۆ هەرچی زیاتر چەسپاندنی دادگەریی کۆمەڵایەتیی، چونکە قڕیی و پڕیی و چینایەتیی، بەرهەمە کەی ئاژاوەو بێزاریی و کێشەو ململانێیە:

وە بەڕاستی زۆر لە بێزاریی و نائومێدیی و دڵساردیی خەڵك و، زۆر لەڕەخنەگرتنی خەڵك- کە جاروباریش ئەو ڕەخنەگرتنە لە سنووری خۆی دەچێتە دەر- دەگەڕێتەوە بۆ قەیرانی ئابووریی و، بۆ گیروگرفتی ژیان و گوزەرانی ناهەمواری خەڵك، خۆتان بیستووتانە هی وا هەبووە کە چەند مانگێك مووچەی وەرنەگرتوە و لە ئەنجامدا خۆی کوشتوە، وە هەیە سەری خۆی هەڵدەگرێ بەرەو هەندەران، لەبەر بێکاریی و، هەیە ژنی بۆ نایەت و ژیانی هاوسەرگیریی بۆ پێك نایەت، لەبەر بێجێگاو ڕێگایی و، نازانێ چۆن خۆی بژیەنێ...هتد.[١]

---

(١) هەڵبەتە ئێستا (٢٠١٦/٥/١٠ ز) بارودۆخی ژیان و گوزەران، زۆر خراپتر بووە لەوکاتە.

ئنجا ئێمە ئەگەر هەمووومان نەدار بین، یاخود ئاستی گوزەرانی خەڵك لەهەموو لایەكەوە نزم بێ، ئەوكاتە كەس گلەیی لە كەس ناكات، بەڵام لەكاتێكدا ڕۆژ بۆ ڕۆژ، هەژارو نەدار زۆر دەبن و، تواناو دەرامەتیشیان كەمتر دەبێتەوەو، بە پێچەوانەوەش: بەرپرس و دەوڵەمەندانیش، ڕۆژ بۆ ڕۆژ ماڵ و سامانیان زیاد دەبێ، ئەوە بەڕاستی وەك پێشینان دەڵێن: كەس بەو دووعایە ناڵێ ئامین!

بۆیە بێگومان مەسەلەی چەسپاندنی دادگەریی كۆمەڵایەتیی، دەبێ بەجیددیی بیری لێ بكرێتەوە، لە هەموو ئاستەكاندا، واتە با هیچ كەس لەبەرپرسانی ساماندارو خۆشگوزەران، وا خەیاڵ نەكات كە دەگونجێ بارودۆخێكی نادادگەریی ئاوای كوردستان، بەردەوام بێ! نەخێر ناگونجێ.

تەماشای هەموو مێژوو بكەن، هەرچی گرفت و كێشەی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی و گۆڕانكاریی و شەڕو ئاژاوەیە لەنێو كۆمەڵگاو گەل و نەتەوەكاندا، بەزۆریی پەیوەندیی هەبووە بە هەبوونی ستەم و بێدادیی و، سەرهەڵدانی توێژی كەمینەی چەوسێنەرو زۆرینەی چەوسێنراوەو چینایەتی و قڕیی و پڕییەوە، بۆیەش خوا (جلّ جلاله) لە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سوورەتی (الحدید)دا باس لەوە دەكات، كە هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە نێرراون، تاكو دادگەریی بچەسپێنن - هەندێك كەس وادەزانن كە ئیسلام بەس بۆ ئەوە هاتوە فەرمان بكات بە نوێژكردن و ڕۆژوو گرتن و ڕوو لە خوا كردن، بەڵێ بۆ ئەوە هاتوە، بەڵام وێڕای ئەوە، زۆریش باسی ئابووریی و دادگەریی و، ژیان و گوزەرانی خەڵك و، بەڕێوەبردنی كۆمەڵگاو سیاسەت و حوكمڕانیی دەكات - وەك دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ...﴾.

واتە: پێغەمبەرانمان (علیهم الصلاة والسلام) بە بەڵگەی ئاشكراو ڕۆشنەوە ناردوون و كتێب و تەرازوومان پێدا ناردوون، تاكو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچن.

ئنجا لێرەدا وشەی دادگەریی (قسط): دادگەریی نەتەوەیی، سیاسیی، ئابووریی، كۆمەڵایەتیی، هەمووی دەگرێتەوە.

هەڵبەتە ئێمە بە گشتی لە وتارە سیاسییەکان و ڕاگەیاندنەکانماندا، زۆر باسی دادگەریی و یەکسانیی خەڵك و، باسی خۆشگوزەرانکردن و بەختەوەرکردنی خەڵك و کۆمەڵگا دەکەین، بەڵام بێگومان دەبێ ئەوە بە کردەوەو هەڵوێست و لەژیانی ڕۆژانەماندا، بەرجەستەبێ و ڕەنگ بداتەوە، نەك هەر لە ڕاگەیاندندا باسی بکەین، بەڵێ، ئەگەر ڕاستە قەناعەت و بڕوایەکی هەڵقوڵاوی دڵمانە، دەبێ لە هەنگاوو هەڵوێستەکانماندا ڕەنگ بداتەوە!

وە بەدڵنیاییی، ئەگەر بەرپرسەکان و دەوڵەمەندەکان، لە خۆشگوزەرانیی خۆیان و لەو هەموو پارەو سامانەی، کە لەسەر حیسابی خەڵك دێتە دەستیان، لێی نەگرنەوە، بێگومان هەژارو نەدارو خەڵکی ڕووت و ڕەجاڵ ڕۆژ بۆ ڕۆژ زیاتر ئێش و ئازاری پێدەگات و، نائومێد و بێزارتر دەبێ و، بە تەئکیدیش بێدەنگ نابێ و هەڵوێست وەردەگرێ!

**٢- کارکردن بۆ دروستکردنی ژێرخانی ئابووریی و لەو بوارەدا پەند وەرگرتن لە میللەتانی ئازاو بوێر و دلێر:**

بەڵێ دەبێ هەوڵبدەین ژێرخانی ئابووریی دروست بکەین، چونکە ماقووڵ نیە بۆ هەموو پێداویستییەکانمان وەك بێچووە باڵندە، دەم بکەینەوە داخۆ کەی پاروویێکمان لە زاری داوێن!

ئاخر بەداخەوە، ئێمە ئێستا بۆ شتی زۆر سادەش، پێویستیمان بە وڵاتانی دەرو دراوسێ و دەردەوە هەیە، کە بۆ گەل و نەتەوەیەك کە بیەوێ دەستەڵاتێکی سیاسیی و قەوارەیەکی جێگیر، بۆخۆی دابمەزرێنێ و، بیەوێ بوونی خۆی بسەلمێنێ، نابێ ئەوە حاڵی بێ!

بەڵکو دەبێ هەوڵ بدات، نەك هەر ئەو پێداویستییە سادانە بۆخۆی بەرهەم بێنێ، بگرە هەوڵبدات لە هەموو ڕوویێکەوە، لەسەر پێی خۆی بوەستێ، دیارە ئەمەش دەبێ بە جیددیی بیری لێ بکرێتەوەو، بوودجەی بۆ تەرخان بکرێ و مەجال بە خەڵکی پسپۆڕ بدرێ، ئنجا هەرچەندە ئەو گۆڕانکارییە گرنگەی

لەسەر پێی خۆ وەستان زەحمەت و ڕەنج و ماندووبوونی دەوێ، بەڵام ئەستەم نیەو ڕێی هەزار میلیش بە هەنگاوێك دەست پێدەکات.

**بۆ نموونە:** پێویستە کاتێك کەسێك پێشنیازی دروستکردنی کارگەیەك، یان بنیاتنانی پڕۆژەیەکی بەرهەمهێنان دەکات، خەڵات بکرێ و دەستخۆشیی لێ بکرێ و، کارئاسانیی بۆ بکرێ، نەك پێی بگوترێ: ئەگەر نەکرێم بە شەریك و هاوبەش، ڕێگەت لێ دەگرم!

من کابرا هاتوە بۆ لام گوتوویەتی: من چووم بۆ لای فلان لایەنی بەرپرس و کەسی پەیوەندیدار، پێشنیازم کرد: کە دەمەوێ کارگەیەك دروست بکەم، گوتیان: باشە بەڵام دەبێ بەو ئەندازەیە بۆ نموونە: نیوە، ئێمەش پشك و بەشمان هەبێ و شەریك بین!

گوتی: گوتم: ئاخر هیچی وا بۆ خۆم نامێنێتەوە.

گوتیان: دەکاکە وازی لێبێنەوە هەر دایمەنێ!!

بێگومان ئەوە هەڵوێستێکی زۆر خراپە، لەجیاتی ئەوەی تۆ بێنی سوپاس و دەستخۆشیی ئاڕاستە بکەی و، کاری بۆ ئاسان بکەی، بێی ڕێگای لێ بگری!! دەبێ فەرمووی لێ بکەی، تاکو چیدیکە ئەو شتانە لە ئێران و تورکیاو سووریاو کوێ وکوێ وە نەهێنین و، بەرهەمی خۆماڵیی گەشە پێبدەین و لەسەر پێی خۆمان بوەستین، خۆ حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنی خەڵك و کۆمەڵگا هەر بە قسەو دروشم نابێ، دەبێ بە کردەوە هەنگاو و هەڵوێستی پێویست، بیسەلمێنی و خۆت دروست بکەی، لە ڕووی بڕیاری سیاسیی و، لە ڕووی بنیاتنانی ژێرخانی ئابوورییەوە، کارێك بکەی کە وڵاتەکەت جێگای ئومێد و دڵ پێخۆشبوونی خەڵك بێ، نەك لە کاتێکدا کە سیاسەتت لێ قۆرخ و تاپۆکردوون، بازرگانیی و، کەسابەتیشیان لێ زەوت بکەی!!

٣- برەو پێدان و هاندانی خەڵك، بۆ كاركردن و بەرهەمهێنانی شتی خۆماڵیی، لە هەموو بوارەكانی كشتوكاڵ و پیشەسازیی و ئاژەڵداریی و.. هتددا:

كە بێگومان كوردستان خێروبێری زۆری تێدایەو، دەگونجێ لە زۆر ڕووەوە بێنیاز بین لە خەڵك و كەمتر پێویستیمان بەملاولا بێ.

٤- هاننەدانی خەڵك بۆ زێدەڕۆیی و خۆشگوزەرانیی، كە حەتمەن كەمینەیەك دەیكەنە پیشە لەسەر حیسابی زۆرینەی خەڵك:

واتە خەڵك هان نەدەین بۆ ئەو مەبەستە، من زۆرجار تەماشای ڕێكلام و پڕوپاگەندەو بانگەشەی ڕاگەیاندنەكان دەكەم، دەبینین هەمووی هاندانی خەڵكە بۆ زیاتر سەرقاڵبوون و خەریكبوون بە كەمالیات و خۆشگوزەرانیی و زێدەڕۆیی كردنەوە، كە بێگومان زۆرینەی خەڵك لە مامۆستاو كارمەندو كاسبكارو كرێكارو جوتیارو نەدارو هەژاران، هەر دەبێ زاریان ئاوی پێدابێت و زەقەی چاویان بێت و، خەفەتی پێوە بخۆن و، ئاخی بۆ هەڵكێشن!

وە پێویستە بزانین كە گەورەترین هۆكاری هەرەسهێنان و ڕووخانی هەر دەوڵەت و دەستەڵاتێكی سیاسیی لە مێژووی ڕابردوو و ئێستاشدا، خۆشگوزەرانیی چین و پێڕێكی زێدەڕۆییكەر بووە، لەسەر حیسابی زۆرینەی خەڵك و جەماوەر، وەك خوای زاناو توانا لەوبارەوە دەفەرموێ:

﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ... ﴾ (القصص- ٥٨).

واتە: زۆر وڵات و ئاوەدانییمان فەوتاندن، كە زۆر خۆشگوزەرانییان كرد...، چونكە وەك گوتم: هەمیشە خۆشگوزەرانیی لەلایەن كەمینەیەكەوە، دەبێ لەسەر حیسابی زۆرینەیەكی چەوسێنراوەو بەشخوراو بێ، وەك گوتراوە: لە هەر شوێنێك چیاو شاخی زۆر بەرزت بینی، دۆڵ و شیوی زۆر قووڵیش دەبینی، یان وەك (مصطفى لطفي منفلوطي) دەڵێ: شەوێك بە شوێنێكدا ڕۆیشتم، بینیم كابرایەك ناڵەناڵی بوو، لێی چوومە پێش گوتم: كاكە ئەوە چیتە؟ گوتی: زگم دێشێ لەبرسان، لەو تێپەڕیم، كابرایەكی دیكەش هەر ناڵەناڵی بوو، لەویش چوومە

پێش و گوتم: کاکه تۆ چیته؟ گوتی منیش هەر زگم دێشێ، لەبەرئەوەی زۆرم خواردوە! ئنجا دەڵێ: ئەوەی که زۆری خواردبوو، ئەگەر چەند پارووییەکی لێ گرتبایەوەو بەخشیبای بەوەی که لەبرسان زگی دێشا، بێگومان ئەوکاتە هیچیان زگیان نەدێشا!!

بەڵێ، بەڕاستی هەمیشه تێکچوونی سەنگیی (توازن) لەنێو چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا، وە قڕیی و پڕیی و چینایەتیی، ئاکامی زۆر خراپ و شوومی بەدواوەیە.

٥- چارەسەرکردنی دیاردەی تەنبەڵیی و مووچەخۆریی زۆرو زەوەند:

دیارە ئەمەش نابێ تەنیا بە باسکردن بێ و هیچی دیکە، بەڵکو پێویستە پەلە بکرێ لە چارەسەرکردنی بە کردەوە، ئەویش بەوە، کە خەڵك هانبدرێ و دڵخۆش بکرێ، لەسەر چوونەوە بۆ دێهات و بووژاندنەوەو نوێکردنەوەی باخ و ڕەزو کێڵگە کشتوکاڵییەکان، وە هاندانی ئاژەڵدارەکان لەسەر بەخێوکردنی پەلەوەر و ئاژەڵ، ئەویش بە زۆر شێواز، کە یەکیان ڕەواج پێدانی بەرهەمە خۆماڵییەکانە، لەشوێنان جاری وایە کە نرخی بەرهەمی خۆماڵیی جوتیارەکان کەم بووە لە بازاڕەکاندا، حکوومەت هاتوە زەرەری لەخۆی داوەو نرخی بەرهەمەکانی زیادکردوە، بۆ ئەوەی جوتیارەکان هانبدات لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بن، نەك وەك حاڵی ئێستای جوتیارەکانمان، کەس نەبێ لێیان بکڕێ و، بەسەریاندا بمێنێتەوەو، کابرای جوتیاریش بڵێ، کارەکەم بنەتۆوەکەی خۆی نەکردەوەو، قازانج سەری مایەی خوارد!، وە سەرەنجام دڵساردبێ و لەسەر کارو پیشەی خۆی و، لەئەنجامدا میوە و دانەوێڵەو بەرهەمی وڵاتێکی دیکە بهێنرێ بە نرخێکی گرانتر!!

٦ - پەرەپێدانی گیانی بەزەیی پێکداهاتنەوەو، خێرخوازیی و دەستگیرۆیی یەکدیی:

بەڕاستی زۆر سەیرە کە دەبیستین لە فڵان شوێنە ماڵێك لە کەلاوەیەك دان، خێزانێك لە فڵان جێگا منداڵێکیان لەبەر سەرما ڕەق بۆتەوە، وە هەروەها، بێگومان لەنێو میللەتی مسوڵماندا، هەبوونی ئەو حاڵەتانە زۆر شتێکی خراپە، دیارە هەموو لایەکیشمان بەرپرسیارین، نەك هەر دام ودەزگاکانی حکوومەت،

هەرچەند ئەوان پشکی شێریان لە بەرپرسیارێتیدا بەردەکەوێ.

شایانی باسیشە لەوبارەوە ئایەتی قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر زۆرن، کە ئێمە لێرەدا تەنیا دوو نموونەیان لێ باس دەکەین:

یەکەم: خوای کاربەجێ و بە بەزەیی فەرمووویەتی:

﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ ﴾(الحاقه: ٣٣-٣٤).

واتە: ئەو - کافرە - بڕوای بە خوای مەزن نەبوو، وە هانی خەڵکی نەدەدا لەسەر خواردن دان بە هەژار (بۆیە دووچاری ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە بووە).

کەواتە: بڕوا بە خوا نەهێنان و، یارمەتیی برسی و نەدارو نەدان، لە دوو تای تەرازوویەکدان.

دووەم: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **((ما آمن بي، مَنْ باتَ شبعاناً، وجاره جائع الى جنبه وهو يعلم))** رواه الطّبراني والبزّار.

واتە: هەرکەسێك بە تێریی شەوگار بەسەر بەرێ و، دراوسێیەکەشی لە نیزیکیەوە برسی بێ و پێشی بزانێ، ئیمانی بەمن نەهێناوە!

## ٥- لە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە:

**پێم وایە لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە، دەبێ ئەم چارەسەرانە ڕەچاو بکرێن:**

**١- کارکردن لە هەموو ئاستەکاندا، لەسەر بەرەوپێدانی ڕەوشتی بەرزو جوان و بنبڕکردنی خووخدەی خراپ، ئەویش بەهۆی بەهێزکردنی دینداریی و لایەنی مەعنەویی و، پەیوەستکردنی خەڵکەکەمان بە خواوە، بەتایبەت چینی گەنج:**

براو خوشکانی بەڕێز!

ئێمە هەموومان، چ ئەوانەمان، کە خاوەنی ماڵ و خێزانین و کوڕو کچمان هەن، چ ئەوانەمان کە ماڵمان پێکەوە نەناوە، دەزانین کە لەنێو کۆمەڵگەکەماندا،

چ باسەو، چۆنە گەنج و لاوەکانمان بەرەو ئاقارێکی زۆر خراپ پەلکێش دەکرێن!

دیارە چینی گەنج بە هەردوو ڕەگەزی نێرومێوە، ئومێدی دوارۆژی هەر نەتەوەیەکن، بۆیە پارێزگاریی لێکردنی چینی گەنجمان، ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکمانە، بەڵام بەڕاستی بەو شێوەیەی، کە ئێستا لەنێو کۆمەڵگای ئێمەدا باوە، وە بەو جۆرە کە ئێستا دەبینین، چۆن دام و دەزگاکانی تەوژمی عەلمانیی کاری خراپ و سەلبیی لەسەر گەنجەکانمان دەکەن و، بەرەو دوور لە خوایی و بێبەندوبارییان دەبەن، بێگومان بەو شێوەیە ئاییندەیان گەش و ڕوون نابینرێ و، ڕوو بەرەو خێر نیە.

زۆرجار من بە سەرسوڕمانەوە تەماشای هەندێك بەرنامە و کۆڕو سیمینارو هەندێك دیمانەو دانیشتنی کوڕان و کچان پێکەوە، لەسەر کەناڵەکان دەکەم، دەبینم فێری دڵدارییان دەکەن، فێری خۆشەویستییان دەکەن!

جارێك لە بۆنەیەکدا گوتم: کۆترو کەوو چۆلەکەش دەزانن پێکەوە دڵداریی بکەن! ئایا ئەوە چ جۆرە زانست و هونەرێکی تێدایە، کە فێری کوڕان و کچانی ئێمەی دەکەن؟! بێگومان بەرەو یەکدی پەلکێش بوونی نێرو مێ، شتێکی غەریزەییەو هیچ علیم و صەنعەتێك نیە، یان (ڤالانتاین) دێتەپێش ڕاگەیاندنەکان خۆی پێوە خەریك دەکەن و، هات وهاواری بۆ دەکەن، کەچی زۆر بۆنەی گەورەو یادو بیرەوەریی نەتەوەیی و نیشتمانیی و ئیسلامییمان هەن، هیچ بایەخیان پێنادرێ!

ئاشکراشە کە گەنجەکان ئەزموونیان نیە لە ژیانی کۆمەڵایەتییداو، نازانن لەسۆنگەی بێبەندوبارییەوە، ئاییندەیان بەرەو ئاقارێکی ترسناك دەچێ، بەتایبەت لە قۆناغی تازە پێگەیشتن و هەرزەکارییدا، بۆ وێنە کوڕێك وادەزانێ کە هەموو ژیان و دنیا، هەر ئەوەیە کچێك بناسێ و دڵداریی و خۆشەویستیی لەگەڵدا بکات و، پێکەوە ڕابوێرن، ئنجا بە حەڵاڵیی، یان بە حەرامیی!!

بەڵام ئێمە کە تەمەن و ئەزموونێکمان هەیە، دەزانین، کە ژیان بەس لایەنێك و دووان نیەو، کۆمەڵگا ئاوا بەڕێوە ناچێ و، دەزانین کە کەسایەتیی ئینسان بەس

بریتی نیە لە غەریزەی جینسیی، کەواتە: زۆر زوڵم لە گەنجەکانمان دەکەین، کە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، کارێك دەکەین، بەردەوام غەریزەی جینسییان بورووژێنرێ و پێیەوە سەرگەرم بکرێن.

بۆیە پێویستە هەموو لایەکمان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین، لە بەهێزکردنی لایەنی دینداریی و ڕووحیی و ئەخلاقیی گەنج و لاوەکانمان، بەڵێ، پێویستە هەموو لایەکمان هەست بە بەرپرسیارێتیی بکەین، لە بەرانبەر ئەخلاق و ڕەوشتی کۆمەڵگاکەماندا، بەتایبەت گەنج و لاوەکانمان، هەرچەندە مامۆستایانی مزگەوت پێویستە لەو ڕووەوە گەورەترین ڕۆڵ بگێڕن، وەك سوپاس بۆ خوا، هەندێکیان تاڕاددەیەك لەوبارەوە بە ئەرکی خۆیان هەڵساون و هەر لێرەشەوە دەڵێم: ئەو مامۆستا و وتاربێژانەی کە قسەی باش و حەق دەکەن و، دەست لەسەر برینەکان دادەنێن، کە ڕەخنەی بەجێ دەگرن لە دام ودەزگاکانی حکوومەت، بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بێنەوەو، کەم وکوورییەکانیان چاك بکەن، بەڕاستی دەبێ خەڵات بکرێن و دەستخۆشییان لێ بکرێ!

بیستوومە مەلا (مصطفی)ی بارزانیی خوا لێی خۆشبێ - ئەوەم لە ژمارەیەك لەمامۆستایانی وا بیستوە، کە جێگای متمانەبوون - مامۆستایانێکی خۆشدەویست کە قسەی حەقیان کردبایە، بۆ وێنە: مامۆستایەکی ڕاستبێژ بۆی گێڕامەوە گوتی: جارێك لە دانیشتنێکدا لە کۆڕی (مەلا مصطفی)دابووم، مەلایەك زۆری پێهەڵاگوت و ماستاوی بۆکرد، مەلا مستەفاش زۆر توند لێی تووڕەبوو و پێی گوت: دەبێ زۆر چاکت سزا بدەم، ئنجا گوتی: (مستۆ) چییە ئەوەندەی (تملّق) بۆ دەکەی، منیش وەك تۆ ئینسانێکم؟! بەڵام مامۆستایەك ڕەخنەی لێ گرتباو گوتبای (مەلا مصطفی)! ئەو شتە چۆن وادەبێ؟ یان بۆ واتان کرد..؟! ئەو جۆرە مەلاو مامۆستایانەی لەخۆی نزیك دەخستەوەو خۆشی دەویستن.

هەربۆیەش تەماشا دەکەین (مەلا مصطفی) بۆتە ڕەمزێکی نەتەوەیی، چونکە ڕێزی دینی نەتەوەکەی خۆی دەگرت و، خەڵکی ڕاست و حەق بێژی بەلاوە پەسەند بوو، کەواتە: با ئێمە وا هەست نەکەین، کە کردنەوەی دەرگای مزگەوتەکان و، هاندانی خەڵك بۆ دینداریی و ڕەوشت بەرزیی و لەخوا نزیکخستنەوەیان، هەر

ئەركی زانایانی ئیسلام و خەڵكی ئیسلامیی یە، نەخێر، بەڵكو ئەوە ئەركی هەموو لایەكە، ئاشكراشە كە وەك تاك و كۆمەڵ، وەختێك لە دین و مزگەوت نزیك دەبین، لە هەموو شتێكی خراپ بەدوور دەبین!

گەنج و لاوەكانمان، ئەگەر هۆگری مزگەوت و ماڵەكانی خوابن، مسۆگەر لە مەیخۆریی و تلیاك كێشان و داوێن پیسیی دوور دەبن و، لە عادەت و نەریتی سەیرو خراپ و زیانبەخش دوور دەبن و، بەكەڵكی خۆیان و ماڵ و خێزانیان و بەكەڵكی نەتەوەو وڵات دێن و، كەسایەتییەكی دامەزراوو پوختیان دەبێ و، ڕێك و ڕاست دەبن و، لە ڕۆژی لێقەومانیشدا، هەر ئەوانە بەكەڵك گەل و نیشتمان دێن و، لە فریایان دێن.

ئاخر حاشای گەنجانی ڕەوشت بەرز و خاوەن كەسایەتیی، گەنجێكی دیسكۆی لاساكەرەوەی بێگانەی بەتاڵ و بێنێوەڕۆك و، خاڵی لە زانست و زانیاریی و، لەئەدەب و ڕەوشت و شەهامەت و جوامێریی، بۆ ڕۆژی لێقەومان دەبێ بەكەڵكی چی بێ؟! لە حاڵێكدا كە ئەسیری ئارەزووەكانی خۆیەتی، دەبێ چۆن وڵات و نەتەوەی خۆی پێ بپارێزرێ و ڕزگار بكرێ؟!

**٢- کارکردن لەسەر چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکانی گەنجان:**

دیارە ئەویش بە كردەوە، نەك هەر بێنین سەنتەریان بۆ بكەینەوە، ڕەگەزی نێرو مێ پێكەوە سەرگەرم بكرێن! كە بێگومان ئەوە فێڵ كردنە لە گەنجەكان، بەڵكو بێنین بە جیددیی مشووریان لێ بخۆین و، كێشەو گیروگرفتە ژیانییەكانی كۆمەڵگاكەمان، كە پشوویان پێ سواركردوەو ئەوانیش توێژێكی گەورەو گرنگنی، چارەسەر بكەین و واز لە حیزب حیزبێنەو، شەڕە پەڕۆو گوریس پچڕكێنە بێنین، كە تەواو گەنج و لاوەكانمان تووشی تەنگەنەفەسیی و بێزاریی كردوەو، چیدی بەهۆی تەنیا ڕەچاوكردنی بەرژەوەندیی سیاسیی و حزبییەوە، تۆوی نائومێدیی لە دڵ و مێشكی گەنجەكانماندا نەچێنین!

بەڵكو هەوڵبدەین لە ڕێی دانانی بەرنامەیەكی پەروەردەیی هاوسەنگ و گشتگیرەوە، چینی گەنج و وەچەی تازەمان پێبگەیەنین، بەجۆرێك كە هیچ

لەلایەنەکانی کەسایەتییان پشتگوێ نەخرێن و، هەرکام لە عەقڵ و ڕووح و دڵ و جەستەیان گەشە بکات و پەروەردە ببێ، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە بە یەکێك لە هاوەڵانی بەڕێزی فەرمووە: ((...فإن لجسدك عليك حقاً، وإنَّ لعينيك عليك حقاً، وإنَّ لزوجك عليك حقاً، وإنَّ لزَوْرِكَ عليك حقاً)) رواه البخاري، واتە:... دەجا بزانە کە جەستەت مافی لەسەرتە، وە چاوەکانت مافیان لەسەرتە، وە هاوسەرت مافی لەسەرتە، وە میوانت مافی لەسەرتە.

٣- هاندان و هاوکاریی کردنی گەنجەکان، بۆ پێکەوەنانی خێزان:

مەسەلەی هاوسەرگیریی، پێویستە چاك بیری لێ بکەینەوە، کە بۆچی هاوسەرگیریی لەنێو کۆمەڵگای ئێمەدا بەرەو دواوە دەچێ؟

دەبێ ئەوە چارەسەر بکرێ، دەبێ ئەو کچ و کوڕانەی دەیانەوێ خێزان پێکەوە بنێن، هان بدرێن و هاوکاریی ماددیی بکرێن.

ئەوەش ئەرکی هەر دەستەڵاتێکە، کە دەیەوێ کۆمەڵگا بەڕێوەبەرێ، خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ...﴾ (النور- ٣٢).

واتە: وە ئەو پیاوو ئافرەتانە کە هاوسەریان نیە، هاوسەریان بۆ پەیدا بکەن و، هاوکارییان بن.

٤- چاوپێداگێڕانەوەی بەرنامەی خوێندن و، کەناڵەکانی ڕاگەیاندن کە لە خزمەتی تۆکمەکردنی خێزان و، پتەوکردنی ڕەوشتی بەرزو پەسندو بەرهەمهێنانی کەسایەتیی ڕاست و پاك و هاوسەنگ دابن:

بەڕاستی زۆر جێی تێبینییە، ئێمە هەمیشە دادو فیغانمانە لەدەست ئەوەی کە گەنج و لاوەکانمان لەدەست دەچن، من هیچ ناچێتە عەقڵمەوە، هەر بەرپرسێکی ژیرو دڵسۆز خەفەت، لەوە نەخوات، کە گەنجەکانمان بە ئاقارێکی خراپدا دەڕۆن، کەچی تەماشا دەکەین، ڕۆژ بۆ ڕۆژ ماددەی ئایین لە بەرنامەی خوێندندا کەم

دەکرێتەوە، وە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ تەوژمی عەلمانیی، لە دین دوورخستنەوەی گەنج و لاوان زیاتر پەرە پێدەدات!

دەجا بێگومان ئەو بیرکردنەوەو، هەنگاو و هەڵوێستە، ئاکامەکەی هەر ئەوە دەبێ کە دەیبینین!

بۆیە پێویستە بەرنامەکانی خوێندن و، دام و دەزگاکانمان و ڕاگەیاندنەکانمان، لە خزمەت تۆکمەیی خێزان و پەرەپێدانی ڕەوشتی بەرزو جواندابن، نەك بەپێچەوانەوە وەك ئێستا پیادە دەکرێ.

**وە وەك پێشتریش گوتمان:**

پێویستە پەروەردەمان بۆ گەنجانمان، پەروەردەو پێگەیاندێکی هاوسەنگ و گشتگیر بێ، واتە: پەروەردەی عەقڵ و دڵ و ڕووح و جەستەیان و، هەموو پێکهاتەکانی کەسایەتییان بێ، نەك بە شێوەیەکی لاتەڵ و لاسەنگ، لایەنێك ڕەچاو بکرێ و، لەسەر حیسابی لاسەنەکانی دیکەی گەورە بکرێ و، سەرەنجام کەسایەتیی ئەو گەنج و لاوانەی بەو پەروەردە لاتەڵ و سەقەتە فەراهەم دێ، شێوەیەکی کاریکاتێریانەی هەبێ!

٥- تەماشاکردنی ئافرەتان بە چاوی مرۆڤ و هاووڵاتیی، خاوەن ئەرك و کارو بەرپرسیار بە دین و ژینی خۆیان و کۆمەڵگایەکەیان، نەك وەك ئامرازی ڕابواردن و، شمەك و کەل وپەلی بازرگانیی و، بەکارهێنانی وێنەی جۆراوجۆری مێینایەتی بەرجەستەکەریان، بۆ ڕەواج پێدانی شمەك و کاڵای بازرگانیی!

بەڵێ، پێویستە هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە دڵسۆزو بە پەرۆش دەزانن و هەست بە بەرپرسیارێتیی دەکەن، لە بەرانبەر کۆمەڵگای کوردستاندا، زۆر بە جیددیی قۆڵی هەوڵ و هیممەتی لێ هەڵبکەن، بۆ بەرگرتن لەو ڕێڕەوە سەقەت و خراپەی کە تەوژمی عەلمانیی بۆ ئافرەتانی کوردستانی گرتۆتە پێش، کە بریتییە لەلاساییکردنەوەیەکی کوێرانەی بێمەعناو نامەنتیقیی ئافرەتانی ڕۆژئاوا، کە بێگومان سەرەنجام و ئاکامی ئەو ڕەوتە سەقەتە، جگە لە زیانباریی دنیاو، شەرمەزاریی و پەشێمانیی

دوارۆژ، چیدی نیەو، هەرکەسێکیش دەیەوێ ئەو زیانبارییی و گرفتارییە بە بەرجەستەکراویی ببینێ، با سەرنجێکی کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا بدات، بەتایبەت حاڵ و باڵی ئافرەت و خێزان، کە لە هەندێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، ڕێژەی منداڵی زۆڵ لە هی حەڵاڵ زیاترە!

جا ئایا چ ڕەوای هەقە، کە ئێمەی مسوڵمان پاش ئەوەی بەچاو سەر، بەری تفت و تاڵ و ژاری مار ئاسای ئەو ڕەوتە سەقەت و لارەی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانمان بینی، لە جیاتی پەند لێوەرگرتن و تەمبێ بوون، بێین ئەو ئەزموونە فاشیل و شکستخواردوە، دووپات بکەینەوە، کە ئێستاکە هەندێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، خەریکن لەژێر فشاری زەرەرو زیانی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتییدا، بوێرانە چاو بە زۆر شتی خۆیاندا دەگێڕنەوە، کە یەکیان بریتیە لە جیاکردنەوەی کوڕان و کچان لە قوتابخانەکان و بەجیا خوێندنیان.

لە کۆتایی ئەم باسەشدا ئەو ڕاستییە شەرعییە دووبارە دەکەینەوە، کە پیاوان و ئافرەتان پێکەوە دوو شاباڵی کۆمەڵگای مسوڵمانن و، لە مرۆڤ بوون و، بەندەی خوا بوون و، بەرپرسیار بوونیاندا، وەك یەك و یەکسانن، بەڵام هەر کامێکیان بە سروشت و پێکهاتەی تایبەتیی و خوا پێداوی خۆیەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ﴾ (التوبة -٧١).

واتە: وە پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن...

## ٦- لە ڕووی ڕاگــەیاندنــەوە:

لەم ڕووەشەوە، پێویستە بەم شێوەیە ڕەچاوی چارەسەر بکرێ:

١- پێویستە لە ڕاگەیاندنماندا، جیددیەتی زیاتر ڕەچاو بکرێ و، ئەو ڕاستییە بزانرێ کە کەناڵە ئاسمانییەکانمان، هەتا ئێستا سەرنج (إنطباع)ێکی خراپیان لەسەر میللەتە مسوڵمانەکەمان لە لای خەڵکی دیکە دروست کردووە، وادەزانن کە ئێمەی گەلی کورد، بەس گۆرانیی و هەڵپەڕکێ دەزانین و، هیچ گرفت و کێشەیەکیشمان نیە!!

جاری دیکەش باسم کردوە، لە سەفەرمدا بۆ بەریتانیا لە دانیشتنێکدا یەکێك لە برایانمان کە هاوسەرەکەی خەڵکی ئەوێ بوو، گوتی: مامۆستا! هاوسەرەکەم پێی گوتووم: تۆ دەڵێی لە وڵاتی ئێمە کێشەو گرفتی زۆرمان هەیە، وەك نەبوونی کارەبا و نەوت و سووتەمەنی و ئاو...، بەڵام وا پێناچێ هیچ کێشەیەکتان هەبێ، چونکە کەناڵەکانتان دەبینم، خەڵکی ئێوە لە کوردستان هەمیشە خەریك و سەرگەرمی گۆرانی گوتن و هەڵپەڕکێ و ڕەقص و سەماکردنن، وادیارە زۆر تێروپڕن و، هیچ گرفت و کێشەیەکتان نیە!!

٢- دەبێ ڕاگەیاندن کاریگەریی شایستەی خۆی هەبێ، لەسەر پەرەپێدانی زانست و ئەدەب و، بەرچاو ڕۆشنکردنەوەی خەڵك لە هەموو ڕووێکەوە:

چونکە ئێمە سەرنج دەدەین کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی وڵاتان، بە عەرەب و غەیرە عەرەبەوە، زۆر بەرنامەی باشیان هەیە، شتی زانستیی جۆراوجۆری چاك هەیە، هەڵبەتە لەوانەی خۆشماندا کەم وزۆر، تازە خەریکە هەندێك شتی باش پێشکەش دەکرێ، بەڵام زۆر کەم و دەگمەنە، لەچاو ئەو هەموو پانتاییەی، کە تەرخان کراوە، بۆ گۆرانیی و هەڵپەڕکێ و سەماکردن، کە بێگومان ئەگەر لێی بگیرێتەوە، بخرێتە سەر پانتایی بەرنامە زانستییەکان و شتی فیکریی و ئەدەبیی و، ئەو شتە بەکەڵکانەی کە خەڵکی ئێمە پێویستی پێیانە، زۆر چاکترە بۆ دنیاو دوارۆژمان.

٣- ڕێزگرتن لە ئیسلام و ڕەچاوکردنی بنەماکانی شەریعەت:

ڕاگەیاندنی هەر حیزبێکی سیاسیی و دام و دەزگایەکی حکوومیی و ئەهلیی، ئەگەر بیەوێ وابێتە بەرچاو، کە تەعبیرێکی ڕاستەقینە لە واقیعی کۆمەڵگای کوردستان دەکات و، ڕێز لە هەست و نەستی خەڵکی کوردستان دەگرێ و، خەڵك و میللەت لە دڵسۆزیی و مسوڵمانەتیی و خەڵك و خاك دۆستیی، نەکەوێتە گومانەوە، پێویستە:

**یەك:** بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە، نەبێ باسی ئیسلام نەکات و، خۆی لە هەر تانەوتەشەر و توانج و پللار تێگرتنێکی بپارێزێ.

**دوو:** هەوڵبدات لە بەرنامەکانیدا، بە هۆی زاناو پسپۆڕانی شەریعەتەوە لەخەزێنەی پڕ گەوهەرو مرواریی ئیسلام بەهرەمەند بێ، بەڵام وریابێ لەوبارەوە، پەنا نەباتە بەر کەسانێك، کە نەلەنێو ئەهلی عیلمدا، جێی متمانەن و، نەخەڵکی مسوڵمانیش، قسەو فتوایان لێ وەردەگرێ و، لە سۆنگەی بوونە کادیریانەوە، بۆ حیزبێکی عەلمانیی و فەتوادانی بێسەروبەرەوە، میسداقیەتیی خۆیانیان لەدەست داوە.

## پوختەی چارەسەر

١- تەفاعولكردنی چاكتر و زیاتر، لە هەموو ئاستەكان دا لەگەڵ ئیسلامدا، وە دڵنیابوون لەوەی، كە تەفاعولكردنی زیاتری ئێمە بە پەرلەمان و حكوومەتەوە، بە دام ودەزگاكانی بەڕێوەبردنەوە، بە خەڵكەوەو بە هەموو ئاستەكانی كۆمەڵگاوە، لەگەڵ ئیسلامدا، جگە لە خێروخۆشیی و بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دواڕۆژ، شتێكی دیكەمان بۆ بەرهەم ناهێنێ، لە هەموو بوارەكانی: سیاسیی و ئابووریی و نەتەوەیی و كۆمەڵایەتیی و ئەخلاقیی و....هتددا.

٢- بیركردنەوەو دڵسۆزیی نواندن لەسەر ئاستی میللەت و، چوونەدەر لە قاوغی تاكیی و بنەماڵەیی و حیزبیی.

چونكە بەڕاستیی ئەو تاكگەرایی و بنەماڵە و تیرەچییەتی و حیزبگەرایی یە، زیانی زۆری پێگەیاندووین، كە دیارە لێرەدا مەبەستم تەنیا تاك و بنەماڵەو تیرەو حیزبێك و دووان نیەو، بە گشتی قسە دەكەم.

٣- بەشداریی پێكردنی خەڵك و جەماوەر، بە شێوەیەكی جیددیی و كردەیی، بەهۆی گوێ بۆ گرتنیان و پرس پێكردنیان و شت بۆ ڕوونكردنەوەیان...

بەڵێ، پێویستە بچینە نێو خەڵك و، لە ڕازونیازیان تێبگەین و، بیر لەوە بكەینەوە، چۆن ڕازییان بكەین، نەك لە ڕۆژانی هەڵبژاردندا، بێنین خەڵكی فلان گەڕەك بەلێشاو وەسەر سندووقی تایبەتی گەڕەكێكی دیكە بگێڕین، یان حیزبێك كە نەیاری حیزبی فەرمانڕەوایە، دەنگەكانی لێ بسووتێنین! كە بێگومان ئەو شتانە پێشتر زۆر كراون، واتە مەبەستم گێڕانەوەی (مصداقية)ی زیاترە، بۆ

هەڵبژاردنەکان، بەهۆی ڕێگرتن لە فرت و فێڵ (تزویر)و هێنانەدەری پارێزگاکانی هەرێم لە لیستی ڕەش، کە لەلایەن کۆمیسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکانەوە تێیخراون!

٤- پابەندیی بە یاساوە بەکردەوە، نەك هەر بە قسەو، لەسەری سەرەوە، هەتا خوارێ، بەبێ هەڵاواردنی هیچ یاسایەك، تەنانەت هی هاتوچۆش!!

ئاخر چۆن دەبێ پاسەوانی بەرپرسێکی باڵا، لە پۆلیسێکی هاتوچۆ (مرور) بدەن و، سەروگوێلاکی بشکێنن، کە بەردەوام لە خزمەت دایەو ڕاوەستاوە، بۆ ڕێکخستنی کاروباری هاتوچۆ؟!

جا ئەگەر بمانەوێ یاسا سەروەر بێ و ڕێز لە یاسا بگیرێ، دەبێ لە یاسای هاتوچۆوە ڕێزی لێ بگرین، هەتا هەر یاسایەکی دیکە، وەنابێ هیچ کەسیش لەسەرووی یاساوە بێ و، نابێ هیچ کەسیش مافی (ڤیتۆ)ی هەبێ، لە بەرانبەر هیچ یاسایەکدا، ئەوکاتە یاسا لای خەڵك و جەماوەر خۆشەویست دەبێ و، ڕێزی دەگیرێ، کە بێگومان جێدار (بدیل)ی یاساش بریتیە لە بێسەرەوبەرەیی...

٥- هەبوونی پاداشت و سزا بۆ چاکەکاران و خراپەکاران، ئنجا هەرکەسێك بن و هەر ئاستێکیان هەبێ و، سەر بە هەر حیزب و لایەنێك بن...

من جارێك لە کۆبوونەوەیەك داو، لە کاتی قسەو باس لەسەر گەندەڵیی و، چۆنیەتی چارەسەرکردنیدا، پێشنیازێکم کردو گوتم: پێشنیازەکەم زۆر زەحمەت نیە، (٣) کەسی بەرپرس کە پەرێزیان پاك بووەو، کاروخزمەتی چاکیان پێشکەش کردوە، بێنن لەگەڵ (٣) کەسی گەندەڵ و ناپاك، کە بە ملیۆنان دۆلار، دزییان کردوە، ئەو چاکانە پاداشت بدەنەوەو خەڵات بکەن و، خراپ و گەندەڵەکانیش سزا بدەن و دووریان بخەنەوە، بەڵام لە ڕاگەیاندنیشدا باسی بکەن و ئاشکرای بکەن، بەو هۆیەوە سەدان کەس واز لە گەندەڵیی دێنن و، سەدانی دیکەش هەوڵی پاکتر بوون و چاکتربوون دەدەن!!

بەڵام ئێمە هەر باسی بکەین و، هیچ هەنگاوی عەمەلیی نەنێین، بێگومان مەحاڵە بە قسەی ڕووت، چارەسەری کێشەو گرفتەکان بکەین!

٦- هاندان و هاوکارییکردنی کەسانی زانا و شارەزاو پسپۆڕ و دڵسۆز، لە هەموو بوارەکان داو، بوار بۆ ڕەخساندنیان، بۆ خزمەتکردنی خەڵك و وڵاتیان، بەبێ ڕەچاوکردنی پاشخانی فیکریی و ئینتیمای حیزبیی و سیاسییان و، دڵنیابوون لەو ڕاستییە: کە کەسانی خاوەن کەسایەتی و مەعدەن پاك و دڵسۆزو سەنگین، هیچ کات ئامادەی ماستاوکردن و سینگ ڕەپێش کردن نین، بۆیە هەرکات ئەوەیان لەسەر کرایە مەرج، ئامادەنابن، نزیك ببنەوەو سەرەنجام دەستەڵاتی عەودالّی (تملّق) و چەپڵە لێدان، دەورەی بە کەسانێکی چەپڵە لێدەرو نەشارەزاو بوودەڵە دەتەنرێ!

**لە کۆتاییشدا دەڵێم:** خۆزگە نیوەی ئەو گرنگیی پێدان و بایەخ پێدانە ماددیی و مەعنەوییەی گۆرانیی بێژو کلیپ چیی و...هتدەی، کە لە لایەن ئاستە بەرزە حیزبیی و حکوومییەکانەوە، پێشوازیی دەکرێن و، مووچە و خەڵات و بەراتی موفت و حاتەمییانەیان بەسەردا دەبەشرێتەوە، بەڵێ، خۆزگە نیوەی ئەو بایەخپێدانە، بۆ زانا و شارەزایان و پسپۆڕانی دڵسۆزو بوێر ببوایە!! هیواداریشم هیچ کەس بە هەڵە وا لەم قسانەم حاڵی نەبێ، کە من دژی هونەرم، هونەرێك کە لە خزمەت گەشەپێدانی عەقڵ و عاتیفەو سۆزی بەرزو پاك و ئەدەب و ئاکاری پەسندو چاك دایە، بەڵام من بەوە قەڵسم، کە خەڵکی زاناو پسپۆڕو شارەزا، هەر لەبەرئەوەی هونەری ماستاوکردن (فن التملّق) نازانن، پشت گوێ بخرێن و، لەسەر حیسابی کەسانی شارەزاو پسپۆڕانی عاقڵمەند، زێدەڕۆیی بکرێ لە هێنانە پێش و خەڵاتکردنی هونەرمەندان داو، چ هونەرمەندانێکیش!!

بەڕێــزان!

هەرچەندە وەختم زۆر لێگرتن، بەڵام ئەوە بۆچوون و تێبینیی و سەرنج و پێشنیازی من بوو، لەسەر گرفت و کێشەکان و، چۆنیەتی چارەسەریان، لەپێناو ئایندەو داهاتوویەکی گەش و ڕووندا، بۆ خەڵکی مسوڵمانی هەرێمی کوردستان.

لە خوای بەخشندە داواکارم، یارمەتییمان بدات، ئەو دەستکەوتانەی هاتوونەتە دەستمان، پارێزگارییان لێ بکەین و، ئەو گرفت و کێشانەی هەشمانن بە هەوڵ و کۆششی هەموو لایەك، چارەسەریان بکەین.

وصلى الله على محمد وآله وصحبه أجمعين
والحمدلله ربّ العالمين

٤/ ٣ / ٢٠٠٨
هەولێر / هۆڵی ڕۆشنبیریی

# پوختەی هەندێك
# لە پرسیار و وەڵامەکان

پ١ - بۆچی پارت و لایەنە سیاسییەکانی کوردستان، هەمیشە بیر لە بەرژەوەندیی خۆیان دەکەنەوە، بە ئیسلامییەکانیشەوە، ئەوەتا ئەندام پەرلەمانێك یان وەزیرێك، سەر بە هەر لایەنێکە، تەنیا بە بەرژەوەندیی و کارو مووچەی خۆیەوە سەرقاڵەو، هیچیان بۆ چین و توێژەکانی خەڵك نەکردوەو ناکەن؟

و- هەر حیزبێکی سیاسیی کە بیەوێ بەڕاستی خزمەتی گەل و نەتەوەی خۆی بکات، دەبێ زیاتر بیر لە بەرژەوەندیی گشتی بکاتەوە، بەڵام دیارە نابێ بەرژەوەندیی خۆیشی لەیادبچێ، وەك بەشێك لەو میللەت و خەڵکە، واتە: ئەگەر ئاگای لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیشی بێت، خراپی نەکردوە، چونکە حیزبیش هەر لە خەڵك پێکهاتوەو، خەڵکێکی زۆریش لە چوارچێوەی حیزبدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە حزبگەرایی نەکات، وەك هەردوو حیزبی دەستەڵاتدارو، هەر حیزبێکی دیکەی وەك وانیش.

پ٢- مامۆستا باسی ئەوەی کرد کە دەبێ گەنج و لاوان هاوسەری ژیان هەڵبژێرن و، هاوسەرگیریی ئەنجام بدەن، کە کاریگەریی لەسەر کۆمەڵگا دەبێ بە ئیجابیی، بەڵام گەنجانمان چۆن ئەوە بکەن، کاتێك هاوکاریی نەکرێن لە لایەن بەرپرسان و حکوومەتەوە؟

و- دەربارەی خێزان پێکهێنان و هاوسەرگیرییش، منیش پشتگیریی قسەکانی ئەو برایە دەکەم و، پێشتریش لە دەقی وتارەکەمدا، منیش هەروام گوت، بەڵام وادیارە ئەو بەڕێزە باش سەرنجی قسەکانمی نەداوە! بەڵێ، دەبێ حکوومەت

ئاسانکاریی بکات بۆ پرۆسەی هاوسەرگیریی و، بە پارەو دابینکردنی پێداویستییەکان، هاوکاریی گەنجەکان بکات و، بە گوێرەی توانا جێ و ڕێی گونجاویان بۆ دابین بکات، یان لەوبارەوە دەستباریان لەگەڵ بگرێ.

بابایەکی وەك (عبدالکریم قاسم) پەنجا ساڵ لەمەوبەر بیری کردۆتەوە لە پرۆژەی (١٠٠٠) هەزار خانوویی، بۆ خەڵکی هەژارو نەدارو بێنەوای بەغداو دەوروبەری، دەبووایە ئێمەش بەگوێرەی ئیمکانیەتی خۆمان بیر لەو جۆرە پرۆژانە بکەینەوە، بەڵام گرنگ هەر دروستکردنی خانووەکان نیە، بەڵکو لەوە گرنگتر ئەوەیە، کە بە دادگەرانەو دوور لە حیزبگەرایی، بدرێنە خەڵکی نەدارو شایستە، هەر کێیەك بن!

پ٣- دەوڵەتانی بەناو ئیسلامیی دەوروبەرو دراوسێ، مادام ئیسلامیین بۆچی هەڕەشەمان لێ دەکەن و، هەوڵی تێکدانی ئەم ئەزموونەمان دەدەن...؟

و- دەربارەی هەڕەشەی دەوڵەتان، دیارە ئێمە وەك سەرجەم پارت و لایەنە سیاسییەکان ڕوونکردنەوەمانداو، هەمووومان هاوهەڵوێست بووین، تەنانەت لەلێدوانێکدا بۆ ڕادیۆی (BBC) بەشی عەرەبی لە وەڵامی پرسیارێکدا کە ئایا ئێوە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی ) کە حیزبی (دادو گەشەپێدان)یش حکوومەتێکن، پاشخانێکی ئیسلامییان هەیە، ئەگەر بێنە نێو خاکی هەرێمی کوردستان و خەتە سوورەکان ببەزێنن، هەڵوێستتان چی دەبێ؟

گوتم: هەڵوێستمان ئەوەیە، کە بەرگریی دەکەین لە هەرێمی کوردستان و ئاسایشی میللەتەکەمان.

گوتی: تورکیا دەوڵەتێکی ئیسلامیی یەو، ئێوەش ئیسلامیین؟

گوتم: جارێ ئەوان دەوڵەتێکی ئیسلامیی تەواو عەیار نین و، خۆشیان وایان نەگوتوە، پاشان لە ئیسلامیشدا، ئەگەر خەڵکێکی مسوڵمانیش زوڵمت لێ بکات و، دەستدرێژیت بکاتە سەر، شەرع نەك هەر ڕێگات دەدات، بەڵکو لەسەرت فەرز دەکات، بەرگریی لەخۆت بکەی، خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ ... لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ (البقرة- ٢٧٩).

واتە: نە ستەم بکەن، نە با ستەمتان لێ بکرێ.

وە دەفەرموێ: ﴿ ...فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ... ﴾ (البقرة- ١٩٤).

واتە: هەرکەسێك دەستدرێژیی کردە سەرتان، وەك خۆی دەستدرێژیی بکەنەوە سەرو بەرپەرچی بدەنەوە، کەواتە: ئەگەر ئیسلام حوکمی پێبکرێ، نابێ خاك و نیشتمانی، هیچ گەل و نەتەوەیەك داگیربکرێ.

پ٤- لە باسی دیموکڕاسیدا، مامۆستا گوتی: لە غیابی ئیسلامدا، ناوی دێنم ئەگەرنا من ئەو وشەیە بەکارناهێنم، دیارە ئەم زاراوەیە لە ئیسلامدا نەهاتوە (حوکمی گەل بۆ گەل) بەڵام ئەو چەمکە زیاتر مەبەست پێی ئازادیی بیـروڕاو بەرگریی لە مافی گەلانە بە تەواویی، ئەوەتا لە ئیسلامدا لەناو مسوڵماناندا هەموو ئاییـنـێك، وەك جوولەکەو مەسیحیی و یەزیدیی و زۆری دیکە، هەر هەبوون و مافیان پارێزراوە، کەوابوو بۆچی نابێ وشەی دیموکڕاسی لە ئیسلامدا بەکاربهێنرێ؟

و- ئەگەر جێدار (بديل)ی دیموکڕاسی، دیکتاتۆریی بێ، ئەوە دیموکڕاسی لەچاو ئەو بە حەوت ئاوان شۆڕراوەتەوە، بەڵام ئێمە کە دەڵێین: کاتێك حوکمی ئیسلامیی هەیە، پێویست ناکات باسی دیموکڕاسی بکەین، لەبەرئەوە نیە، کە ئیسلام و دیموکڕاسی لە هەموو ڕووێکەوە دژی یەکن، بەڵکو لەبەرئەوەیە، کە هەرچی لایەنی چاك هەیە لە دیموکڕاسیدا، لە ئیسلامیشدا هەیە، زۆر بەشێوەی چاکتر، وە لایەنێکی[1] خراپیش کە لە دیموکڕاسیدا هەیە لە ئیسلامدا نیە، واتە: ئیسلام چاکەکانی دیموکڕاسی هەموویانی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە، وە لە کەم وکووڕیی و خراپەکانیشی دوورە!

---

(١) کە بریتیە لە دیاریکردنی حەڵاڵ و حەرام، دانە دەست خەڵك و نەگەڕانەوە بۆ شەریعەتی خوا.

ئنجا ئەوە كە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، كەمایەتییە دینییەكانی وەك: جوولەكە، نەسرانیی، یەزیدیی و غەیری ئەوانیش توانیویانە بژین و، مافیان پێشێل نەكراوە، ئێمەش دەڵێین: وایەو مێژووی ئێستاو ڕابردووی مسوڵمانان شاهیدە، دیارە ئەوەش پاڵپشتی قسەكانمە، چونكە ئەوكاتە باسی دیموكڕاسی لەگۆڕێدا نەبووەو، ئەوكاتە ئەورووپا لە تاریكایی سەدەكانی نێوەڕاستدا دەژیاو، تەنیا دەوڵەتی تاكیی و پادشایەتیی (الإستبداد والملكية) هەبوو، كەواتە: ئەوەی كە ئێستا بانگەشەی بۆ دەكرێ، بەناوی دیموكڕاسییەوە، لە ئازادیی تاكەكان و، ڕێزگرتن لە ئیرادەی جەماوەرو مافی چارەنووسی گەلان و...هتد، لە ئیسلامدا هەبووە، پێش دروستبوونی سیستەمە دیموكڕاسییەكان، هەربۆیەش هەموو خاوەن دینەكان، توانیویانە لەنێو دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین، نەك هەر بژین، بەڵكو قەوارەی سیاسیی و ئیداریی خۆیشیان هەبێ، لەسەر بناغەی پێكەوە ژیان و تەبایی لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا.

پ ٥- بۆ چارەسەری كێشەو گرفتەكان پێویستیمان بە گۆڕانكاریی هەیە، دیارە گۆڕانكارییش لە دوو ڕوانگەوەیە:

یەكەم: گۆڕانێكی شۆڕشگێڕانە، لە هەموو دام ودەزگاكانی حكوومەتدا، بە هەموو بەشەكانییەوە.

دووەم: پەرەسەندنێكی پلە بە پلە، ئنجا ئایا تۆ وەك كەسێكی ڕووناكبیرو ڕۆشنبیری ئیسلام، لەگەڵ كام لەو دووجۆرە گۆڕانكارییە دای؟

و- وەك لە پێناسەی بەڕێزتدا دەردەكەوێ ئەو گۆڕانكارییە، ئەگەر گۆڕانكارییەكی شۆڕشگێڕانە (ثوري) واتە (ڕادیكاڵیی) بێ، دیارە ئەو كاتە لەگەڵ گۆڕانكاریی پلەپلەییدا تێكدەگیرێن، ئەگەرنا گۆڕانكاریی سەرتاپاگیریی و گشتگیر، كە هەموو لایەنەكان بگرێتەوە، لەگەڵ گۆڕانكاریی پلەپلەیی (تدّرج)دا ناكۆكی نیە، چونكە تۆ پلەپلەو هێدی هێدی گۆڕانكاریی دەكەی، بەڵام گۆڕانكارییەكە هەموو ئەو لایەنانە دەگرێتەوە، كە پێویستە چاكسازیی یان تێدا بكرێ و گشتگیربێ.

کەواتە: بەو جۆرە تێگەیشتنە ئەو دووانە دژی یەك نین، بەڵام ئەگەر مەبەست گۆڕانکارییەکی شۆڕشگێڕانەبێ، کە یەکجاریی سیستمەکە هەڵگێڕێتەوەو وەزعێکی دیکە بنیات بنرێتەوە، ئەوە ئیسلام لەگەڵ ئەو جۆرە گۆڕانکارییەدا نیە، چونکە کاتی خۆی، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات هەموو شتێکی کۆمەڵگاکەی خۆی لانەبرد، بەڵکو ئەو شتانەی لابردن کە هەڵەو خراپ بوون و بەکەڵك نەدەهاتن، ئەگەرنا شتە باشەکانی لە شوێنی خۆی نەجووڵاند، کە بێگومان هەر ئەوەشە چەمك و مانای فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)، کەواتە هەندێك شت کە لە پێش ئێمەدا هەبووەو، ئێستا هەیەو شتی چاك و بەکەڵکە، دەبێ هەوڵبدەین ئەو شتانە زیاتر بچەسپێنین، بەڵام هەوڵبدەین هەنگاو بە هەنگاو شتە خراپ و زیانبەخشەکان لابەرین و، خۆمان و کۆمەڵگاکەمانیان لێ بژار بکەین و، شتی باشیان لە شوێن دابنێین.

پ ٦- کوردستان تا ئەندازەیەك حوکمێکی ئیسلامیی تێدایە، ئنجا ئایا حوکمەکەی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چۆن دەبینرێ؟

و- لە ڕاستیدا کوردستان مسوڵمان نشینەو خەڵکی مسوڵمانی تێدایە، بەڵام سیستمی حوکمڕانییەکەی زیاتر سیکۆلاریستانەیە، هەرچەندە کەم و زۆر خەڵکی ئیسلامییش هەیە، لە پەرلەمان و لە وەزارەتەکان و لە دام ودەزگا ئیدارییەکاندا، دیارە ئێمەش وەك ئیسلامییەکان هەوڵدەدەین وەزعەکە هەمووی بەرەو ئیسلام بێنین، چونکە حوکمی ئیسلام نەبێ، هیچی دیکە شایستە نیە سایەو سێبەری میللەتێکی مسوڵمان بێ، وە بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دوارۆژی میللەتەکەشمان، هەر لە حوکمێکی ئیسلامییدا دەبینین.

پ ٧- بۆچی ڕێگای پۆشینی حیجاب لە ئافرەتان دەگیرێ و، پەرچیان بۆ دروست دەکرێ لە زانکۆو پەیمانگاو دام و دەزگاکاندا و، بەشداریی ناکرێن لە چالاکییەکاندا؟

و- دەربارەی خۆداپۆشینی ئافرەتان و بالاپۆشیی، کە هەوڵدەدرێ ڕێگای لێ بگیرێ و پەرچی بخرێتە ڕێ، بەڕاستی شتێکی زۆر بێجێیە، کە ڕێگا

لەئافرەتی مسوڵمان بگیرێ، وەك خوا فەرمانی پێکردوە خۆی داپۆشێ، بەڵام ڕێگای پێبدرێ، هەرچەندە خوا قەدەغەی کردوە، خۆی ڕووت بکاتەوە!!

وە من پێشم وایە ئەو ڕەفتارە، زیاتر شتێکی شەخسیی و میزاجییەو دەگەڕێتەوە بۆ میزاجی ئەو کەسەی، کە بەڕێوەبەرو بەرپرسی ئەو فەرمانگەو دام ودەزگاو شوێنەیە، بەڵام بێگومان دەبێ چارەسەر بکرێ و ئەوەندەی لە تواناماندا بێ قبووڵی ناکەین و، بەرپرسانی باڵاش پێویستە لێپرسینەوە لەگەڵ ئەوجۆرە کەساندا بکەن و گوێیان ڕابکێشن.

دەربارەی بەشداری پێنەکران و ڕێگا لێگرتنی ئافرەتانی پۆشتەش لە چالاکییە جۆراو جۆرەکاندا، بەڕاستی ئەوەش شتێکی زۆر بێجێیەو ئەوەش وەك گوتم، هەر میزاجی هەندێك لەبەرپرس و بەڕێوەبەرەکانە نەك ڕێنمایی و بڕیاری پەرلەمان و ئەنجوومەنی وەزیران، مەگەر تەعلیمات و ئاڕاستە (توجیە)ی پەنهان و نایاسایی هەبێ و، ئێمە پێی نەزانین! کە بێگومان ئەوەش نیشانەی دواکەوتوویی یە، لەکاتێکدا کە سەدو یەك کێشەو گرفت و مەترسیی لەبەردەم ئەزموونی هەرێمی کوردستان دایە، بێین مشت ومڕی لابەلاو بێجێ دروست بکەین!

پ ٨- بۆچی کەمتر ئافرەتان لە شاشەی تەلەفزیۆنی ئیسلامییەکان دەردەکەون، وە ئایا حوکمە شەرعییەکەی چۆنە؟

و- دەرکەوتنی ئافرەتی پۆشتە لە شاشەی تەلەفزیۆندا، هیچ ناشەرعییەکی تێدا نیە، چونکە وەك بە درێژیی لە کتێبی (ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەتدا) باسم کردوە، دەم وچاوو هەردوو دەستی ئافرەت، تا مەچەکی عەوڕەت نین، لەسەر ڕای زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوان و فەرموودە ناسان و شەرعزانان.

خوا پشتیوان بێ کتێبێکیشم بەم نزیکانە بڵاودەبێتەوە، سەرەتا لە ڕۆژنامەی (کۆمەڵ)دا بڵاودەکرێتەوە، بەناوی: (چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) باسی تێکڕای ئەو مەسەلە هونەرییانەی تێدایە، کە مشت و مڕی زۆریان لەسەرە، ئەم مەسەلەیەش جوان تیشکی خراوەتەسەر.[1]

---

(١) دواتر بوو بەکتێب و تا ئێستا (٢٠١٦/٦/١٠ ز)، دووجار چاپ کراوەو بۆ فارسیش وەرگێڕدراوە.

پ ٩- لە ئەنجامی ئەوەدا کە ژیانی ئێمەی گەنج و، پێش ئێمەش ترش وتاڵ و پڕ گرفت بووەو، هەمیشە ئێمە چەوسێنراوینەوە، متمانەمان بەخۆمان نەماوە، ئەوەش دەردێکە گەنجی عەلمانیی و ئیسلامیی گرتۆتەوە، ئنجا ئایا چ پڕۆژەیەکتان هەیە کە بە ئامانجێکی دیارەوە لەبەردەست بێ، بۆ ئەوەی متمانە بەخۆبوون بگەڕێتەوە...؟

و- ڕاستە چەوساندنەوە، نەخۆشیی و کەم وکووڕیی زۆر لەنێو میللەتاندا پەیدا دەکات، مێژوونووسان دەڵێن: زۆربەی عەیب و کەم وکووڕییەکانی (بني إسرائيل) ئەنجامی زوڵم و ستەمی فیرعەون بوو، دیارە کەم وکووڕیی میللەتی ئێمەش زۆربەی دەرەنجامی زوڵم و چەوسێنرانەوە بووە، لەلایەن ڕژێمی بەعسی ڕەگەزپەرستەوەو، پێویستە زۆر بە جیددیی خۆمان لەو کەم وکووڕییانە بژار بکەین، مادام ئێمە دەرباز بووین و لە چەوسێنرانەوە ڕزگارمان بووە.

**دەربارەی پڕۆژەشمان بۆ چاکسازیی هەر بە کورتیی دەڵێم:**

کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی پلەپلە دروست دەبێ و، کت وپڕ پەیدا نابێ، ئێمەش وەنەبێ هەتا ئیمکانیەتی ئەوەمان بۆ نەڕەخسێ، کە قەوارەیەکی ئیسلامیی بنیات بنێین، دەستەوئەژنۆ دابنیشین و لە کەم وکووڕیی و ناتەواوییەکانی کۆمەڵگاو ئەزموونە سیاسییەکەمانەوە ڕابمێنین و، هیچ نەکەین!
بەڵکو بە پێی توانا چیمان لەدەستبێ، لە چاکسازیی هەر دەیکەین.

دەربارەی تێڕوانینیشمان بۆ دەوڵەت و کیانی ئیسلامیی، لێکۆڵینەوەیەکم لەبەردەستە و[1]، لە نامیکەی: (سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك) و لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)یشدا چەند شتێکم لەبارەی دەوڵەتداریی و حوکمڕانییەوە، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە خستۆتەڕوو.

---

(١) دواتر سەرەتا بەدەوری (٥٠-٦٠) ئاڵقە لە (پەیام) بەناوی (بەرنامەی سەرنج) و پاشان لە دوو توێی مەوسووعەیەکی چوار بەرگیی دا، بەناونیشانی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) چاپ و بڵاو کرایەوە.

# ســەرەتا

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدلله، والصلاة والسلام على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه.

**بەڕێــزان!**

بێگومان ئەرکی سەرشانی هەر تاکێکی نێو هەر کۆمەڵگایەکە، کە بەپێی تواناو بۆلوانی، خەم لە کۆمەڵگایەکەی بخوات و، بە تەنگییەوە بێ و هەوڵبدات خراپەو زیانەکانی لێ دوور بخاتەوەو، چاکەو قازانجەکانی بۆ دابین بکات.

منیش وەك تاکێکی کۆمەڵگایەکەم - کۆمەڵگای کوردستان - بە پێویستم زانی، کە لەبارەی واقیعی ئێستای خۆمانەوە بدوێم، وەك بەشێك لە ئەرکی سەرشانم بەرانبەر بە کۆمەڵگایەکەم، ئاشکراشە کە من وەك کوردێکی مسوڵمان، هەوڵدەدەم بە ئەندازەی تێگەیشتنم لە قورئان و سوننەت، لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتدا بدوێم و، هەر لە بەراییشەوە دەڵێم:

قەناعەتی سەداسەدم ئەوەیە، کە ئێمە وەك خەڵکی مسوڵمانی کوردستان، ئەگەر بێت و شەریعەتی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا، بکەینە سەرچاوەی بیروبۆچوونەکانمان و، بناغەی هەڵس وکەوتەکانمان، هەرچی زیاتر بەسەر گیروگرفت و قەیرانەکانماندا زاڵ دەبین و، ڕیزەکانمان زیاترو چاکتر پێکەوە

جۆش دەدرێن و، برایەتییمان لەسەر بنچینەی ئیمان و ئیسلام و، تەباییمان لەسەر بنچینەی ڕێز لە یەکدی نان و پێکەوە ژیان، پتەوترو باشتر دەبێ.

شایانی باسیشە کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دوانی ئێمە، مانای ئەوەنیە، کە لەگۆشەنیکایەکی تایبەتیی و حیزبییەوە دەدوێین، چونکە ئیسلام بە تەنیا موڵکی هیچ کەس و کۆمەڵێك نیەو، بۆ کەس قۆرخ نەکراوە، بەڵکو هی هەموانە و، ناسنامەی گشتی کۆمەڵگاو نەتەوەکەشمانە.

## پێشدەستیی

ئنجا وەك پێشدەستییەك، بەچاکی دەزانم ئاماژەیەکی خێرا بە چەند مەسەلەیەك بکەم، وەك ڕێخۆشکردن بۆ چوونە نێو بابەتی بنەڕەتیی کۆڕەکەمانەوە:

یەك: ئەم واقیعەی ئێستای هەرێمی کوردستان، وەك لای هەموان ڕوونە، زادەو بەرهەمی خەبات و تێکۆشان و قوربانیدانێکی درێژخایەنی میللەتەکەمانە بەهەموو پێکهاتەکانییەوە، دیارە هەیە زیاتر دەوری بینیوەو هەیە کەمترو، هەیە قوربانی زیاتری داوەو هەیە کەمترو، هەشبووە بە پێچەوانەوە: لەجیاتی چاکە، ڕۆڵی خراپیشی گێڕاوە، بەڵام هەرچۆن بێ خەڵك و میللەتەکەمان بەگشتی دەوری بینیوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان لە هێنانەدی ئەم واقیعەدا بەشداربووەو پشکی هەبووە، واتە: ئەم واقیعە بەرهەمی ڕەنج و خەبات و میحنەت و ئاوارەیی و دەربەدەریی و کوێرەوەریی و قوربانیدانی میللەتەکەمانەو، هیچ کەس خێری پێ نەکردووین، بۆیە نابێ بێجگە لە خوا (سبحانه وتعالى) پاشان خۆمان، لەهیچ کەسێکی دیکەی بزانین و، قبووڵی منەتکردنی هیچ کەس بکەین.

دوو: ئێمە هەموو لایەکمان لە بەرانبەر خەڵك و کۆمەڵگاکەماندا بەرپرسیارین و، بەرانبەر بەم واقیع و هەل ومەرجەی میللەتەکەمان، کە هەمووومان گلەییمان لێی هەیەو لێی نارازین، پێویستە بە جیددیی لەبیری پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی دابین، هەمووومان پێکەوەو وێکڕا بە وردو درشت و نێرو مێ وە، بەبێ هەڵاواردن، چونکە خوای کاربەجێ لە وەسف و پێناسەی مسوڵمانانـدا فەرموویەتی:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ... ﴾ (التوبة-٧١).

واتە: وە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان دۆست و پشتیوان و هاوکاریی هەندێکیانن. پاشان لە درێژەی ئایەتەکەدا بوارەکانی هاوکاریی یەکدی تێداکردنی بڕوادارانی ڕوون کردۆتەوە، کە بریتین لە: فەرمان بە چاکەکردن و، ڕێ لە خراپە گرتن و، نوێژ بەرپاکردن و، زەکات دان و، فەرمانبەریی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم):

﴿...يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ...﴾ (التوبة-٧١).

ئاشکراشە کە ئەو (معروف)انەی کە نێرو مێی بڕواداران لەسەریان پێویست کراوە، کە فەرمانیان پێبکەن و، هەوڵی چەسپاندنیان بدەن، هەموو جۆرەکانی چاکە دەگرنەوە، چ لە بواری فیکرو عەقیدەدا بن، چ لە بواری خواپەرستییەکاندا، چ لە بواری حوکم و سیاسەتدا، چ لە بواری ئابووریی و ژیان و گوزەراندا، چ لە بواری خێزان و کۆمەڵایەتییدا، چ لە بواری ڕەوشت و ئەدەبدا، چ لە بواری هونەردا...هتد، هەروەها بە هەمان شێوەش ئەو خراپە (مُنكر)انەی کە تێکڕای بڕواداران بە وردو درشتەوە، لەسەریان پێویست کراوە، کە لە دژیان بوەستن و، هەوڵی ڕیشەکێشکردنیان بدەن، دیسان هەموو جۆرو شێوەکانی خراپە دەگرنەوە، لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیان و گوزەرانی تاك و خێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەتدا، چونکە بە پێی ڕێزمانی عەرەبی هەردوو وشەی (المعروف)و (المنكر) کە ئەلیف و لامی (تعريف)یان لەسەرە، جینسی چاکەو خراپە دەگرنەوە.

هەروەها پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە یەکێك لە فەرمایشتە شیرینەکانیدا کە (بخاري) و(مسلم) گێڕاویانەتەوە لەوبارەوە فەرموویەتی: ((**كلّكم راعٍ وكلُّكم مسؤل عن رَعيَّتِهِ..**)).

واتە: هەمووتان چاودێرن و هەمووشتان بەرپرسیارن بەرانبەر بە کۆمەڵگاکەتان...

بەڵێ بەڕێـــزان!

لە ئیسلامدا تەنیا ئەو کەسەی کە لە لووتکەی هەرەمی دەستەڵات دایەو دەوروبەرەکەی، بەرانبەر بەخەڵك و کۆمەڵگاکەیان، بەرپرسیار نین، بەڵکو ئەرکی چاودێریی کردنی کۆمەڵگاو، خەم لێخواردنی و بەتەنگەوە بوونی، بەرپرسیارێتییەکی گشتی و هەمەلایەنەیەو، هیچ کەسی لێ هەڵنەوێرراوە، بەڵام بێگومان هەموو ئەرك و بەرپرسیارێتییەك لەقەدەر تواناو بۆلوانەو، بەوپێیەش، بەرپرسانی وردو درشت، هەرکەسە بەگوێرەی بەرپرسیارێتییەکەی ئەرکیان لەهی هەموولایەك گەورەتر و گرانترە.

سێ: ئێمە لە واقیعی ئێستاماندا، کۆمەڵێك لایەنی باش و ئیجابییمان هەن و، کۆمەڵێك دەستکەوتمان هەن، کە نابێ نادیدەیان بگرین و، بەکەمیان سەیر بکەین، بەڵکو پێویستە وەك خۆیان بیانبینین و وەك نیعمەت و بەهرەیەکی خوای بەخشندەو دادگەر تەماشایان بکەین، بەڵام بێگومان لەپاڵ دەستەکەوتەکانماندا، کۆمەڵێك گرفت و کێشەو قەیرانیشمان هەن، کە پێویستە واقیع بینانە، ئەوانیش وەك چەند عەیب و کەم وکوورییەك ببینین و ئازایانە دانیان پێدا بێنین.

ئنجا ئازایەتیی و لێزانیی ئێمە لەوەدایە، کە دەستکەوتەکانمان بپارێزین و نەهێڵین لەدەستمان بچن، وە بەردەوامیش لە هەوڵی چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکانمان و، نەهێشتنی عەیب و کەم وکوورییەکانمان دابین.

دیارە عاقڵمەندیش کەسێکە، کە بە هۆی چاکەو دەستکەوتەکانییەوە لەخۆی بایی نابێ و، بەهۆی دیتنی لایەنە چاکەکانییەوە، لایەنە خراپەکانی و کەم و کوورییەکانی نادیدە ناگرێ و، نالێ هیچ عەیبم نیەو، دنیا شامی شەریفە، هەروەها لەولاشەوە: بە هۆی کەم وکووڕیی و گرفت و کێشەکانییەوە، دووچاری نائومێدیی نابێ، بەڵکو لە یەك کاتدا واقیع بینانە، خێروشەڕی خۆی دەبینێ و بەردەوام هەوڵیش دەدات پارێزگاریی لە چاکەو دەستکەوتەکانی بکات و لێشیان زیاد بکات، وە چارەسەری گرفت و کێشەو کەم وکوورییەکانی بکات و خۆییان لێ بژار بکات، خراپیش نیە ئاماژە بە هەندێك لە لایەنە ئیجابییەکانی ئەم واقیعەمان بکەین، وەك چەند دەستکەوتێکی سەرەکیی:

## چەند لایەنێكی ئیجابیی و دەستكەوتێكی سەرەكیی

١- ئێمه ماوەی حەڤدە (١٧) ساڵێكه[١]، تاڕاددەیەك خاوەنی ئیدارەو ئیرادەی خۆمانین و دەتوانین بڵێین: سایەو سێبەرێكی باشمان بۆ ڕەخساوە، كه بەڕاستی ئەوە دەستكەوت و نیعمەتێكی گەورەو بەرچاوە، بەتایبەتیش كه وێڕای كەم و كووڕیی و كرچ وكاڵیی زۆر، قەوارەكەمان هەركام لە دامەزراوەكانی: پەرلەمان و، حكوومەت و، دەستەڵاتی دادوەریی، كه سێكوچكەی هەرەگرنگی هەر دەوڵەت و كیانێكی سیاسیین، تێدا بنیات نراون، بەو هیوایەی كه كەم و كووڕیی و كرچ و كاڵییەكانیان، چارەسەر بكرێن و، بەتەواویی بكەونه سەر ڕەوڕەوەی خۆیان و، نێوەڕۆكیشیان وەك (ناو)یانی لێ بێ!

٢- دەستكەوتێكی دیكەی ئەم هەل ومەرج و واقیعەمان، ئەوەیه كه ئێستاكه هەموو لایەكمان هاتووینه سەر قەناعەتی پێكەوە ژیان و یەكدی تەحەممولكردن و هاوكاریی پێكەوەكردن، كه دیاره ئەمەش دەستكەوتێكی گەورەو گرنگەو، زادەو بەرهەمی ئەزموونگەلی زۆر تفت و تاڵ و بە ئێش و ژانه، هیچ كەسیش ناتوانێ نكووڵیی لەوە بكات، كه هەمیشه میللەتان بەهۆی تەبایی و دەستبار بۆ یەكدی گرتن و هاوكاریی پێكەوەكردنەوە، بەسەر كۆسپ و لەمپەرەكانیاندا زاڵ دەبن و، ئامانجەكانیان وەدی دێنن و، له سۆنگەی گوریس پچڕكێنەو كێشمەكێش و دووبەرەكیی و پەرتەوازەییشیانەوە دەستكەوتەكانیان لەدەست دەچێ و، ئاماجەكانیان دەدۆڕێنن و، وێڕای هەوڵ و خەبات و تەقەللا و قوربانیدانی زۆریش، دەستی میللەتیان له بنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەردێنن!

---

(١) ئەمه لەكاتی بەستنی ئەم كۆڕەدا، له: (٢٠٠٨/٤/١٧ ز)دا.

٣- ئەگەر ژیان و گوزەرانی خەڵكی خۆمان بەگشتی لەگەڵ هی ساڵانی پێش ڕاپەڕین (إنتفاضة)دا بەراورد بكەین، دەتوانین بڵێین: گەشەكردن و بەرەوپێشچوونێكی باش لە ژیانی ماددیی خەڵكی كوردستاندا، هاتۆتە ئاراوە، لە ڕووی خانووبەرەو جێگاو ڕێگاو بەرگ و پۆشاك و خواردن و خواردنەوەو كەل وپەلی نێوماڵ و خۆشگوزەرانییەوە، بە كورتی: ئێستاكە ئاستی ژیان و گوزەرانی خەڵكی كوردستان بەگشتی، بەرزترو باشترە لە ڕابردوو.

مەبەستیشم لە ئاماژەكردن بەوچەند لایەنە ئیجابیی و دەستكەوتە سەرەكییەی واقیعی ئێستامان، ئەوەیە كە بەهۆی بینینی كەم وكووڕیی و لایەنە سەلبییەكانمانەوە تووشی نائومێدیی و دڵساردیی نەبین، بەڵام بێگومان نابێ بەوەندەی كە وەدەستمان هێناوە، قەناعەت بكەین، بەڵكو دەبێ هەوڵبدەین، زیاتر بەرەو پێش بچین و، گەشە بكەین، چونكە لە بوونەوەردا، هیچ شتێك وەستاو نیەو، هەركەسێك لەبەرەوپێشچوون و گەشەكردندا نەبێ، ئەوە بێگومان لەپاشەكشە و پووكانەوە دایە.

## ئامانجی وتارەكەم:

**دەتوانم بڵێم: ئامانج و مەبەستی سەرەكیی وتارەكەم، دوو شتە:**

**یەكەم:** پارێزگاریی لێكردنی دەستكەوتەكانمان و ڕێگریی لە لەدەستدانیان، بەهۆی زیادبوون و بەردەوام بوونی كەم وكووڕیی و ناتەواوییەكانەوە.

**دووەم:** دەستەبەركردن و هێنانەدی ئەو ما فە ڕەوایانەمان، كە بەبێ وان واقیعەكەمان هەر بە ناتەواویی و كرچ وكاڵیی دەمێنێتەوەو، بگرە ناشتوانێ درێژە بە بوونی خۆی بدات.

شایانی باسیشە، كە من لێرەدا بەگشتی قسە لەبارەی واقیعی هەرێمی كوردستانەوە دەكەم و، مەبەستم لە توێژو كۆمەڵ و لایەنێكی تایبەت نیە، وەك، حكوومەت و پەرلەمان، یان لایەنە سیاسییەكان، یان توێژی گەنج و تازە پێگەیشتوو، یان خەڵكی ڕۆشنبیرو شارەزا...هتد، بەڵكو ڕووی قسەم لەهەموو لایەكمانە، بە حكوومەت و میللەتەوەو، بە هەموو توێژو پێكهاتەكانی

کۆمەڵگەکامانەوە، بەبێ هەڵاواردن و جیاکردنەوەی هیچ کەس و لایەنێك، چونکە: شتێکی مشت و مڕ هەڵنەگرە، کە هەم پارێزگاریی لێکردنی دەستکەوتەکانمان و، گەشەپێدانی لایەنە ئیجابییەکانی واقیعەکەمان و، هەم دابینکردنی ماف و پێداویستییە ڕەوایەکانمان، پەکیان لەسەر هەوڵ و هیممەتی هەموولایەکمان کەوتوە، بە هاوکاریی هەموولایەك نەبێ، ئەو دوو ئامانجە گەورەو گرنگەمان پێ وەدی نایەن.

ئێستاش پاش ئەم ڕێخۆشکردنە، کاتی ئەوە هاتوە ڕاستەوخۆ بچینە سەر ئەسڵی مەبەست:

ئێمە لە چوار بواردا بەمەبەستی: ڕووەو وەرچەرخانێکی بنەڕەتیی بردنی واقیعی هەرێمی کوردستان، قسە لەسەر (ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر بەواقیعی ئێستامان) دەکەین، کە ئەمانەن:

١- لە بواری تاکیی دا.
٢- لە بواری خێزانیی دا.
٣- لە بواری کۆمەڵایەتی دا.
٤- لە بواری سیاسەت و دەوڵەتداریی دا.

بۆیەش ئەم چوار بوارەم ئاوا ڕیز کردوون، چونکە هیچ کۆمەڵگایەك بەبێ تاك (فرد)ی چاك پەروەردەکراو، ناتوانێ خێزانێکی تۆکمەو دامەزراوی هەبێ و، هەرگیزیش ناگونجێ کۆمەڵگایەکی توندوتۆڵ و ڕێك وپێکمان هەبێ، هەتا خشتەکانی ئەو کۆمەڵگایە - کە خێزانەکانن - پوخت و ڕێك نەبن و، ناشگونجێ بەبێ کۆمەڵگایەکی پێکەوە تەباو گونجاوو هاوکارو بۆ یەك بەبەزەیی و مشوورخۆر، قەوارەیەکی سیاسیی مەحکەم و گەشەسەندوومان هەبێ.

کەواتە:

ئەو چوار لایەن و بوارە، وەك چوار دیواری ژوورێك پێکەوە پەیوەستن و، هیچ کامیان بەبێ ئەوانی دیکە نایکرێ و، هەر چواریان بۆ یەکدی پێویستن و پێکەوە

گرێدراوو پەیوەستن، بەڵام لە ڕووی ڕیزبەندیی کاتیی (الترتیب الزّمني)یەوە، دیارە کە تاك پێش خێزان (أُسرة)و، خێزان پێش کۆمەڵگا (مجتمع) و، کۆمەڵگاش پێش دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی دەکەوێ، چونکە تاکەکانن، کە خێزان پێك دێنن و، خێزانەکانیشن کە کۆمەڵگا دەڕەخسێنن و، قەوارەی سیاسییش هەڵقوڵاوی هەناوی کۆمەڵگایە.

بۆیەش گوتمان: ئەو چوارە هەر چواریان پێکەوە پەیوەست و، بۆ یەکدی پێویستن، چونکە:

وەك چۆن خێزانی پاك و پوخت، لە تاکە ڕێك و پێك و باش پەروەردەکراوەکان پێك دێ، بە هەمان شێوەش خێزانی ڕێك و پێك و تۆکمە، چاکترین مەڵبەندی تێدا پەروەردەبوون و پێگەیشتنی تاکە، هەروەها وەك چۆن بەبێ هەبوونی خێزانە پوخت و ڕێك و دامەزراوەکان، هاتنەدی کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم و بەختەوەر مەحاڵە، بە هەمان شێوەش کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم و پوخت و خاوێن، گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێ لە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی تاك و خێزانی ڕێك و پێکدا، دیسان وەك چۆن قەوارەیەکی سیاسیی مەحکەم و گەشەسەندوو، هەڵقوڵاوی هەناوی کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم و پوخت و خاوێنە، لە بەرامبەریشدا قەوارەو دەوڵەتێکی ڕێك و پێك و دادگەرو بە بەزەیی و لێزانیش، چاکترین دەور دەبینێ لە پێگەیاندن و بنیاتنانی، هەر کام لە تاکی چاك و پاك و، خێزانی پوخت و خاوێن و، کۆمەڵگای تۆکمەو تەواودا.

ئێستاش با بچینە سەر بواری یەکەم:

## بواری یەکەم: ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە کۆمەڵگاکەمان، لە بواری تاکیی دا

وەك پێشتر باسمان کرد، بەبێ تاکی پاك و چاك، ناگونجێ هیچ کام لەخێزانی پوخت و خاوێن و، کۆمەڵگای تۆکمەو تەواوو، قەوارەی سیاسیی مەحکەم و دامەزراومان هەبێ، ئنجا ئایا پێویستە چی بکەین و چۆن بکەین، تاکو تاك (فَرد)ی چاك و پاك و ڕێك و پێکمان بۆ بەرهەم بێ؟!

جارێ پێویستە هەموولایەکمان لەسەر ئەوە یەکدەنگ و یەکڕابین، کە ئێمەی خەڵکی کوردستان، کەم و زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵگاکەماندا خەلەل و کەم و کووڕیی هەیە، دیارە ئەوەش کەم و زۆر کەوتوەو، لە هەموو شوێنێکیش چاك و خراپ هەیە، بەڵام مەبەستم لەم قسەیە ئەوەیە، کە پێمان وانەبێ ئەوە تەنیا کۆمەڵگاو حکوومەت و دامەزراوەکاننی، کە جێگای ڕەخنەو گلەیین و کەم و کووڕییان هەیە، بەڵکو ئێمەش وەك تاکەکانی ئەو کۆمەڵگاو واقیعە کەم و زۆر عەیب و ناتەواویی و کەم وکووڕییمان هەن و، ئەوە کەم و کووڕیی و هەڵەوپەڵەکانی تاکەکانن، لە خێزان و کۆمەڵگاو پەرلەمان و حکوومەت و دامەزراوەکانیشیدا ڕەنگ دەدەنەوە.

کەواتە: ئەگەر بمانەوێ گۆڕانکاریی و وەرچەرخان لەم واقیعەی خۆماندا بکەین و، پرۆسەی پاکسازیی و بژارکردن و، چاکسازیی و باشکردنی، تێدا ئەنجام بدەین، پێویستە لە تاکەکانەوە دەست پێبکەین و، چاککردنی تاك و باش پەروەردەکردنی بکەینە هەنگاوی یەکەممان و، دووپاتیشی دەکەینەوە، کە هەر کام لە تاك و خێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەت، پێکەوە پەیوەستن و بۆ

یەكدی پێویستن، بەڵام هەنگاوی یەكەمی گۆڕانكاریی و وەرچەرخان، بریتیە لەچاككردن و گۆڕینی تاكەكان، چونكە هەر تاكە، كە خێزان دروست دەكات و، كۆمەڵگاش هەر لە كۆی تاكەكان پێكدێ، چ لە حاڵەتی خێزانیی دابن، چ سەڵت، وە هەر تاكیشە، كە پەرلەمان و دەستەڵاتی دادوەریی و حكوومەت و دامەزراوەكانیشی پێكدێنێ، خوای كاربەجێش لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿... إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ...﴾ (الرعد- ١١).

واتە: بێگومان خوا واقیعی هیچ كۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، هەتا ئەوان واقیعی خودی خۆیان نەگۆڕن...

جا من پێم وایە، بۆ گۆڕین و چاككردنی تاكەكانی كۆمەڵگاكەمان، فەراهەم هێنانی كەش و هەوایەكی وا، كە تاكەكانی كۆمەڵگاكەمان بەشێوەیەكی باش تێدا پەروەردە بكرێن، پێویستە ئەم چوار بنەما سەرەكییە ڕەچاو بكەین:

## یەكـەم: هێنانـەدی كەش و هەوای ئـازاد:

بناغەی پەروەردەبوونێكی ساغ و سەلیمی تاكەكان، بریتیە لە كەش و هەوایەكی ئازاد، كە مرۆڤ تێیدا سەربەست بێت، وە بێگومان بارودۆخی پڕ فشارو سەغڵەتكەر، چەندان جۆرە عەیب و كەم وكووڕیی لە مرۆڤەكاندا پەیدا دەكات و، وەك ڕووەكی بن تاتە بەردی زل و بێبەش لە تیشكی خۆر، خواروخێچ و زەردو لاواز دەردەچن.

ئنجا ئەگەر بمانەوێ ئەو ڕاستییەی بەشێوەیەكی تیۆریی (نظري) گوتم، بەرجەستەكراویی ببینین، دەتوانین لە مێژووی كۆندا بەنی ئیسرائیل و، لە هی نوێدا میللەتی خۆمان، بە نموونە بێنینەوە:

### نموونەی یەكـەم:

بەنی ئیسرائیل كە وەچەی (یعقوب)ن (علیه السلام)، - چونكە (إسرائیل) نازناوی یەعقووب بووە - پاش ڕزگاربوونی (یوسف) (علیه السلام) لە زیندان و

کۆچکردنی باب و برایەکانی بۆ میسر و، نیشتەجێ بوونیان تێیداو، زاووزێ کردن و زۆربوونیان، فیرعەونەکانی میسر بەتایبەت (خوفو) دەکەونە ئازاردان و ئەشکەنجەدانیان و، چەوساندنەوەو سۆغرەو بێگار پێکردنیان، وە سەربڕینی کوڕەکانیان و، هێشتنەوەی کچەکانیان، وەك خوای زاناو پەنهانبین لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾ (القصص-٤).

واتە: بێگومان فیرعەون ستەم و سەرکەشیی کرد لە زەوی - میسر- دا و خەڵکەکەی بەش بەش کرد، کۆمەڵێکیانی دەچەوساندەوە کوڕەکانیانی سەردەبڕی و، ئافرەتەکانیانی دەهێشتەوە، بەڕاستی ئەو لە خراپەکاران بوو.

ئیدی وەچەی ئیسرائیل لەو واقیعە تاڵ و دژوارەدا دەمێننەوەو، بە ناچاریی مل بۆ ستەم و زۆری فیرعەونەکانی میسر ڕادەکێشن، هەتا خوای کاربەجێ و دادگەر، ئیرادەی دێتە سەر ئەوە، کە ئەو میللەتە ستەمدیدەیە لە چەنگی فیرعەون (خوفو) قوتار بکات، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ... ﴾ (القصص: ٥-٦).

واتە: وە دەمانەوێ، کە چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەین، کە لە زەویدا چەوسێنراونەوە، وە بیانکەینە پێشەواو حوکمڕان و بیانگێڕین بە میراتگر-ی فیرعەون -، وە دەستەڵاتیان پێبدەین لە زەویدا...

ئنجا خوای بەرزو مەزن (مووسا)و (هاڕوون)ی برای (علیهما السلام) دەکاتە هۆکارو ئامرازی جێبەجێبوونی ئەو ویست (إرادة)ەی خۆی و، پاش ئەوەی پەیامی پێغەمبەرایەتییان پێدەبەخشێ، فەرمانیان پێدەکات، کە بچن گەلە چەوساوەکەیان لەژێر نیرو چەپۆکی فیرعەون دەربێنن:

﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ... ﴾ (طه- ٤٧).

واتە: بچنە لای - فیرعەون - و بڵێن: ئێمە ڕەوانەکراوی پەروەرگارتین بۆ لات، بەنی ئیسرائیلمان لەگەڵ ڕەوانە بکەو مەیان چەوسێنەوە..

ئیدی سەرەنجام مووساو هاروونی برای (سەلامی خوایان لێ بێ) ئامانجەکەیان دەپێکن و، گەلە چەوساوەکەیان دەرباز دەکەن و، خوای تۆڵەستێن فیرعەون و داروودەستەو سوپایەکەیشی، کە ڕاوەدووی بەنی ئیسرائیل دەنێن، لە دەریای سووردا دەخنکێنێ، وەك خوا (سبحانە وتعالی) لە سیاقی بیرخستنەوەی جوولەکەکاندا، کە چ چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ پێشینانیاندا کردوە، فەرموویەتی:

﴿ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴾
(البقرة - ٥٠).

واتە: وەیاد بکەنەوە کاتێك دەریامان بۆتان لەتکرد، ئیدی ئێوەمان ڕزگارکردو دراوودەستەی فیرعەونیشمان خنکاند، لە حاڵێکدا کە ئێوە تێیانەوە ڕامابوون.

بەڵێ، گەلی (بنی إسرائیل) کە خوای باڵادەست بەهۆی مووساو هاروونی برایەوە (سەلامی خوایان لێ بێ)، لەژێر نیری فیرعەونی دەرێنان و ڕزگاری کردن، لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ماوەیەکی زۆر ژیانێکی زەلیلانەو چەوسێنراوانەیان گوزەراندبوو و، لە نیعمەتی ئازادیی و سەربەستیی بێبەش بوو بوون، کۆمەڵێك دەردو نەخۆش دەروونیی و کۆمەڵایەتییان تێدا پەیدا بوو بوون، کە بەهۆیانەوە سەرئێشەی زۆریان بۆ مووساو هاروونی برای پەیداکرد، کە دەتوانین وەك نموونە ئاماژە بە هەندێکیان بکەین:

### ١- لاساکردنەوەی کوێرانەی ئەم و ئەو:

وەك لەو هەڵوێستەیاندا بەرجەستەیە، کە جارێ تازە لە دەریای سوور پەڕیبوونەوەو، دەربازیان بوو بوو، کەچی دوای ئەوەی بەلای کۆمەڵێکی بتپەرستدا ڕەتبوون، داوایان لە مووسا کرد، کە پەرستراوێکیان بۆ دابنێ، وەك چۆن ئەوان هەیانە:

﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞ... ﴾ (الأعراف- ١٣٨).

واتە: وە بەنی ئیسڕائیلمان لە دەریایی سوور - پەڕاندەوە، جا بەلای کۆمەڵێکدا ڕەتبوون، کە خۆیانیان لەسەر پەرستنی چەند بتێکیان حەپس کردبوو، (بەنی ئیسڕائیل) گوتیان: ئەی مووسا! پەرستراوێکمان بۆ پەیدا بکە، وەك چۆن ئەوانە پەرستراویان هەن..

شایانی باسیشە، کە هۆکاری سەرەکیی هاندەر بۆ لاساکردنەوەی خەڵکی، بریتیە لە متمانەو باوەڕ بەخۆنەبوون و، خەڵك لەلا زۆر بوون و خۆ لەلا بچووك بوون.

٢- بیانوو گرتن و منگەمنگ کردنی بەردەوام:

ئەمیش عادەت و خووێکی دیکەی خراپی بەنی ئیسڕائیل بوو، بۆ نموونە: پاش ئەوەی خوا لە چەنگی فیرعەون دەربازی کردن و چوونە دەشت و بیابانی (سینا)وە، دووجۆرە خۆراکی زۆر چاك و نایابی لەو بیابانە قاقڕو دێمەکارەدا بۆ ڕەخساندن، کە بریتی بوون لە (مَنّ) و (سَلْوى) کە یەکەمیان (گەزۆ)یەو دووەمیشیان جۆرە باڵندەیەکە، وەك کەوو سوێسکە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ ..وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ... ﴾ (الأعراف- ١٦٠).

واتە: وە هەورمان لەسەریان کردە سێبەرو گەزۆو سەلواشمان بۆ ناردنە خوارێ.

کەچی لەجیاتی سوپاسگوزاریی کردن و قەناعەت کردن، بە شێوازێکی ناجۆر کەوتنە بڕوبیانوو گرتن لە مووسا (علیه السلام)و لەو دەشت و بیابانە قاقڕو بێئاوەدا، داوای خواردنی جۆراو جۆریان لێکرد، وەك خوای (عزّ وجل) فەرموویەتی:

﴿ وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ... ﴾ (البقرة- ٦١).

واته: وەیاد بکەنەوە کاتێك گوتتان (واتە پێشینانتان) ئەی مووسا: لەسەر یەك جۆرە خواردن خۆڕاناگرین، جا داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکە، کە لەوەی زەوی دەیڕوێنێ لە پاقلەو ترۆزیی و گەنم و نیسك و پیوازی، بۆمان دەرێنێ... دیارە مووساش (سەلامی خوای لێ بێ)، بەم وەڵامە توندو ددان شکێنە بێدەنگیان دەکات:

﴿..قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ... ﴾ (البقرة- ٦١).

واته: ئایا ئەوەی کە چاکترە بەوەی دەگۆڕنەوە، کە خراپترە؟! دەشۆڕبنەوە بۆ هەر شارێك، تاکو ئەوەی داوای دەکەن چنگتان بکەوێ.

**بەڵێ بەڕێــزان!**

بۆ میللەتی خاوەن عیززەت و عەودالی ئازادیی، خواردنی یەك جۆری سادە، سەدجار لە خواردنی جۆراوجۆری ژێر سایەی فیرعەونەکان باشترە، بەڵام بەنی ئیسراٸیلی خووگرتوو بە کۆیلایەتی و ژێردەستەییەوە، بە پێچەوانەوە بووە.

**٣- سستیی و تەنبەڵیی لە جێبەجێ کردنی فەرمانداو، زۆرشت هەڵکۆڵین، بێئەوەی پێویست بێ:**

ئەم هەڵوێستەشیان بە جوانترین شێوە لەو بەسەرهاتەدا دەردەکەوێ، کە بەچیرۆکی مانگا زێڕینە ناسراوەو، سوورەتی (البقرة)یشی بە ناوەوە کراوە، لە ئایەتی (٦٧) تا (٧٣)ی بۆ تەرخان کراوەو، کورتەکەییشی ئەوەیە، کە دوای ئەوەی پیاوێکی بەنی ئیسراٸیلی دەکوژرێ و بکوژەکەی نازانرێ، خوای کاربەجێ فەرمان بە مووسا (علیه السلام) دەکات، کە بۆ دۆزینەوەی بکوژەکە بەگەلەکەی بڵێ مانگایەك سەربڕن و، ئەندامێکی ئەو مانگا سەربڕاوە، لە تەرمی ئەو کوژراوە بدەن، تاکو وەك موعجیزەیەکی دیکەی مووسا، ئەو بابا کوژراوە زیندوو بێتەوەو، ناوی بکوژەکەی خۆی بدرکێنێ، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَءْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِ اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ ءَايَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ (البقرة: ٧٢-٧٣).

واتە: وەیاد بکەنەوە کاتێك یەکێکتان کوشت و تێیدا کەوتنە مشت ومڕەوە، بەڵام خوا ئەوەی پەنهانی دەکەن دەیخاتە گۆڕێ. ئنجا پێمان گوتن: ئەندامێکی ئەو مانگا سەربڕاوە لە تەرمی کوژراوەکە بدەن - تاکو زیندوو بێتەوە - ئاوا بەو شێوەیە خوا مردوان زیندوو دەکاتەوەو نیشانەکانی خۆیتان پێشان دەدات، بەڵکو بفامن.

ئنجا دیارە گەلی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ)، سەرەنجام ئەو فەرمانەیان جێبەجێ کردوە، بەڵام دوای چی؟!

دوای ئەوەی بەهۆی پرسیارکردنی زۆرەوە لە مووسا، لەبارەی تەمەن و ڕەنگ و جۆرو چۆنیەتی ئەو مانگایەوە، کە پێویستە سەری ببڕن، هەم مووسایان زۆر بێزار کردوەو، هەم کارەکەشیان زۆر لەسەر خۆیان قورس کردوە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ ..فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ ﴾ (البقرة- ٧١).

واتە: وە سەرەنجام سەریان بڕی، هەرچەندە خەریك بوو نەیکەن...

هەڵبەتە ئەگەر بمانەوێ بەسەرژمێرکردنی عەیب و کەم وکوورییەکانی بەنی ئیسرائیلدا بچینە خوارێ، کە بە هۆی ژیانی ژێردەستەیی و لەدەستدانی ئازادییەوە، تێیاندا پەیدابوو بوون، زۆری دەوێ، بۆیە بەم سێ نموونەیە وازی لێ دێنین.

ئێستاش نۆرەی خۆمانە، وەك گەلێکی ستەمدیدەو چەوسێنراوەی درێژخایەنی ژێر نیرو چەکمەی ڕژێمی بەعسی شۆڤێنی:

**نموونـــەی دووەم:**

ئێمەش وەك خەڵکی کوردستانی عێراق، بەهۆی زەخت و فشارو ستەم و چەوساندنەوەی چەندان ساڵەی ڕژێمی بەعسەوە، کاتی خۆی کۆمەڵێکی زۆر

عەیب و عارو ناتەواویی فیکریی و ڕەوشتیی (سلوكي) و کۆمەڵایەتیی و سیاسییمان - بەگشتی- تێدا پەیدابوو بوون، کە هەتا ئێستاش کەم و زۆر کاریگەریی و ڕەنگدانەوەیان لە هەڵس وکەوت و ڕەفتارو هەڵوێستەکانی زۆربەی میللەتەکەماندا، بەسەرکردایەتیی سیاسیی و ئەهلی فیکرو قەڵەمیشەوە، بەزەقیی هەست پێدەکرێ!

جا دیارە من بە پێویست و بگرە پەسندیشی نازانم، بچمە نێو درێژەو وردەکاریی ئەو مەسەلەیەوە، کە پێم وانیە هیچ کەس لام و جیمی تێدا بکات، بۆیە هەروا بە خێرایی و بە کورتیی، ئاماژە بە هەندێك لەو خوو و خەسڵەتە خراپانە دەکەم، کە پێم وایە هۆکاری سەرەکیی سەرهەڵدانیان لەنێو بەشێکی زۆری خەڵکەکەمان دا، ستەم و زۆرو چەوساندنەوەی ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس بووە، لە ڕابردوودا:

١- پاوانخوازیی و خۆسەپاندن و، هەموو شتێك بۆخۆو دارودەستەی خۆ قۆرخ کردن..

٢- خۆ پێ کەمبوون لە بەرانبەر ئەوانی دیکەدا، کە ئەمەش گەورەترین هۆکاری لاسایی کردنەوەو، شوێنکەوتنی کوێرانەیە.

٣- کردنی کارێك لە بەرانبەر پارەو تەماع و کورسیدا، کە پێچەوانەی قەناعەت و بڕوای نێو دڵ و دەروونە، کە کاتی خۆی بە زەقترین شێوە لە دیاردەی جاشایەتیی و سیخوڕیی کردن بۆ ڕژێم داو، ئێستاش لە گەلێك بوارداو، بە زۆر شێواز، لەهەڵوێست و ڕەفتاری خەڵکێکی زۆردا بەرجەستەیە.

٤- خۆویستی (أنانية)و بەتەنگ خەڵکەوە نەبوون و، تەنیا لە بیری خۆو بەرژەوەندیی تاکیی خۆدا بوون و پەندی هەڵەی: (ئۆخەی ئۆخەی، هەر کەس بۆخۆی!) کردنە بەرنامە.

٥- زاڵبوونی گیانی ماددیگەرایی و، تەنیا لە فیکری تێرکردنی گەدەو داوێن و پڕکردنی گیرفان و قاسەدا بوون.

٦- هیممەت نزمیی و، لە هەموو شتێكی چاكدا بە كەمترین ئاست و پشك قەناعەت كردن، جگە لە بەرژەوەندییە ماددیی یەكان و تێركردنی غەریزە جەستەیی یەكان، كە بە زمانی حاڵ، دۆزەخ ئاسا لەو ڕووەوە هەر دەڵێن:

﴿... هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ؟!﴾ (ق- ٣٠).

٧- زاڵكردنی ئینتیمای حیزبیی و تیرەیی و ناوچەیی و بنەماڵەیی بەسەر ئینتمای نەتەوەیی و نیشتیمانییدا و، سەرەنجام ماڵماڵۆكێنەو دابڕ دابڕ بوون!

بەڵێ بەڕێزان !

سەرجەم ئەم دەردو نەخۆشییە دەروونیی و فیكریی و ڕەوشتییانەو، هی دیكەش لەنێو خەڵكێكی زۆری میللەتەكەماندا، كەم و زۆر هەن و تەشەنەیان كردوە، جا ئێستا ئەگەر بمانەوێ تاكی كوردستان، چ منداڵ بێ، چ گەنج و، چ پیرو، چ نێرو، چ مێ، لەو دەردو نەخۆشییانە چارەسەر بكەین، یاخود پێشگیریی بكەین لە تەشەنەكردنی زیاتریان و پێوە گیرۆدەبوونی ئەوانەی كە پێیانەوە گرفتار نەبوونە، بەتایبەت لە وەچەی نوێمان، پێویستە یەكەمین هەنگاومان بۆ پەروەردەیەكی ڕەسەن و ڕاست، بریتی بێ لە فەراهەم هێنانی كەش وهەوایەكی ئازاد، كە مرۆڤ تێیدا هەست بە مرۆڤبوونی خۆی بكات و هیچ پاڵەپەستۆو فشارێكی ماددیی و مەعنەویی و سیاسیی و ئەمنیی، وای لەسەر نەبێ، كە بیپلیشێنێتەوەو كەسایەتیی وردوخاش بكات و بیكاتە (خوردە)!!

كەواتە: با بە هەموو لایەكمانەوە، كار لەسەر ئەوە بكەین، كە ئازادیی و سەربەستی ڕاستەقینە بۆ تاكەكانی كۆمەڵگاكەمان مەیسەرو دەستەبەر بكەین و، ڕێ نەدەین بە هیچ لایەن و دەزگایەك، كە بە هیچ بیانوو پاساوێكەوە، ئازادیی لە تاكی كوردستان زەوت بكات و، لە هیچ كەسێكیش قبووڵ نەكەین، كە زەخت و گوشاری سیاسیی، یان ئابووریی، یان ئەمنیی، بخاتە سەر خەڵكی و لەو نیعمەتە هەرە بەرزە خواییە، كە بەبێ وی مرۆڤ لە نێوەڕۆكی خۆی خاڵی دەبێتەوە، بێبەش بكات، كە بریتیە لە ئازادیی.

ئنجا با بزانین دووەمین هەنگاو و بنەمای پەروەردەیەكی ڕاست و ڕەسەنی تاك، چیە؟!

## دووەم: پەروەردەیەکی گشتگیرو هاوسەنگ:

بەڵێ بەڕێزان!

ئەگەر بمانەوێ گۆڕانکاریی و وەرچەرخانێکی ئیجابیی لە کۆمەڵگاکەماندا بکەین، پێویستە بەرنامەیەك بۆ پەروەردەکردنی تاکەکانی ڕەچاو بکەین، کە گشتگیر بێت و، سەرجەم لایەن و پێکهاتەکانی مرۆڤ، لە عەقڵ و دڵ و غەریزەو...هتد، بگرێتەوە، وە هاوسەنگیش بێ و هیچ لایەن و پێکهاتەیەکی مرۆڤ لەسەر حیسابی لایەن و پێکهاتەکانی دیکەی گەورە نەکات و، سەرەنجام بەهۆی پەروەردەیەکی لاتەڵ و ناهاوسەنگەوە، کەسایەتییەکی ناڕێك و لاسەنگ بۆ مرۆڤەکان فەراهەم نەهێنێ.

دیارە کاتێکیش مرۆڤ پەروەردەیەکی گشتگیرو هاوسەنگ دەکرێ، کە سەرەتا عەقڵ و هۆشی بە زانیاریی و شارەزایی ڕاست و سوودبەخش ڕۆشن بکرێتەوە، کە بێگومان زانستی لە وەحی خواوە سەرچاوەگرتوو، لەپێش هەر جۆرە زانیارییەکەوەیە، پاشان دڵی بە ئیمان و عەقیدە بێدارو ئاوەدان بکرێتەوە، وە لایەنی ڕووحیی بە خواپەرستیی و تەقواو تەزکیە تێر بکرێ، وە لایەنی عاتیفیی بە هونەری ڕەسەن و پاك و چاك گەشەی پێبدرێ، هەروەها جەستەی بەهۆی پاکڕاگرتن و خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵ و پاك پێدان و وەرزشکردنەوە، خزمەت بکرێ، وە بە هۆی ڕەوشت و ئەدەبە بەرزەکانی ئیسلامەوە، لایەنی هەڵس وکەوت و ڕەفتاری خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی تێدا بەهێز بکرێ و...هتد، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) تیشکێکی باشمان بۆ دەخاتە سەر مەسەلەی پەروەردە لە ئیسلامدا:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص -خوا لێیان ڕازی بێ- کە وادیارە شەوانە هەمیشە شەونوێژی کردوەو نەخەوتوەو، ڕۆژانەش هەردەم بەڕۆژوو بووەو نەیپساندۆتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووم:

((يا عبدالله ألَمْ أُخْبَرْ أنّك تصومُ النّهار وتَقوُم الّليل؟ فقلت: بَلى يا رسول الله، قال: فَلا تَفْعَلْ، صُمْ وأفْطِر، قُمْ وَنمْ، فإنَّ لجسدك عليك حقاً، وإنَّ لعينك عليك حقاً، وإنَّ لزوجك عليك حقاً، وإنَّ لزورك عليك حقاً..)) بوخاریی بە (١٩٧٥)و موسلیم بەژمارە (١١٥٩) گێڕاویانەتەوە.

واتە: ئەریّ عەبدوڵڵا! وەك هەواڵم پێدراوە، ڕۆژانە هەر بەڕۆژووی و، شەوانەش هەر شەونوێژ دەکەی؟

گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خوا!

فەرمووی: دەجا وامەکە، ڕۆژووش بگرەو بەڕۆژووش مەبە - واتە هی سوننەت -، وە شەونوێژیش بکەو بشخەوە، چونکە جەستەت هەقی لەسەرتەو، چاوت هەقی لەسەرتەو، هاوسەرت هەقی لەسەرتەو، میوانیشت هەقی لەسەرتە.. بەڵێ، پەروەردەی ڕاست و دروستی مرۆڤ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، ئەوەیە کە یەك ڕەهەندانە تەماشای مرۆڤ نەکرێ و، لە بەرنامەی پەروەردەو پێگەیاندنی دا، سەرجەم پێکهاتەکانی سروشتی و، ڕەهەندو لایەنەکانی کەسایەتیی، لەبەرچاو بگیرێن و حیسابی خۆیانیان بۆ بکرێ، چونکە بێگومان مرۆڤ بە هەموو پێکهاتە ڕواڵەتیی و دەروونییەکانیەوە مرۆڤەو، نە عەقڵی ڕووتەو، نە جەستەی بە تەنیاو، نە ڕووحی بەتەنێ و...هتد.

## سێیەم: ئیمان، خواپەرستیی، ڕەوشت، سێ پایەی گرنگی پەروەردەی هاوسەنگن:

پەروەردەی مرۆڤ لە ئیسلامدا، سێ بنچینەی گەورەو گرنگی هەن، کەوەك سێکوچکەیەك لەسەریان بەندە، ئەوانیش بریتین لە:

ئیمان، خواپەرستیی، ڕەوشت.

جا هەرچی ئیمانە کە لەسەر بناغەی بووناسیی (معرفة الوجود - Ontology) هەڵدەچنرێ و، تاکە بووناسیی ڕاست و دروستیش ئەوەیە، کە ئیسلام خستوویەتە

ڕوو - وەك لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)دا بە درێژیی قسەم لەبارەوە کردوە -، بەڵێ ئیمان بەرچاوی مرۆڤ ڕۆشن دەکاتەوە، دەربارەی خۆی و، خوا (عزّ وجلّ)و، بوونەوەر، وە ئینسان لەسایەی ئیماندا، لەخۆی حاڵی دەبێ، کە چییەو، کێیەو، بۆچی دروستکراوەو، پێویستە چۆن بژی و، چی بکات و، سەرەنجامی ئەم ژیانە دنیاییە چۆن دەبێ و، ڕۆژی دوایی چییەو، چی تێدا دەگوزەرێ و...هتد؟!

ئنجا پاش لە دڵ و عەقڵدا چەسپانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، بەهەر پێنج پایەو بنەڕەتە سەرەکییەکانیەوە، کە بڕواهێنانە بە خواو، فریشتەکانی و، کتێبەکانی و، پێغەمبەرانی و، ڕۆژی دوایی، وەك ئەنجامێکی سروشتیی، مرۆڤی بڕوادار دەکەوێتە خولیا و بیرو تەقەللای پەرستن و بەندایەتیی کردن بۆ خوای بەرزو بێوێنە (سبحانە وتعالى)، چونکە مەحاڵە کەسێك بەڕاستیی خوا بناسێ و، عەوداڵ و شەیدای پەرستن و بەندایەتیی بۆکردنی نەبێ، هەروەها دوورو مەحاڵە کەسێك بڕواهێنان بە فریشتەکانی خواو کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی، لەدڵدا چەسپابێ و، هەوڵ نەدات بە جۆرێك ژیان و گوزەرانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتی دنیای ڕێك بخات، کە ببێتە مایەی ڕزگاربوون و سەرفرازیی ئەولای و، بەختەوەریی و خێروخۆشیی ئەملای.

پاشان وەك زادەو بەرهەمێکی سروشتیی و چاوەڕوانکراوی ئیمان و عیبادەت، بابای بڕواداری خواپەرست، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەرەو ڕەوشت و خووی بەرزو جوان و، ئەدەبی دڵگیرو پەسند، پەلکێش دەبێ، چونکە بێگومان مرۆڤ لەسۆنگەی ئیمان و عەقیدەی ڕاست و، خواپەرستیی ساغەوە، لە خوا (سبحانە وتعالى) و فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی (علیهم الصلاة والسلام) نزیك دەبێتەوە، وە لە کتێبی خواو، فەرمایشتە بەرزو بێوێنەکانی ورد دەبێتەوەو، وە بۆ خۆسازو ئامادەکردن، بۆ بەر دادگای خوا لە ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەو پاداشت و سزا، بێدار دەبێتەوە.

ئنجا شتێکی ڕوون و بێچەندو چوونیشە، کە هەرکەسێك لە خواو فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی نزیك بێ و، لە کتێب و فەرمایشتەکانییەوە ڕامێنێ و، لەبیری

خۆئامادەكردندا بێ بۆ ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت وەرگرتنەوەو، پاشان پەرستن و بەندایەتییەكی ساغ و بێخلّتە بۆ خوا ئەنجام بدات، حەتمەن حەتمەن لە هەموو ڕەوشت و ئاكارێكی بەرزو پەسند بەهرەمەند دەبێ و، لە خوو وخدە و ڕەفتاری دزێو و ناپەسندیش دوور دەبێ، هەر بۆیەش دەتوانین بە دڵنیایی و ڕاشكاوییەوە بڵێین: (خوو و ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە)[1] -، هەر بۆیەش دەتوانین بە پشت بەستن بەو ڕاستییەی كە ڕابرد بڵێین:

هەركەسێك ناتەواویی (خَلَلْ) و كەم وكووڕیی لە خواپەرستییەكەیدا بینرا، دەبێ بزانرێ كە ناتەواویی لە ئیمان و عەقیدەكەیدا هەیەو، هەمیشە كرچ وكاڵیی و كەم و كووڕیی ڕەوشت و ئاكاری مرۆڤیش، زادەو بەرهەمی ناتەواویی خواپەرستییەكەیەتی، ئەم دوو ئایەتە بەپێزەی سووڕەتی (إبراهیم)یش، بە ڕوونیی پێكەوە گرێدران و پەیوەستبوونی: بڕواو، خواپەرستیی و، خووڕەوشتی پەسند، ڕادەگەیەنن:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ... ﴾ (٢٤-٢٥).

واتە: سەرنج نادەی چۆن خوا بۆ وشەیەكی پاك و چاك - كە مەبەست وشەی (لا اله الاّ الله) یە - درەختێكی چاك و بەپێزی بەوێنە هێناوەتەوە، كە ڕەگ و ڕیشەكەی لە زەویدا چەسپاوەو لق و پۆپەكانیشی بەرز هەڵچوون، هەردەم بەفەرمانی پەروەردگاری بەرو میوەی خۆی دەبەخشێ...

وەك دەبینین خوای كاربەجێ (سبحانە وتعالی) وشەی بەرزو بەپێزی خوا بەیەكگرتن (كلمة التوحید) و، ئەو شوێنەوارو بەرهەمانەی لێی پەیدا دەبن، لەخواپەرستیی و فەرمانبەریی و، خوو و ڕەوشتی بەرزو پەسند، بە درەختێكی بەرهەمدار دەچوێنێ، كە لە سێ بەشان پێكهاتوە:

ڕەگ و ڕیشە، قەدو لق و پۆپ و گەڵا، میوەوبەر، دیارە لە پێكەوە بەراوردكرانی: بیری خوابەیەكگرتن (فكرة التوحید)و درەختە بەردارەكەشدا،

---

(١) نامیلكەیەكم بەو ناوونیشانەوە هەیە.

ئیمان و عەقیدە دەکەوێتە بەرانبەر ڕەگ و ڕیشەو، قەدو لق و پۆپ و گەڵاش لە بەرانبەر خواپەرستیدا قەرار دەگرن و، میوەو بەریش، خووو ڕەوشت و ئاکاری پەسندیان دەکەوێتە ڕاست.

**کورتەی قســـان:**

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: سێکوچکەی : (ئیمان، خواپەرستیی، خوو وڕەوشت) بناغەی لەسەر پەروەردەکرانی مرۆڤن و، هەرکاتێك ویسترا پەروەردەیەکی گشتگیر و هاوسەنگ ڕەچاو بکرێ، بۆ دارشتنی کەسایەتییەکی پوخت و نەخت و تۆکمەو ڕێکی تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان، پێویستە لەسەر بناغەی ئەو سێ پایە بنەڕەتییە، ئەو پرۆسەیە جێبەجێ بکرێ.

هیچ گومانیشی تێدا نیە، کە خواپەرستیی مرۆڤ لەقەدەر ئیمان و عەقیدەیەکەی دەبێ و، ڕەوشت و خوو و ئاکاریشی، بەپێی ئەندازەو ڕێژەی خواپەرستییەکەی دەبێ و، مرۆڤ هەتا خواناسترو بڕوادارتر بێ، خواپەرستترو پارێزکارتر دەبێ و، هەتا بەندایەتیی و پارێزیشی بۆ خوا چاکتر بێ، خوو و ڕەوشت و ئاکارو هەڵس و کەوتیشی لەگەڵ خەڵك و دەوروبەریدا باشتر دەبێ، هەربۆیەش خوای شارەزا (عزّ وجلّ) فەرموویەتی:

﴿ ...فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡ ... ﴾ (الأنفال- ١).

واتە: دەجا پارێز لە خوا بکەن و، نێوانتان چاك بکەن.

پێشینانی خۆشمان بەبێ هودە نەیانگوتوە: (لەو کەسە بترسە، کە لە خوا ناترسێ)، چونکە بەڕاستیی هەرکەسێك ترس و سام و هەیبەت و خۆشەویستیی خوای لەدڵ دابێ، مەحاڵە بەخۆی ڕەوا ببینێ، کە لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵك و، هەڵس وکەوتەکانیدا، هێڵە سوورەکان ببەزێنێ و، تەماع لە خوێن و نامووس و سامانیان بکات و، ماف و کەرامەتیان پێشێل بکات!

## چوارەم: وریابوون لە هەندێك نەخۆشیی و، هەڵەی بێڕەزاو کوشـندە:

بەڵێ بەڕێزان!

بۆ ئەوەی بتوانین پەروەردەیەکی ڕێك و ڕاست بۆ تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان، بەتایبەت چینی گەنج و تازە پێگەیشتوومان، بڕەخسێنین، پێویستە وێڕای ئەو سێ بنەما گەورەو گرنگەی پێشوو، لێوریابوونی چەند نەخۆشیی و هەڵەیەکی گورچکبڕیش، بخەینە بەرنامەی پەروەردەییمانەوە، کە بریتین لە:

### ١-لاسـایی کردنەوەی کوێرانە:

پێم وانیە هیچ کەسی واقیع بین و بە ویژدان هەبێ، نکوولیی لەوە بکات، کە دەردو نەخۆشیی لاسایی کردنەوەی ناهۆشیارانەو کوێرانەی ئەم و ئەو، لەنێو بەشێکی زۆری کۆمەڵگاکەماندا، بۆتە دیاردەیەکی زەق و بەرچاو.

شایانی باسیشە، کە لاسایی کردنەوە (تقليد)ی خەڵکی و، شوێنپێ هەڵگرتنیان، بەبێ لێوردبوونەوەو حیساب و کیتاب، یەکێکە لەو دەردو نەخۆشییە دەروونیی و کۆمەڵایەتییانەی، کە هەمیشە کۆمەڵگا دواکەوتوو و تێشکاوەکان، پێیەوە گیرۆدە دەبن وەك، کۆمەڵناسی زەبردەست (عبدالرحمن بن خلدون) لە کتێبی ناوداری خۆی (المقدِّمة)دا باسی کردوە، کە گوتوویەتی: (...والمغلوب مُوَلَعٌ بتقليد غالبِهِ...)، واتە: وە بابای بەزیوو تێشکاو، هەمیشە عەوداڵی لاسایی کردنەوەی بەسەردا زاڵبووەکەیەتی..

هەڵبەتە (إبن خلدون) باشی پێکاوە، چونکە ئێمە دەبینین هەمیشە دەرودو نەخۆشیی لاسایی کردنەوەو، شوێنکەوتنی کوێرانە، لەنێو ئەو دەستەو تاقم و توێژانەدا بازاڕی گەرمە، کە لە ناخیاندا هەست کردن بە دواکەوتوویێتی و بەجێماویی و تێشکاویی هەیە، لە بەرانبەر خەڵك و لایەنە لاساکراوەکانیاندا!

دیارە لە ڕوانگەی ئیسلامیشەوە، حاڵەتی لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە، زۆر خراپە و، یەکێکە لە عادەت و نەریتە بەدو خراپەکانی کافرو

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش، وەك خوا فەرمووییەتی:

﴿ بَلْ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾(الزخرف-٢٢).

واتە: بەڵکو گوتیان: ئێمە باب و باپیرانی خۆمانمان لەسەر ڕێیەك بینیوە، ئێمەش هەر بە شوێنپێی واندا دەڕۆین!

بەڵام لێرەدا پێویستە ئاگاداربین و، دوو مەسەلان پێکەوە تێکەڵ نەکەین، کە بە ڕواڵەت وێك دەچن، بەڵام لە نێوەڕۆکدا زۆر جیاوازن، ئەوانیش یەکەمیان ئەوەیە، کە باسمان کرد (لاسایی کردنەوە)و، دووەمیشیان بریتیە لە بەهرە وەرگرتن و سوودمەندبوون لە شتی بەکەڵك و باشی خەڵکی، هەرکەسێك بێ و لە هەر کوێیەك بێ!

چونکە خوای کاربەجێ لە حاڵێکدا، کە یەکەمیانی قەدەغە کردوەو ڕێگریی لێکردوە، وە بە عادەت و هەڵوێستێکی هەڵەو پووچی کافرانی داناوە، وەك پێشتر گوتمان، فەرمانی بەهی دووەمیان کردوەو، مەدحی کەسانێکی کردوە، کە گوێ بۆ هەموو جۆرە قسەو بیروبۆچوونێك دەگرن، بەڵام دوایی گوڵبژێر دەکەن و، کامەی چاکترو پەسندتر بوو هەڵیدەبژێرن، وەك فەرمووییەتی:

﴿ ....فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ (الزمر: ١٧-١٨).

واتە: دەجا موژدە بدە بەو بەندانەم، کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، پاشان شوێن ئەوەیان دەکەون، کە باشترە، ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، وە ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

بەڵێ، عاقڵ ئەو کەسەیە عەقڵی خەڵکی بخاتە گەڵ عەقڵی خۆی و، خۆی پێ دەوڵەمەند بکات، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرمووییەتی: ((الحكمة ضالّة المؤمن فحيثما وَجَدَها فَهوَ أحقُ بِها)) رواه الترمذي وغيره، واتە: حیکمەت شتێکە لە بابای بڕوادار بزر بووە، ئنجا لە هەر کوێیەك بیدۆزێتەوە، لە هەموو کەس پێی شایستەترە.

ئنجا ئەگەر تەماشای واقیعی مێژووی مسولمانانیش بکەین، دەبینین دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامیی، هەرچی بەرهەم و کەلەپووری فیکریی و فەلسەفیی و شارستانیی و سیاسیی و ئیداریی ڕۆم و فارس و هیندو چین و یۆنان بوو، بە عەقڵێکی کراوەوە وەریان گرت و، هەزمیان کردو تەفاعولی ئیجابییان لەگەڵ کردو، ئەوەی پێیان سوودبەخش و پەسندو لەگەڵ ئایین و عەقیدەدا گونجاو بوو، بەهرەیان لێوەرگرت و ئەوەی دیکەشیان بە پێی بنچینەی: (خُذ ما صَفا دَعْ ما كَدَر) ئەوەی بێخڵتەیە وەریگرەو، ئەوەی لێڵە ڕەتی بکەوە، فڕێداو بە زمانی حاڵ گوتیان: ماڵی قەڵب سەر بە ساحێبیەتی!

ئنجا وەنەبێ مسولمانانی پێشینمان هەر بەوەندە وازیان هێنابێ، کە شتی چاکی خەڵك وەربگرن و خۆیانی پێ دەوڵەمەند بکەن و، کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییانی پێ بەهێزو پێز بکەن و گەشەیان پێبدەن، بەڵکو ئەو بەرهەم و کەلەپوورە فیکریی و شارستانیی و ئیدارییەی وەریان گرت، گەشەیان پێداو زیادەی خۆشیانیان زۆر خستە سەری، وەك واقیعی مێژوویی شایەدەو، مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکانیش گەواهیی دەدەن.

**پوختەی مەبەست:**

لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی ناهۆشیارانەی خەڵکی، لە هەر ڕوویێکەوە بێ، دەردو نەخۆشییەکی کوشندەو خراپەو، پێویستە لە بەرنامەو پرۆسەی پەروەردەییماندا چارەسەری بۆ ڕەچاو بکەین، بەتایبەتیش، کە لە ڕۆژگاری ئێستامان و، لەنێو بەشێکی زۆری کۆمەڵگاکەماندا، زۆر تەشەنەی کردوەو، هەموو بوارەکانی فیکرو ڕەوشت و نەرێت و پۆشاك و....هتدیشی گرتۆتەوەو، ئەگەر بابایەکی نەشارەزا بە نەتەوەکەمان سەرنجمان بداتێ، وا حاڵی دەبێ، کە ئێمە میللەتێکی سەرسواڵکەرو دەستخاڵیی و هیچ نەدیتووین و، هیچ شتێك لە دین و مێژوو و کلتووری خۆماندا شك نابەین، تەنانەت جل وبەرگ و ناوونیشانی دووکان و بازاڕەکانیشمان، بۆیە ناچارین هەموو شتێك لەملاولاڕا بێنین!!

**٢- هەمیشە ڕووی ڕەخنەو گلەیی لە خەڵك كردن و، دەستی چەور پێسڕینیان:**

ئەمیش یەكی دیكەیە لەو عەیب و ناتەواییانەی، كە لە خەڵكێكی زۆری كۆمەڵگاكەماندا هەیە، دیارە ئەم خەسڵەتەش زیاتر هی كەسانێكی لەخۆ ڕازی و دان بە هەڵەی خۆدا نەهێنەرە، وەك چۆن پێچەوانەكەی، واتە: لەجیاتی خەڵكی، خەتای خۆ گرتن و ڕەخنە لەخۆگرتن و عەیبی خۆ بینین، خەسڵەتی كەسانی واقیع بین و خۆ بەكەمگرە، پێشینانیش جوانیان گوتوە: ((ئەگەر پووشكەت لە چاوی خەڵكدا بینی، چیلكەش لە چاوی خۆتدا ببینە!))، منیش لە مێژ ساڵە وەك پەندێك گوتوومە: ((سەد هەڵەم تێدا بدۆزەوە، بەڵام یەكیانم لەگەڵ چاك بكە!)).

چونكە كەسانێك هەن، هەر لە عەیب دۆزینەوەو ڕەخنەگرتن ئازان و، بۆ چارەسەری گرفت و كێشەكان هیچیان پێنیە.

ئنجا گومانیشی تێدانیە، كە ئێمە هەموولایەكمان لە هێنانەدی ئەم واقیعەدا، بەخێرو شەڕو چاكەو خراپەیەوە، كەم وزۆر خاوەن پشكین، هەركەسە بەپێی خۆی.

هەڵبەتە ناشمەوێ هیچكەس وا لەم قسانەم تێبگات، كە من ڕەخنە لێگرتنی ئەم واقیعەم پێ خراپ و هەڵەیە، بەتایبەت واقیعی حیزبیی و حكوومیی و ئیداریی، كە سەرچاوەی زۆربەی هەرزۆری گرفت و نەخۆشییەكانە، نەخێر مەبەستم ئەوە نیەو، بگرە بە پێچەوانەوە: ڕەخنەگرتنی بەجێ و بابەتییانەو دەست خستنەسەر برین و نەخۆشییەكان، كارێكی گرنگ و پێویستە، بگرە لەڕوانگەی ئیسلامەوە، بێدەنگ بوون لە كەم وكووڕیی و هەڵەو پەڵەی كۆمەڵگاو دەستەڵات و دەوروبەرو، دەستنەگرتنی ستەمكارو خراپەكاران و، نەگێڕانەوەیان لە خراپەو ستەم، تاوانێكی یەكجار زلەو مایەی تێداچوونی كۆمەڵگاو دەستەڵات و سەر بەفەتارەت چوونیانە، وەك خوای كاربەجێ لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾ (الأنفال- ٢٥).

واتە: وە خۆتان لە بەڵایەك بپارێزن، کە تەنیا تووشی ستەمکارەکانتان نابێ، وە بزانن کە خوا سزای توندە.

(ترمذي)یش گێڕاویەتیەوە کە ڕۆژێکیان (أبوبکر) -خوا لێی ڕازی بێ- وتاری دەدا، گوتی:

{ أيها الناس إنكم تقرؤن هذه الأية:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ... ﴾ (المائدة- ١٠٥).}

وإني سمعت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: إن النّاس إذا رأوا الظالم فلم يأخذوا على يديه، أوشك أن يَعُمّهم الله بعقاب منه)}، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو بە هەڵە لێکی دەدەنەوە: (ئەی بڕوادارینە! وریای خۆتان بن، ئەگەر ڕێی ڕاست گرتووبن، گومڕابوان زیانتان لێنادەن...)، بەڵام من گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو: هەرکات خەڵك ستەمکاریان بینی و دەستیان نەگرت، نیزیکە خوا بەگشتی لەلایەن خۆیەوە سزایان بدات.

بەڵام مەبەستم ئەوەیە، کە تەنیا لە ڕەخنەگرتن و عەیب دۆزینەوە ئاۆا نەبین و، پێشنیاری ڕێبازو شێوازی چارەسەرکردنیشیان بکەین، وە پێشمان وانەبێ کە خۆمان هیچ عەیب و کەم وکووڕییەکمان نیەو، لە کەم وکووڕییەکانی ئەم واقیعەدا هیچ پشك و بەشمان نیە!

### ٣- تەنبەڵیی و خۆبواردن لە ئیش وکار:

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو دەردو نەخۆشییانەی کە وەك پەتایەك ژمارەیەك لەتاکەکانی کۆمەڵگاکەمانی گرتۆتەوە، لەسەر هەموو ئاستەکان، هەر لەسەرکردایەتی سیاسیی و بەرپرسیارێتییە حیزبیی و حکوومیی یەکانەوە بگرە هەتا سەرجەم توێژەکانی کۆمەڵگاکەمان.

واتە: من لێرەدا ڕووی قسەم تەنیا لە میللەت، یان توێژێکی دیاریکراویی میللەت نیە، بەڵکو ڕووی قسەم لە تەنبەڵەکانی کۆمەڵگایەکەمان بەگشتی

بەحکوومەت و حیزب و میللەتەوە، چونکە وەك چۆن گەنجێك کە ئامادە نیە لەولاّتەکەی خۆیدا کاروکاسبییەك بکات، هەرچەندە ئاتاجیشە، وە بەڕێوەبەرانی ولاّت ناچار دەبن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، کرێکاری بیانیی بێنن، بە تەنبەڵ دادەنرێ، بە هەمان شێوەش بەرپرسێکی حیزبیی یان ئیداریی و حکوومییش، کە لەبەر ئیسراحەت تەڵەبیی و خۆ ئەزیەت نەدان و ئارەقە نەکردن، کەمتەرخەمیی لە ئەرك و کاری خۆیدا دەکات و بە چاکیی ئەنجامی نادات، یان دوای دەخات، ئەویش هەر بە تەنبەڵ و تەوەزەل دادەنرێ و، بگرە بابای بەرپرس و پایەزل، لە کاتێکدا لە ئەرك و کارەکانی خۆی دەبوێرێ و تەنبەڵیی دەکات، زەرەرو زیانێکی زۆر بە هەموو لایەك دەگەیەنێ و، جاری وایە بەهۆی ساردو سڕیی نواندنی کەسانێکی بەرپرسەوە، لە نواندنی هەڵوێستێکی سیاسیدا، یان دەرکردنی بڕیارێکی سیاسیی بەپەلەی هەنووکەییدا، مەسەلەیەکی گرنگ و چارەنووسساز لەدەست دەچێ.

**ئنجا ئەوەی کە لێرەدا پێویستە جەختی لەسەر بکەینەوە، چەند شتێکە:**

**یەك:** دیاردەی خۆبواردن لە ئیش وکارو کەمتەرخەمیی تێداکردنی و تەنبەڵیی، یەکێکە لە نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان و، گەلانی تەنبەڵ و خۆبوێر ناتوانن گەشە بکەن و بەرەوپێش بچن.

**دوو:** کۆمەڵگای ئێمە بەشێکی گیرۆدەی ئەو نەخۆشییە بووە، لە هەموو ئاستەکانداو، پێویستە وەك ڕاستییەکی تاڵ دانی پێدا بێنین، چونکە خۆ لێگێل کردنی، هیچ لە واقیعی تاڵی ناگۆڕێ، وەك چۆن بەسەر لە لمدا نوقم کردنی وشترمەل، ڕاوچی بزر نابێ!

**سێ:** هۆکارێکی سەرەکیی پەیدابوونی ئەو نەخۆشییە، وێڕای هۆکارەکانی ڕۆژگاری ڕژێم، بریتیە لە گوریس پچڕ کێنەو موونافەسەی نێوان هەردوو حیزبی حوکمڕان (پارتی و یەکیەتی) کە ویستوویانە و دەیانەوێ بە زەبری پارەو تەعین کردن و چی وچی، خەڵکی بێمتمانەو زویرو دڵسارد بەخۆیانەوە گرێ بدەن و، لە دەوری خۆیان کۆوەکەن!

**چوار:** چارەسەریش لە چەند شتێکدا دەبینم، گرنگترینیان:

أ- چاو بە سیاسەتی خۆدا گێڕانەوەی پارتی و یەکیەتی و، زانینی ئەو ڕاستییە، کە خەڵکی بە هاندەری پارەو تەماع کۆبووەوە، ناگونجێ پشتی پێ ببەسترێ و، حیسابی لەسەر بکرێ و، سەرەنجام ئەو پەندە کوردیەیان بەسەردا دەچەسپێ کە دەڵێ: (هەتا گندۆر گندۆر بوون، خزم زۆربوون، گندۆر هاتنە بڕانێ، خزم هاتنە قڕانێ).

ئنجا هیچ گومانیشی تێدا نیە، کە ئەو جۆرە هەڵس وکەوت کردنە بە ماڵ و سامانی خەڵك، شتێکی ناشەرعییی و نایاسایی و نامەنتیقیشە!

ب- پەروەردەکردنی خەڵك لەسەر بە بەرزو پیرۆز تەماشاکردنی کارکردن و تێگەیاندنیان لەو ڕاستییە، کە کارکردن و بژێوی حەڵاڵ پەیداکردن، بە ڕەنجی شان و ئارەقەی نێوچاوان، جۆرێکە لە عیبادەت و، بەشێکی گرنگە لە دینداریی و طاعەت.

ج- کارکردنی جیددیی بۆ پەیداکردنی کارو کەسابەت لە وڵاتدا، بەهۆی بووژاندنەوەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی و وەگەڕخستنەوەی کارگە لەکار کەوتووەکان و، بنیاتنانی کارگەو کارخانەی دیکەو، دەربازکردنی کۆمەڵگاکەمان لەم حاڵە نائاسایی و ناسروشتییەی، کە تێیکەوتوە، کە بریتیە لە: چاو لەدەستی وڵاتانی دیکە بوون، بۆ سادەترین پێداویستی ژیان و گوزەرانی ڕۆژانەمان، کە پێم شك نایەت لەو ڕووەوە وڵاتێکی دیکەی وەك هەرێمی کوردستان لە دنیادا هەبێ!

**٤- دابەزینی ئاستی خوێندن و وەرگرتنی زانست:**

کە دیارە ئەم نەخۆشییە زیاتر تایبەتە بە قوتابییانەوەو، هۆکاری سەرەکیی سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیەش -بەڕای من- بریتیە لە:

**یەکەم:** دەستتێخستنی حیزب - کە مەبەستمان هەردوو حیزبی حوکمڕانە- لە کاروباری خوێندن، وەك دانانی مامۆستای بێتواناو ناشایستە، بەهۆی ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی تەسکی حیزبییەوە، وە فەرق و جیاوازیی خستنە نێوان

قوتابییەکانەوە، لەبەر هەمان هۆکار، وە سەرقاڵکردنی قوتابییان بە گوریس پچڕکێنەی حیزبییەوەو...هتد.

دووەم: کاریگەریی سەلبیی تەوژمی عەلمانیی، چ لە ڕێی هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە، چ لە ڕێی شێوازەکانی دیکەی کاروچالاکی حیزبیی و حکوومییانەوە، کە بەردەوام کار لەسەر لەخواو لە ئیسلام دوورخستنەوەی گەنجەکان دەکەن و، هەمیشە خەریکی تێدا ورووژاندنی غەریزەی جینسییان و قەناعەت پێهێنانیانن، کە ژیان لە تێرکردنی گەدەو داوێندا کورت هەڵدێ!

دیارە چارەسەری ئەم نەخۆشییەش بەوە دەکرێ، کە دژو پێچەوانەی هۆکارەکانی پەیدابوونی بێنینەدی، واتە: دەستتێوەردانی حیزب لە پرۆسەی خوێندندا ڕابگیرێ و نەهێڵرێ، وە تەوژمی عەلمانییش چیدی لە دژی تەوژمی ئیسلامیی، هەوڵی لەخواو ئیسلام دوورخستنەوەی گەنجەکان نەدات و، بەلای کەمەوە وەك سیکۆلاریزمی ڕۆژئاوا، ئەگەر لەگەڵ ئایین و عەقیدەی کۆمەڵگایەکەیشیدا نیە، دژیشی نەبێ، ئەگەرنا خۆی بە مەرەدی مەلای مەزبوورە دەبات، کە ئەو لقە درەختەی دەبڕیەوە کە لەسەری وەستابوو، وە پەندی: (نۆ گای خۆی بە گایەکی خەڵکییەوە لە گاگێرەدا خنکاند)ی بەسەردا دەچەسپێ!

**٥- بێهیوایی و نائومێدبوون:**

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لەو دەردو نەخۆشییە پەرەگرتوانەی کە بەشێکی زۆری کۆمەڵگاکەمانیان گرتۆتەوە.

دیارە لە ئاکامی دڵساردیی و نائومێدییش دا، کۆمەڵێك نەخۆشیی و گرفتی دیکە سەرهەڵدەدەن، کە سەری خۆهەڵگرتن و ڕوو لە هەندەران کردنی گەنجەکان لە هەموویان زەقترە.

**پێشم وایە بۆ چارەسەری ئەم گرفت و نەخۆشییەی بێهیوایی و تەمابڕاوبوونە، ڕەچاوکردنی سێشت پێویستە:**

أ- بە هەموو لایەکەوەو لە هەموو ئاستەکاندا، بەجیددیی هەوڵی چارەسەرکردنی

ئەو کەم وکووڕیی و گیروگرفتانە بدەین، کە خەڵکەکەمانیان دووچاری بێزاریی و نائومێدیی کردووە، پێمان وانەبێ، کە دەگونجێ ئەم واقیعە بەو هەموو کەم و کووڕیی و نەخۆشیی و نەهامەتییانەوە، درێژە بە بوونی خۆی بدات.

بەکورتیی و بەکوردی:

با بەرپرسان و ساماندارانی بەهرەوەرگر لەم واقیعە پڕ ستەم و بێدادیی و کەم و کووڕییە، خەیاڵ پڵاوی وانەکەن، کە ئەم هەل ومەرجە خراپ و پڕ گەندەڵیی و پۆخەڵییەیان بۆ دەچێتە سەر! بەڵکو بە پێی یاسا (سُنَّة)ی خوا لە مێژووی بەشەردا، هەمیشە ئەو جۆرە واقیعانە سەرەنجامیان هەڵگێڕانەوەیە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿...وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾﴾ (الشعراء -٢٢٧).

واتە: وە لەمەودوا ئەوانەی ستەمیان کردووە، دەزانن چ هەڵگێڕانەوەیەك هەڵدەگەڕێنەوە!

ب- دەرككردنی ئەو ڕاستییە، کە هیچ کۆمەڵگایەك بێگرفت و کێشەو کەم و کووڕیی نیەو نابێ، بۆیە نابێ هەبوونی گرفت و کێشەکان چۆکمان پێدابدەن و نائومێدمان بکەن.

ج- بەهێزکردنی لایەنی مەعنەویی و گەشەپێدانی لەنێو کۆمەڵگادا بەگشتی و بەتایبەت چینی تازە پێگەیشتوو و گەنج، چونکە هیچ گومانی تێدانیە، کە مرۆڤی بڕوادارو پشت بەخوا قایم و دیندارو پارێزکار، لە خەڵکی دیکە بەهێزترو خۆڕاگرترە، لەبەردەم نارەحەتیی و گرفت و ئازارەکاندا و، هەرگیز بابای ئیمان پتەو لە سەختترین هەل ومەرجیشدا، دووچاری بەزین و تێشکان و نائومێدیی نابێ، وەك خوا (عزّ وجلّ) فەرموویەتی:

﴿...إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ (یوسف- ٨٧).

واتە: بێگومان تەنیا کۆمەڵی کافران لە بەزەیی و کەرەمی خوا بێهیوا دەبن.

لێرەشدا کۆتایی بە بواری یەکەمی بابەتەکەمان دێنین، کە بەشی زۆری پانتاییەکەی گرتۆتەوە، دەچینە سەر بواری دووەم:

## بواری دووەم : ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر
## بە کۆمەڵگاکەمان لە بواری خێزانییدا

بەڕێــزان!

بۆ خستنەڕووی ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە کۆمەڵگەکەمان لە بواری خێزانییدا، بە پێویستی دەزانم سەرەتا ئاماژەیەك بکەین بە سروشت و پایەکانی بنیاتنانی خێزان لە ئیسلامدا، بۆ ئەوەی هەموولایەك لەوبارەوە بەرچاومان ڕوون بێ، چونکە من دەزانم کە کەسانێکی لە ئیسلام نەشارەزا، زۆرجاران بەهۆی هەڵس وکەوت و ڕەفتاری هەڵەو نابەجێی هەندێك لە مسوڵمانانەوە لە بواری خێزانداریدا، بەناهەق ئیسلام تۆمەتبارو، بگرە تاوانباریش دەکەن.

پاشان دوای خستنەڕووی سروشتی خێزان و پایەکانی، ئاماژە دەکەین بۆ ژمارەیەك لەو گرفت و کەم وکووڕییانەی، کە لەو بوارەدا لەنێو کۆمەڵگاکەماندا هەن و، تیشکێکیش دەخەینە سەر چۆنیەتی چارەسەرکردنیان:

### سروشتی خێزان و پایەکانی لە ئیسلامدا:

ئیسلامی بەرجەستە لە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەری پێشەوادا (صلی الله علیه وسلم)، گرنگیی و بایەخێکی تایبەتی بە خێزان داوە، وەك یەکەمین و گرنگترین خشتی بنیاتنانی کۆمەڵگا، ئنجا ئەو گرنگیی و بایەخ پێدانەی ئیسلام بە خێزان، لە زۆر شتدا نومایانە، بەڵام گرنگترینیان - بەبڕوای من- ئەوەیە، کە ئیسلام بنیاتنانی خێزانی لەلایەن پیاو و ئافرەتەوە، خستۆتە سەر

بناغەی گرێبەست (عقد)ێکی گەورەو گرنگ، کە تەرەفێکی مێردو ئەوی دیکەی ژنەو، هەردووکیان بە شێوەیەکی ئازادانەو ئارەزوومەندانە، لەسەر ئەو بناغە موبارەکە، بۆ یەکدی حەڵاڵ دەبن و، خێزانێکی شەرعیی پێك دێنن.

شایانی باسیشە هەم لە کتێبی خوا (عزّوجلّ)داو، هەم لە سوننەتی پێغەمبەریشدا، بە ڕاشکاویی و لە چەند شوێنێکدا، باسی ئەو گرێبەستە کراوە، بۆ نموونە:

١- خوا (سبحانه وتعالى) لە سیاقێکدا، کە باسی مارەکردنەوەی ژنانی بێوەژن دەکات، پاش بەسەرچوونی ماوەی عیددە (عِدَّة) یان، کە چوار مانگ و دە شەوە، فەرموویەتی:

﴿...وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَـٰبُ أَجَلَهُۥ...﴾ (البقرة- ٢٣٥).

واتە: وە بڕیاری یەکجارەکی لە بارەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەوە مەدەن، هەتا کاتی عیددەکە بەسەردەچێ..

٢- هەروەها لە سیاقێکدا، کە باسی ڕەوانەبوونی وەرگرتنەوەی هیچ شتێك لەو مارەییەی، کە پیاو دەیداتە ژنەکەی، پاش ئەوەی لەیەك جیادەبنەوە، خوا (سبحانه وتعالى) گرێبەستی هاوسەرێتی بە(مِيثَاقاً غَلِيظاً) ناوبردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾﴾ (النساء: ٢٠-٢١).

واتە: وە هەرکات ویستتان هاوسەرێك بێنن لە جێی هاوسەرێکی دیکە، وە پڕی پێستێك مارەییتان دابووە یەکێکیان، هیچی لێوەرمەگرنەوە، ئایا وەك شتێکی بێبنەماو گوناهێکی ئاشکرا وەریدەگرن؟ ئنجا چۆن وەریدەگرن، لەحاڵێکدا کە پێشتر چوونەتە لای یەکدی و هاوسەرەکانیشتان پەیمانێکی پتەویان لێتان وەرگرتوە؟!

٣- پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: ((واتقوا الله في النساء، فإنكم أخذتموهن بأمانة الله و اسْتَحْلَلْتُم فرُوجهن بكلمة الله) رواه مسلم، واتە: لەبارەی ژنانەوە پارێز لەخوا بکەن! چونکە ئێوە وەك سپاردەی خوا وەرتان گرتوون و، بە وشەی خوا داوێنتانیان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردوە.

دیارە بەڵگەش لەسەر ئەوە زۆرن، کە گرێبەستی هاوسەرێتیی، گرێبەستێکی ئازادانەو ئارەزوومەندانەی نێوان ژن و پیاوە، بۆ نموونە:

١- خوا (سبحانه وتعالى) لەبارەی چۆنیەتی و سروشتی پەیوەندیی نێوان ژن و مێردەوە، فەرموویەتی:

﴿ ....هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ... ﴾ (البقرة -١٨٧).

واتە: ژنەکانتان پۆشاکن بۆ ئێوەو، ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان.

ئنجا دیارە هیچ کەسێکیش بە ویست و خواستی ئازادانەی خۆی نەبێ، پۆشاك ناپۆشێ.

٢- هەروەها خوا لەبارەی ئەرك و مافە بەرانبەرەکانی ژن و مێردانەوە فەرموویەتی:

﴿ ...وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ... ﴾ (البقرة -٢٢٨).

واتە: ... وە بۆ ژنان هەمان ماف هەیە لەسەر پیاوان، کە پیاوان لەسەروانیان هەیە، بەڵام پیاوان پلەیەکیان بەسەریانەوە هەیە..( مەبەستیش لەو پلەیە سەرپەرشتیی کردنی خێزانە).

کەواتە: وەك چۆن پیاو بە ویستی خۆی هاوسەرگیریی دەکات، ئافرەتیش بەهەمان شێوەو، دیارە بەبێ ئەمەش، گرێبەست (عقد) بوونی هاوسەرگیریی هیچ مانای نیە.

٣- بوخاریی لەژێر ناوونیشانی: (باب لا يُنْكِح الأَبُ و غيرهُ البِكْرَ والثيِّبَ الاّ برضاها)، واتە: (باسی ئەوە کە نە باب و نە کەسی دیکەش، کچ و بێوەژن بە ڕەزامەندیی خۆی نەبێ مارەنابڕێ)دا، ئەم فەرمایشتەی هێناوە:

((لاتُنْكَحْ الأيِّم حتى تُسْتَأمَر، ولا تُنْكحُ البِكر حتى تُسْتأْذَن...)) ژمارە: ٥١٣٦، واتە: بێوەژن مارە ناکرێ، هەتا ڕاوێژی پێنەکرێ، وە کچ مارە نابڕرێ، هەتا ڕەزامەندیی وەرنەگیرێ..

٤- هەروەها بوخاریی لەژێر ناوونیشانی (بابُ اذا زوَّجَ ابْنَتَهُ وهي كارهة فَنِكاحُهُ مَرْدودٌ)، واتە: (باسی ئەوە کە هەرکەسێك کچەکەی مارەبڕی لە یەکێك، کە پێی ڕازی نەبوو، ئەوە مارەبڕانەکەی هەڵوەشاوەیە)دا، ئەم فەرمایشتەی هێناوە: ((عن خَنْساءَ بنت خِذام الأنصارية أنَّ أباها زوَّجها وهي ثَيِّبٌ فكرِهَتْ ذلك، فأتَتْ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فَرَدَّ نِكاحَهُ)) ژمارە: ٥١٣٨.

واتە: خەنسائی کچی خیزامی ئەنصاریی گوتوویەتی: بابی بە بێوەژنیی لەکەسێکی مارەی بڕی، ئەویش پێی ناخۆش بوو، ئنجا هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەویش ئەو مارەکردنەی، کە بابی پێی هەڵسابوو، هەڵوەشاندنەوە.

ئێستاش با سەرنجی پایەو بنەمایەکانی خێزان بدەین و بزانین ئیسلام چۆن چۆنی بڕیاری داوە، کە ژن و مێرد پێکەوە ڕەفتار بکەن و، ماڵ و خێزان بەڕێوەبەرن؟!

## پـــایەکانی خێزان :

**یەکەم: یەکسانیی ژن و پیاو، لە: مرۆڤ بوون و، بەندەی خوابوون و، ئەرك و مافەکانیاندا:**

وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗ .. ﴾ (النساء-١).

واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن، کە لە یەك نەفس دروستی کردوون و، هەر لەو جۆرە نەفسەش هاوسەرەکەی دروست کردوە، وە پیاوان و ئافرەتانێکی زۆری لێ پەیداکردوون..

هەروەها فەرمووویەتی: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴾ (النساء- ١٢٤).

واتە: وە هەرکەسێك لە نێر یان مێ، کردەوە باشەکان بکات و بڕواداریش بێ، ئەوە ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە، هێندەی شوێنکەی سەرپشتی نێوکە خورما ستەمیان لێ ناکرێ..

**دووەم: خۆشەویستیی و بەزەیی دووسەرەی ژن ومێرد، بەرانبەر بە یەك:**

پایەیەکی دیکەی گرنگی خێزان لە ئیسلامدا، بریتیە لە یەکدی خۆشویستن و ڕێزو بەزەیی نواندنی ژن ومێرد بەرانبەر بە یەك، وەك خوا (عزّ وجلّ) فەرموویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً... ﴾ (الروم- ٢١).

واتە: وە لە نیشانەکانی - پەروەردگارێتیی - خوا، ئەوەیە کە لەخۆتان هاوسەرانێکی بۆ وەدیهێناون، تاکو بەهۆیانەوە ئارام بن، وە خۆشەویستیی و بەزەیی خستۆتە نێوانتانەوە...

کەواتە: یەکدی خۆشویستن و بەزەیی پێکدا هاتنەوەی ژن ومێرد، پایەیەکی گەورەو گرنگی خێزانەو، هەر لێرەشەوە دەزانین، کە یەکدی هەڵبژاردنی ژن ومێرد لەسەر بناغەی یەکدی ناسین و خۆشەویستیی، شتێکی ئاسایی و سروشتییە و، گرنگ ئەوەیە لە شیرازەی شەرع نەچێتەدەرێ و، نەکرێتە پاساو و بیانووی گوناهو تاوان.

**سێیەم: دابەشکردنی ئەرك و کارەکانی خێزان، بەگوێرەی پێکهاتەی سروشتی ژن و مێرد:**

هەرچەندە ئیسلام ژن و پیاوی لە: مرۆڤایەتیی و، بەندایەتیی بۆ خواو، بەرپرسیار بوون بەرانبەر بە دین و ژینی کۆمەڵگادا، وەك یەك داناوە، بەڵام بەگوێرەی جیاوازیی سروشت و کەسایەتیی هەرکام لە ژن ومێرد، ئەرك و

کارەکانیانی دیاریی کردوە، واتە: ئەرك و کارەکانی ژن وەك ژن و، مێرد وەك مێرد، لە چوارچێوەی بەڕێوەبردنی ماڵ و خێزاندا، ئەگەرنا، ئافرەتان و پیاوان کۆمەڵێك ئەرك و کارو چالاکی هاوبەشیشیان هەن، لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا، کە پێویستە بۆ ڕاپەڕاندنیان هاوکارو دەستبارگری یەکدی بن، وەك ئایەتی ژمارە (٧١)ی (التوبة) خستوویەتە ڕوو:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ... ﴾.

ئنجا ئەگەر بەگشتی سەرنجی ئەرك و کارە تایبەتییەکانی هەرکام لە ژن و پیاو بدەین، دەبینین ئەرك و کارەکانی پیاو، جگە لە سەرپەرشتیی کردنی خێزان، زیاتر لە دەرەوەی جوغزی ماڵدان و، هی ئافرەتیش بە زۆریی لەنێو بازنەی ماڵدان.

دیارە خوای کاربەجێ لە دابەشکردنی ئەرك و کارەکانی ژن و مێردیشدا پێکهاتەی سروشتیی هەر کامێکیانی ڕەچاو کردوە، بە نەفس و جەستە و عەقڵ و سۆزو.. هتدەوە، بۆ نموونە: ئەرکی بژێوو نشینگە (قوت و مسكن) پەیداکردن و مەسرەف کێشان، لە ئەستۆی پیاودایە، وەك خوا (عزّ وجلّ) فەرموویەتی:

﴿ ...وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ... ﴾ (البقرة- ٢٣٣).

واتە: وە ئەو پیاوەی کە بابی منداڵەکەیە، بژیوو پۆشاکی ئافرەتەکانی لەسەرە، بە شێوەیەکی باو و پەسند.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ... ﴾ (الطلاق- ٦).

واتە: هاوسەرەکانتان بەپێی هەبوونتان، لەو شوێنەدا نیشتەجێ بکەن، کە خۆتان تێیدا نیشتەجێن.

بەڵام ئەرکی شیر پێدان و کۆرپەو بەخێوکردنی (الرِّضاعة والحَضانة)ی بە ژن سپاردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ... ﴾ (البقرة- ٢٣٣).

واتە: وە دایکان دوو ساڵی تەواو شیر بەمنداڵەکانیان دەدەن، بۆ هەرکەسێك ویستی ماوەی شیر پێدان تەواو بکات..

دیارە حیکمەتی ئەو جیاکردنەوەیەش لە ئەرك و کارەکان دا، لەوە ئاشکراترە پێویستیی بە ڕوونکردنەوە بێ: ئایا هەموو پیاوانی دنیا توانای شیر پێدانی کۆرپەیەکیان هەیە، یان دەتوانن وەك پێویست بەخێوی بکەن؟!

وە ئایا ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەرماو گەرما ئێش و ژان و سەرئێشەکانی بژیو پەیداکردن و، ئەنجامدانی چەندان ئەرك و کاری قورسی وەك، ئاسنگەریی و فیتەریی و دارتاشیی و کرێکاریی و جوتیاریی و...هتد بە ئافرەتان دەکرێ؟! ئنجا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە زۆرێك لەوانەی بانگەشەی مافی مرۆڤ و ڕێز و حورمەتگرتن لە مرۆڤ دەکەن، بە کەمیی دەزانن کە ئەرکی سەرەکیی و هەرە گرنگی ئافرەت، بریتی بێ لە ڕاگرتنی ماڵ و بەخێوکردنی کۆرپە و منداڵ!!

بەڵام لەڕاستییدا ئەوجۆرە بیرکردنەوەیە هەڵەو سەقەتە، چونکە نابێ پەروەردەکردن و بەخێوکردنی منداڵ لە لایەن ژنەوە، بە کەمتر لە کارو کاسبیی و بازرگانیی و بژێو پەیداکردنی پیاو، تەماشا بکرێ، لەبەرئەوە کە هەرچی لە بوونەوەر دایە خوا (عزّ وجلّ) بۆ مرۆڤی دروستکردووە، ماقووڵ نیە دروستکردنی خانووبەرەو کەل وپەل و شمەك، لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی مرۆڤ، بە گرنگتر دابنرێ و، ئەگەر ئاوا بیر بکرێتەوە، مانای وایە مرۆڤ بەکەم سەیرکراوەو بێحورمەتیی پێکراوە!

هەڵبەتە هەر ئەو تەرزە بیرکردنەوە ماددییەشە، کە وای لە زۆربەی خەڵکی دنیا کردوە، لە بواری دروستکردنی کۆشك و باڵەخانەو ئامێری جۆراو جۆرو شمەك و کەل وپەلی زۆردا، زۆر بەرەوپێش بچن، بەڵام لە بواری ڕێزلێگرتنی مرۆڤ، پارێزگاریی لێکردنی نێوەڕۆکی مرۆڤانەیدا، چەندان فەرسەخ بەرەو پاش بچن!

**چوارەم: بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵ و خێزان، بەڕاوێژی ژن ومێردە:**

هەندێك كەس كاتێك فەرمایشتی خوا:

﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ .. ﴾ (النساء- ٣٤).

واتە: پیاوان سەرپەرشتیاری ژنانن، دەبیستن، وا دێتە زەینیانەوە، كە دەبێ پیاو لە ماڵدا كوێخایەتیی بكات و، بە هیچ جۆرێك ژن لە بەرانبەریدا ورتە نەكات! بەڵام ئەوە وانیەو، ئیسلام ڕاوێژ پێكەوە كردن (مشورة)ی ژن و پیاوی، كردوە بە بناغەی هەڵسووڕاندنی كاروباری ماڵ و خێزان، وە لەوبارەوە دەتوانین زۆر بەڵگان بێنینەوە، بۆ نموونە :

أ- خوای بەرزو مەزن ڕاوێژ (شوری) وەك بنەمایەكی گشتی كاروبار بەڕێوەبردنی مسوڵمانان داناوەو، فەرموویەتی: ﴿ ...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ... ﴾ (الشوری- ٣٨).

ب- هەروەها خوای زانا بڕیاری لەشیر بڕینەوەی كۆرپەی بەستۆتەوە بە ڕاوێژ پێكەوەكردنی دایك و بابی:

﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ ... فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا ... ﴾ (البقرة - ٢٣٣).

واتە: وە دایكان دوو ساڵی ڕەبەق شیر بەمنداڵەكانیان دەدەن. ئنجا ئەگەر ژن و مێرد ویستیان لەسەر بناغەی ڕازیبوون و ڕاوێژیان، لە شیری ببڕنەوە، ئەوە گوناهیان ناگات..

كەواتە: سەرپەرشتییكردن و چاودێرییكردنی ماڵ و خێزان لە لایەن پیاوەوە، مانای ئەوەنیە كە بە شێوەیەكی دیكتاتۆرانە ئەو كارە دەكات، بەڵكو پێویستە لەسەر بناغەی لێك تێگەیشتن و ڕاوێژپێكەوەكردنی ژن و مێرد، ماڵ و خێزان بەڕێوە ببرێ.

ئێستاش كە هەتا ڕاددیەك تیشكمان خستەسەر سروشت و پایەكانی خێزان، با سەرنجێكی خێرا لە چەند گرفت و نەخۆشییەك بدەین، كە لە بواری خێزاندا لەنێو كۆمەڵگاكەماندا كەم و زۆر هەن:

## چەند گرفت و نەخۆشییەك لە بواری خێزانیی دا:

سەرەتا دەڵێم: بێگومان ئەگەر بێت و، کۆمەڵگاکەمان لە بواری خێزانییدا پابەندی شەریعەتی ئیسلام بێت و، یاساو ئاڕاستەکانی قورئان و سوننەت بکاتە بناغەی هەڵس وکەوتی، زۆربەی هەرەزۆری گرفت و نەخۆشییەکانی، کە لەو بوارەدا پێیانەوە گرفتار بووە، چارەسەرو بنبڕ دەبن، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەو خێزانانەی لەنێو کۆمەڵگاکەماندا پەروەردەیەکی ئیسلامییان هەبووەو پابەندی شەریعەتن، دوورن لە زۆربەی هەرەزۆری ئەو گرفت و کێشەو نەخۆشییانەی، کە خەڵکێکی دیکەی دوور لە ئیسلام، گیرۆدەیان بووە.

### ١-کوشتنی ئافرەتان و خۆکوشتنیان:

ئەم گرفت و نەخۆشییە، کە خەریکە دەبێتە دیاردەیەکی بەربڵاوو، هەندێك کەس دەیانەوێ بە ناهەق لە ملی ئیسلامیی بپێچن، هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە هۆی لادان و دوورکەوتنەوە لە ئیسلامەوە، سەری هەڵداوەو تەشەنەی کردوە، چونکە:

أ- جاریٚ بە نسبەت کوشتنی ئافرەتانەوە، بە تۆمەتی داوێن پیسیی، دەتوانم بڵێم زۆربەی هەرەزۆری ئەو ئافرەتانە، ئەگەر بە پێی ئیسلام ڕەفتار بکرێ دروست نیە بکوژرێن، چونکە بە پێی بڕیاری شەریعەت، بە بێ بەڵگەو ئیسپاتی شەرعیی ڕوون و بێ چەندو چوون، دروست نیە هەر مرۆڤ تۆمەتباریش بکرێ، چ جای سزا بدرێ، بە تۆمەتی داوێن پیسیی، دیارە بەڵگەو ئیسپاتی شەرعییش لەوبارەوە تەنیا دوو شتە:

یەکەم: چوار شایەد، کە بە ڕوونیی ئەو گوناهەیان بینیبێ و، شایەدییەکی وەك یەکی لەسەر بدەن:

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً .. ﴾ (النور- ٤).

واته: وه ئەوانەی ئافرەتانی داوێنپاك تۆمەتبار دەكەن- به زینا- پاشان چوار شایەد ناهێنن، ئەوه هەشتا قەمچییان لێبدەن..

دووەم: دانپێداهێنانی بابای زیناكەر لەسەر خۆی.

وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوه له بەسەرهاتێكدا فەرموویەتی: ((... واغدُ يا أُنَيسُ الى امرأة هذا فإن اعترفَتْ، فارْجُمْها..)) بوخاریی به ژمارە: **٦٨٥٩**، ومسلم به ژمارە: **١٦٩٨** گێڕاویانەتەوه، واته: ئەی ئونەیس بچۆ لای ژنی ئەم پیاوه، ئنجا ئەگەر دانی پێداهێنا، بەردبارانی بكه...

ئنجا پێویسته بزانرێ، كه كوڕو كچی زیناكەر سزایەكەیان، یەكی سەد قەمچی یەو ناكوژرێن، وەك خوای زانا فەرموویەتی:

﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ... ﴾ (النور-٢).

واته: وه ئافرەتی زیناكەرو پیاوی زیناكەر، یەكی سەد قەمچییان لێبدەن...

بەڵكو بەشێك له زانایان ڕایان وایه، ئەو سەد قەمچییه سزای هەموو زیناكەرەكانه، چ كوڕو كچ بن، چ پیاو و ژنی هاوسەرگرتوو، هەڵبەته منیش ئەو ڕایەم بەلاوه بەهێزتره، چونكه ئایەتەكه بەگشتی باسی زیناكەران دەكات و، سزای بەردباران كردنیش، یان پێش هاتنه خوارەوەی ئایەتی (٢)ی (النور) بووه، یان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك تەمبێ كردن (تعزير)ێكی بازنەی سیاسەتی شەرعیی، ئەنجامی داوه[1].

ئنجا پێویسته بزانرێ، كه سزاو تۆڵەی داوێنپیسیی هەرچییەك بێ، پێویسته بەسەر نێرومێدا جێبەجێ بكرێ، نەك تەنیا ئافرەتەكه كه ڕەنگه بەزۆرییش دەستدرێژیی كرابێته سەر، سزا بدرێ، بەڵام كابرای داوێن پیس، وەك بەرزەكی بانان بۆی دەربچێ!

---

(١) له بەرگی حەوتەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا بەدرێژیی باسی ئەو مەسەلەیەمان كردوه.

ب- وە خۆکوشتنی ئافرەتانیش لە حاڵێکدا، کە دژو پێچەوانەی ئایەتی خوایە، چۆن دەگونجێ خەتایەکەی بخرێتە سەر ئیسلام؟! ئەوەتا خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿...وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ..﴾ (النساء- ٢٩). واتە: وە خۆتان مەکوژن!

ج- کەواتە: ڕاست و هەق ئەوەیە، کە هۆکاری سەرەکیی پەیدابوونی ئەو گرفت و کێشەیە، لە ئیسلام دوورکەوتنەوەیە، هەم لە ئیسلام دوورکەوتنەوەی ئەو خێزانانە، کە کوڕو کچەکانیان لەسەر عەقیدەو فیکرو عیبادەت و ئەخلاقی ئیسلامیی پەروەردە ناکەن!، وە هەم لە ئیسلام دوورکەوتنەوەی هەموو ئەو لایەن و دام و دەزگایانەی، کە بەردەوام ڕەواج بە داوێن پیسیی دەدەن و گەنجەکانی بۆ هاندەدەن!، وە هەم لە ئیسلام دوورکەوتنەوەی هەموو ئەوانەی، کە لەبەر نەشارەزاییان لە ئیسلام، یان پێوە پابەند نەبوونیانەوە، بە بیانووی بەرگریی کردن لە شەرەف و ناموس، هەموو سنوورەکانی شەریعەت دەبەزێنن و، سواری ئەسپی عاتیفەو دڵگەرمیی دەبن و، ئەوەی کە لە سووری تێیان دۆڕاندوە[1] تەمایانە لەلابا قەرەبووی بکەنەوە!

**٢- بەزۆرو بە نابەدڵیی بەشوودانی ئافرەتان:**

هەرچەندە ئەم گرفتە تارادەیەکی باش کەم بۆتەوە، بەڵام ئێستاش لەهەندێك شوێن و لەنێو هەندێك کۆمەڵ و تیرەدا هەرماوە.

ئاشکراشە کە ئەم ڕەفتارە، هیچ بنەمایەکی شەرعیی نیە، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد، بناغەی پێکەوەنانی خێزان لە ئیسلامدا، گرێبەستێکی ئازادانەو ئارەزوومەندانەی نێوان ژن و مێردە، جا لەبەرئەوەی پێشتر تیشکمان خستە سەر ئەم مەسەلەیە، لێرە بەم ئاماژەیە وازی لێ دێنین.

---

(١) کەسێك لەکاتی شەنەکردنی خەرمان دا و سوورکردنی و لەیەك جیاکردنەوەی (کا) و (دان) دا، دانەکەی بەدەم (با) وە چوویێ، دەڵێن: {لەسوور تێی دۆڕاندوە} ئنجا کەسی ئاوا، کە لەکاتی شەنەکردندا لێی نەزانیبێ و گەنمەکەی لەگەڵ (با) چوبێتە گەڵ (کا)، دواتر بەبێژینگ دانی سەرکوێزر و سەرکۆتەڵ، قەرەبووی گەنمەکەی بۆ ناکرێتەوە!

ئەوەندە دەڵێین: کە ڕەوا نیە ئیسلام بە ڕەفتار و هەڵس وکەوتی هەڵەی شوێنکەوتووانی یان تەنانەت فەتواو بڕیاری هەندێك لە زانایانیشی، کە لەگەڵ قورئان و سوننەت دا ناکۆکە، تاوانبار بکرێ، چونکە ماڵی قەڵب سەر بەساحێبیەتی و، قسەو بیروڕای زانایانیش بە بەڵگە ناهێنرێتەوە، بەڵکو پێویستە بەڵگەی لەسەر بهێنرێتەوە (أقوال العلما و يستَدلّ لها ولا يستدلّ بها)!

**٣- چەند جۆرە ستەمێك کە بەناوی ئیسلامەوە لە ئافرەتان کراون و ئیسلامیش لێیان بەریـیە:**

پێویستە وەك ڕاستییەکی تاڵ دانی پێدا بێنین، کە کۆمەڵگای کوردستانیی ئێمە، وەك زۆربەی هەرەزۆری کۆمەڵگاکانی مسوڵمان لەسەرتاسەری جیهانی ئیسلامدا، لە ئەنجامی نەشارەزایی لە قورئان و سوننەت و پێوە پابەند نەبوونیانەوە، لە بواری هەڵس وکەوت لەگەڵ ئافرەتدا، تووشی هەڵەو پەڵەو ستەمی زۆر بوون، بۆ نموونە:

أ- بەزۆرو بە نابەدڵیی بەشوودانی ئافرەت، کە وەك پێشتر باسمان کرد، پێچەوانەی قورئان و سوننەتە.

ب- بێبەشکردنی ئافرەت لە میرات، کە ئەمیش پێچەوانەی دەقی قورئانە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴾ (النساء- ٧).

واتە: پیاوان پشکیان هەیە لەو - میرات - ەدا کە باب و دایك و خزمان بەجێی دەهێڵن، وە ئافرەتانیش پشکیان هەیە لەو - میرات - ەدا کە باب و دایك و خزمان بەجێی دەهێڵن، چ کەم بێ، چ زۆر پشکێکی پێویست کراوە.

ج- تۆمەتبارکردنی ئافرەت و بەخراپ سەیرکردنی، هەر لەسەر ئەوە کە هەستی پێکراوە لەگەڵ ئەو کەسەی، کە ویستوویەتی بیخوازێ، یەکدییان بەدڵبووەو یەکدییان خۆشویستوە، بێئەوەی هیچ ناشەرعییەك ڕوویدابێ! کە بێگومان

ئەمە نەفامییە، چونکە پێم وانیە هیچ پیاوو ئافرەتێکی عاقڵ، ئامادەی هاوسەرگیریی بن، لەگەڵ کەسێکدا کە ئاشنای نین و بە لایانەوە پەسندو چاك نیە! هەربۆیەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێك یەکێك لەهاوەڵانی هەواڵی پێدا، کە ئافرەتێکی مەدینەیی خواستوە، پێی فەرموو: (أَنَظَرْتَ إليها؟!) ئایا تەماشات کردوە؟ گوتی: نەء، فەرمووی: (إذهب فانظر إِلَيها..) بچۆ تەماشای بکە. وەك (موسلیم) لە (ئەبو هورەیرە)وە هێناویەتی، بە ژمارە:١٤٢٤.

د- بەکەم سەیرکردن و حیساب بۆنەکردنی ئافرەت لە ژیان و گوزەرانی خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا، لە حاڵێکدا، کە خوای کاربەجێ ئافرەتانیشی وەك پیاوان بە مشوورخۆرو بەرپرسیاری کۆمەڵگا داناوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ... ﴾ (التوبة- ٧١).[١]

وە پێغەمبەری خواو جێنشینە سەر ڕاستەکانیشی بەشدارییان بە ئافرەتان کردوە لە هەموو کاروبارو چالاکییەکانی کۆمەڵگادا.

### ٤- یەکسانیی ئافرەتان و پیاوان و، ڕاستکردنەوەی بیرکردنەوەیەکی هەڵەو لار:

مەسەلەیەکی دیکە، کە لەم ڕۆژگارەدا وەك کێشەو گرفتێکی گەورەی ئافرەتان تەماشا دەکرێ و، بە هەق و ناهەق زۆر دەورووژێنرێ و قسەو باسی لەسەر دەکرێ، بریتیە لە یەکسانیی ئافرەتان و پیاوان، جا من هەوڵدەدەم لە چەند خاڵێکی کورت و گوشراودا، هەق و ناهەق و (دان) و (کا)ی ئەو مەسەلەیە لەیەك جیابکەمەوە:

---

(١) واتە: وەپیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار هەندێکیان مشوورخۆرو سەرپەرشتیاری هەندێکیانن...

أ- ئیسلام ئافرەت و پیاوی لەو ڕووەوە، كە هەردووكیان مرۆڤن و، خاوەنی یەك جۆرە نەفس و سروشتن، بە یەكسان و وەك یەك داناوە، وەك لە چەندان ئایەتی خوای زاناو شارەزادا خراوەتە ڕوو، بۆ نموونە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا... ﴾ (النساء- ١) كە پێشتر مانامان كردوە.

ب- هەروەها لەو ڕووەوە، كە هەردووكیان بەندەی خوان و پێویستە پابەندی شەریعەت بن و، كردەوەی باش بكەن، وەك یەكی داناون، وەك خوا فەرموویەتی:
﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ (النحل- ٩٧).

واتە: هەركەسێك لە نێر، یان مێ، كردەوەی چاك بكات و بڕواداریش بێ، ئەوە بە ژیانێكی پاك و چاك دەیژیەنین، وە بەگوێرەی چاكترین كردەوەشیان پاداشتیان دەدەینەوە.

ج- وە لەو ڕووەوە، كە دەبێ مشووری دین و ژینی كۆمەڵگایان بخۆن، دیسان یەكسانن، وەك ئایەتی ژمارە (٧١)ی (التوبة) ڕایگەیاندوە، كە پێشتر هێنامان و، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((ألا كلّكم راعٍ و كلّكم مسؤلٌ عن رعيّتِهِ..)) متفق علیه عن ابن عمر، واتە: ئاگاداربن! هەمووتان چاودێرن و، هەمووشتان بەرپرسیارن بەرانبەر بە كۆمەڵگاكەتان...

د- بەڵام ئایا یەكسان بوونی پیاو و ئافرەت، لە مرۆڤبوون و، بەندەی خوابوون و، بەرانبەر بە كۆمەڵگا بەرپرسیار بووندا، مانای وایە كە لە هەموو شتێكدا وەك یەكن و، هیچ جیاوازییەكی سروشتییان لە نێواندا نیە؟!

دیارە هەركەسێك بە (بەڵێ) وەڵام بداتەوە، پێش شەریعەتی خوا، عەقڵ و زانست و فیطرەت و واقیع، بەدرۆی دەخەنەوە، هیچ خاوەن عەقڵێكی سەلیم نیە، كە نكووڵیی لە یەكدی جیایی نێرو مێ بكات، چ لە ڕووی جەستەیی و ڕواڵەتییەوە، چ لە ڕووی دەروونیی و دیوی پەنهانیانەوە.

ئاشکراشە کە هەندێك کەس، بۆیە هێندە جەخت لەسەر مەسەلەی یەکسان بوونی ئافرەت و پیاو و، لە هەمووشتێکدا وەك یەکبوونیان دەکەنەوە، چونکە وادیارە پێیان وایە مێینایەتی (الأنوثة) کەمێتیی (نَقیصة)یە، یان پێیان وایە کە یەکسان بوونی ئافرەت و پیاو لە مافەکانیاندا، مسۆگەر نابێ بەبێ سەلماندنی وەك یەکبوونیان لە هەموو شتێك دا و، نکوولّیی کردن لە جیاوازییەکانیان!!

بەڵام بەڕاستی بەهەڵەدا چوون، چونکە نە نێرایەتیی (الذکورة) لە خودی خۆیدا پەسەندیی (فضیلة) و نەمێینایەتیی (الأنوثة)یش کەمێتییە، چونکە ماقووڵ نیە هۆی بەرزیی و نزمیی مرۆڤ، شتێك بێ، کە خۆی وەدەستی نەهێناوە!

ئنجا ڕێز و حورمەتی مرۆڤەکان و، دابینکردنی مافەکانیان، هیچ پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، کە لە هەموو شتێکدا وەك یەك بن، با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە:

ئاشکرایە کە پزیشك و ئەندازیار، کارو پسپۆڕییان لەیەك جیاوازە، جا ئایا بۆ ئەوەی یەکسان بن، پەکیان لەسەر ئەوە کەوتوە، کە واز لە کارو پسپۆڕیی تایبەتی خۆیان بێنن و، هەرکامیان کاری ئەوی دیکە بکات، یانی: ئەندازیارەکە کاری پزیشکیی بکات و، پزیشکەکەش کاری ئەندازیاریی بکات؟! بێگومان نەخێر، دیارە هەر لێرەشەوەیە، کە پێشینانمان گوتوویانە: (نان بۆ نانەواو، گۆشت بۆ قەساب).

کەواتــە:

یەکسانیی پیاوو ئافرەتیش لە مرۆڤایەتیی و، بەندایەتییان بۆ خواو، بەرپرسیارێتییان دایە، بەرانبەر بە دین و ژینی کۆمەڵگاو، بە هیچ جۆرێك ئافرەت بۆ ئەوەی یەکسان بێ لەگەڵ پیاودا، پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، کە نکوولّیی لە سروشتی مێینایەتیی خۆی و تایبەتمەندییەکانی بکات، یان واز لەکارو ئەرکی سروشتیی خۆی بێنێ و، خۆی لەو ئیش وکارانەوە هەڵقورتێنێ کە هی پیاون و، بە پیاو چاکتر دەکرێن، عەلی کوڕی ئەبووطاڵیبیش جوانی

گوتوە: (قيمة كل امريءٍ ما يُحْسِنُهُ)[١]، واتە: نرخ و ڕێزی هەر مرۆڤێك لەوەدایە، کە باشی بکات و چاکی لێبــزانێ، جا ئایا کاتێك ئافرەتان دەست لە ئەرك و کاری سروشتیی و بەرزو بەڕێزی خۆیان - کە دایکایەتییە - هەڵدەگرن و، دەکەونە ملبەملەو پێشبڕکە لەگەڵ پیاوان لە مەیدانی- بۆنموونە:- کارو کەسابەت و بازرگانیی و کرێکاریی و جوتیاریی و ...هتددا، دەتوانن ئیسپاتی شایستەیی و توانایی خۆیان بکەن و، ئیسپاتی بکەن، کە وەك پیاوانن و هیچیان لەوان جیاواز نیە؟!

بە تەئکید ئەگەر ئیشی پیاوان کردنە پیشە، مەرجی ئیسپاتی لێهاتوویی ئافرەتان بێت، زۆر لە پیاوان بەجێ دەمێنن، وەك چۆن ئەگەر ئیشی ئافرەتان کردنیش، بکرێتە بەڵگەی ئیسپاتی لێهاتوویی پیاوان، لە مەیداندا لە ئافرەتان بەجێ دەمێنن!

کەواتە: ڕاست ئەوەیە - وەك شەریعەتی خوا فەرموویەتی- کە پیاوان و ئافرەتان ئەرك و کارە هاوبەشەکانیان پێکەوەو بە هاوکاریی ئەنجام بدەن و، پاشان هەر کامێکیان بە ئەرك کارە سروشتییەکانی خۆی هەڵسێ و، پیاوان پیاوەتیی خۆیان و، ئافرەتانیش ژنایەتیی خۆیان لە بواری پسپۆڕیی خۆیاندا ئیسپات بکەن، ئیدی بەمجۆرە هەر کامێکیان ئیسپاتی شایستەیی و لێهاتوویی خۆیشی دەکات و، خزمەتی خێزان و کۆمەڵگایەکەشی دەکات!

### ٥- مەسەلەی چەند ژنیی و هەراوهۆریایەکی بێپاساو:

مەسەلەی چەند ژنەیی (تَعَدُّد الزوجات)و ڕەخنە لێگرتنی، یەکێکە لەو مەسەلانەی، کە لەم ڕۆژگارەدا بازاڕی گەرمە، جا دیارە من لێرەدا نامەوێ بچمە نێو وردەکارییەکانی ئەم مەسەلەیەو لە کتێبی: (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا)[٢] لەبارەیەوە دواوم، بەڵام لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بە چەند شتێك بکەم.

---

(١) بڕوانە: نهج البلاغة، ص٥٣٥ . ط ١٤٣٤ ه — ٢٠١٣م.

(٢) بڕوانە: چاپی دووەم / ٢٠٠٥، نووسینگەی تەفسیر، پاشان چاپی سێیەمیشی کرا. هەروەها بڕوانە بەرگی (٧)ی مەوسوعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، کە دەبێتە کتێبی (١١) لە چاپی دووەمی دا.

یەك: مەسەلەی چەند ژنیی یەکێکە لەو مەسەلانەی، کە شەریعەت بە ڕوونیی بە ڕەوای داناوەو، ناگونجێ کەسێك خۆی بەمسوڵمان بزانێ، یان بیەوێ بە مسوڵمان بزانرێ و، نکووڵیی لێ بکات و ڕەخنەی لێبگرێ، کەسێکیش مسوڵمان نەبێ، ئەوە بڕوای بەشتی گەورەتریش نیەو، حیسابێکی دیکەی جیاوازی هەیە.

دوو: شتێکی ناشایست و دزێوە، کە مسوڵمانان بەگشتی و بەتایبەت کەسانی زاناو شارەزا، لەژێر گوشاری کەسانێکی نارازیی بە شەریعەت و ڕەخنەگر لە یاساکانی داو، بۆ قایلکردنی چەند کەسێکی سیکۆلاریست، یاسای چەند ژنەیان لێ ببێتە بارو کۆڵێکی قورس و، نەزانن چۆن لە کۆڵی خۆیانی بکەنەوەو، بێنن بەندو مەرج (قید و شرط)ی وای بخەنەسەر، کە سەرەنجام لە نێوەڕۆك خاڵی ببێتەوە، بۆ نموونە: مەرجی ڕازی بوونی ژنی یەکەم، یان دووەم و سێیەم، چونکە خوای کاربەجێ، بێجگە لە دادگەریی، هیچ مەرجێکی دیکەی بۆ پیاوی چەند ژن هێن (مُعَدِّد) دانەناوە، وەك فەرموویەکی:

﴿ ...فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً ... ﴾ (النساء- ٣).

واتە: .. دەجا هاوسەرگیریی لەگەڵ ئافرەتانی پێشیاوتاندا بکەن، دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار، ئنجا ئەگەر ترسان دادگەریی نەکەن، با یەکێك بێ...

سێ: بێگومان بە هەڵەو نارێك بەکارهێنانی یاسا شەرعییەکان، لە لایەن مسوڵمانانی کرچ وکاڵەوە، شتێکی بینراوو زانراوەو، کەسانێکی وابوون و هەن، کە لە بواری چەند ژنەیی دا، تووشی هەڵەو لادان بوون، بەڵام دیارە بە هەڵەو ناڕاست بەکارهێنانی یاسایەکی شەرعیی، بەڵگەو پاساوی پەکخستن (تعطیل)ی نیەو پێویستە هەڵەو کەم وکووڕییەکان چارەسەر بکرێن، نەك یاساکانی شەریعەت پەك بخرێن.

چوار: ئێستاکە لەم ڕۆژگارەداو لە کۆمەڵگای ئێمەدا، مەسەلەی چەند ژنیی بۆتە شتێکی دەگمەن و، ڕەنگە لە سەد کەس، یەکێك لە ژنێکی زیاتر هەبێ، بۆیە هێندە ورووژاندنی و زەقکردنەوەی، شتێکی سەیرو بێپاساوە، دەبووایە ئەوانەی

بەتەنگ ئافرەتانەوەن و، هەمیشه شیوەنیان بۆ دەکەن، لەجیاتی ئەو مەسەلەیە، کە ئێستاکه شتێکی لاوەکیی یە، بێن بەجیددیی خەریکی چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانەی ئافرەتان بن، بەتایبەت ئافرەتانی دوور و بێبەش له پەروەردەی ئیسلامیی، که پشوویان پێ سوار کردووه و، خەریکن فززەیان لێ ببڕن، وەك:

١- دیاردەی داوێن پیسیی، که ئێستا نازانم بۆچی ناوی لێنراوه لەشفرۆشیی؟! چونکه ئەم وەسفه تایبەته به ئافرەتی داوێن پیسەوەو پیاوی داوێن پیس ناگرێتەوە، که دیاره ئەمەش ستەمێکی دیکەیە له ئافرەتان، چونکه بێگومان بێناموسیی و داوێن پیسییەکه، نێرو مێیەکه تێیدا بەشدارن و، بگره زۆرجاران خەتای نێره داوێن پیسەکەیە، که مێیەکه هەڵدەخەڵەتێنێ، یان ئیستغلالی دەکات، یان تەعدای لێدەکات!!

٢- دیاردەی ئیستغلالکردنی ئافرەتان و فریودانیان، لەلایەن کەسانێکی دەستڕۆیشتووی داوێن پیس و گەندەڵەوە، که ڕەنگه جاروبار شیوەنیش بۆ مافی ئافرەتان بگێڕن!

٣- دیاردەی خیانەتی هاوسەرێتیی، لەلایەن ژمارەیەك له پیاوان و ئافرەتانێکی لادەر له شەریعەت و فیطرەتەوە.

٤- کوشتنی ئافرەتان و خۆ کوشتنیان، که پێشتریش ئاماژەمان پێکرد.

بەڵێ، با دڵسۆزانی ئافرەتان، بەتایبەت ڕێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان، ئەگەر بەڕاستی دەیانەوێ بەرگریی له ئافرەتان بکەن و، کێشەو گرفتەکانیان چارەسەر بکەن، با بێن ئەو کێشەو گرفتانەیان بۆ چارەسەر بکەن و، چیدی کێشەو گرفتی گچکەو وەهمیی زل نەکەن و، کێشەو گرفته زل و واقیعییەکانیانی ئافرەتان لەبیر نەکەن، که له سەدا نەوەدو پێنجی، زیاتر دەگەڕێتەوه بۆ دووریی له خواو شەریعەت و، بڵاوبوونەوەی فەسادو بێبەندو باریی، لەلایەن تەوژمی سیکۆلاریست و، ئەو دەستەو تاقم و بانده ئارەزووپەرستانەی بوونەته دزو بازاڕی ئاڵۆزیان گەرەکە!

پێنج: ئنجا ئایا ئەوانەی دژایەتیی یاسای چەند ژنەیی دەکەن، بەدیلیان چیە لە حاڵێکدا، کە هەموومان دەزانین لە کۆمەڵگاکەماندا، بەهۆی سەری خۆ هەڵگرتنی کوڕە گەنجەکانمانەوە بەرەو هەندەران، ڕێژەی ئافرەتان زۆر لە هی پیاوان زیاترە؟!

**کۆتایی ئەم بوارەی دووەمەش، بە دوو قسەی خۆش دێنم:**

یەکەم: لە کتێبێکدا خوێندمەوە، کە لە یەکێك لەو وڵاتە مسوڵمان نشینانەدا، کە چەند ژنیی قەدەغە دەکەن، پیاوێك ژنی دووەم دێنێ و، کاتێك ئاسایش، یان پۆلیس پێدەزانێ، دێنەسەری و دەڵێن: بۆچی ژنی دووەمت هێناوە، نازانی قەدەغەیە؟! ئەویش دەڵێ: (إنّها خليلتي، وليست حليلتي)[1] واتە: ئەمە دۆستمە و ژنم نیە! ئەوانیش دەڵێن: دەباشە باش وامانزانی هاوسەرتە!

دووەم: لە زیندانی ئەمریکییەکاندا جارجار موناقەشەمان دەبوو، ڕۆژێکیان لێکۆڵەرەوە (مُحَقِّق)یەکیان گوتی: ئەوە بیستوومانە، کە تۆ کاتی خۆی دوو هاوسەرت هەبوون؟ گوتم: بەڵێ، ئنجا هیچ ئیشکالی تێدایە؟! گوتی، ئەدی چۆن ئەوە پێچەوانەی مافی ئافرەتە! گوتم: ئێمەی مسوڵمان نەك دوو ژن هەتا چوار ژنیشت هەبن، بە حەڵاڵیی، بەمەرجێك دادگەر بی، قەیناکات و پێچەوانەی مافی ئافرەت نیە، بەڵام یەك ئافرەتیش بە حەڕامیی دروست نیەو، مافی ئافرەتیش بەوە پێشێل دەکرێ، کە بە حەڕامیی لەگەڵی ڕابوێری و، پاشان پوولێکی پێوەبنێی و، کە منداڵیشی بوو، یان لەبەر خۆی بەرێ، یان فڕێی بدات، یان کە گەورە بوو، نەزانێ بە کێ بڵێ: بابە!

پاشان گوتم: ئێمەش و ئێوەش چەند ژنییمان هەر هەیە، بەڵام ئێمەی مسوڵمان چەند جیاوازییەکمان هەیە.

گوتی: چی وچی؟!

---

(١) (خليلة) واتە: ئافرەتێك کە بە حەڕامی لەگەڵی ڕادەبوێرێ، (حليلة)ش واتە: هاوسەر، ژنێکی حەڵاڵ.

گوتم: یەکەم: هی ئێمە بە پێی ئایینەکەمان حەڵاڵە، بەڵام هی ئێوە بەگوێرەی ئایینەکەی خۆشتان زیناو حەڕامە.

دووەم: هی ئێمە دووان و سیان و، ئەوپەڕی هەتا چوارەو زیاتر نیە، بەڵام هی ئێوە سنوورێکی نیە لێی بوەستێ!

سێیەم: هی ئێمە منداڵەکانمان باب و دایکیان دەناسن، بەڵام هی ئێوە بابیان ئەوە هیچ و، جاری وایە دایکیشیان ناناسن!!

ئیدی ماڵم هەقە، کابرا زاری بوو بە تەڵەی تەقیوو، هەر هێندەی بۆ مایەوە بڵێ: من تەنیا ژنێکم هەیەو زیناش ناکەم! منیش بە پێکەنینەوە گوتم: ئەگەر ڕاست بکەی، دیارە جەنابت پیاوێکی دەگمەنی لە ئەمریکا!!

ئێستاش نۆرەی بواری سێیەمی بابەتەکەمانە:

## بواری سێیەم: ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە کۆمەڵگا، لە بواری کۆمەڵایەتیی دا

وەك پێشتر باسمان کرد، کۆمەڵگایەکی تۆکمەو بەختەوەر، بەبێ خێزانە پوخت و نەختەکان و، تاك پاك و چاکەکان نایەتەدی، بەڵام دیارە لە بەرانبەریشدا: کۆمەڵگای تۆکمەو باشیش، کاریگەریی ئیجابیی لەسەر هەرکام لە خێزان و تاك هەیە.

ئنجا من پێم وایە، ئەرکی سەرشانی ئێمە لەم قۆناغ و هەل ومەرجەدا، بەرانبەر بەخەڵك و کۆمەڵگاکەمان، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، ئەوەیە کە بە هەمووڵایەکمان هەوڵ بدەین پایەو بنەڕەتە گرنگەکانی کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلیم و بەختەوەر، لەنێو کۆمەڵگاکەماندا بچەسپێنین و، شایانی باسیشە، کە من حەوت پایەو بنەڕەتیی گرنگ و سەرەکییم، لەبەر ڕۆشنیایی قورئان و سوننەتدا، دەستنیشان کردوون، کە پێویستە کۆمەڵگایەکی مسوڵمانیان لەسەر بنیات بنرێ:

## بنەمای یەکەم: کۆمەڵگای بەشەر، ڕەگ و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ یەك خێزان:

خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ (الحجرات- ١٣).

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێیەك وەدیهێناوەو، بۆ پێك ئاشنابوون، گێڕاومانن بە چەند گەل و تیرەیەك، بێگومان بەڕێزترتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە، بەدڵنیایی خوا زانای شارەزایە.

بەڵێ، لە ئیسلامدا مرۆڤایەتیی هەمووی هەڵقوڵاوی یەك چاوگەو، سەرجەم پیاوان و ئافرەتان و تێکڕای نێرو مێیەکانی بەشەر، ڕۆڵەی یەك خێزان و منداڵی یەك باب و دایکن، کە ئادەم و حەووان (سەلامی خوایان لێ بێ)، کەواتە: هیچ کەس بە هیچ بیانوو پاساوێکەوە، بۆی نیە خۆی بەسەر کەسێکی دیکەدا هەڵکێشێ و خۆی پێ لەو بەرزتر بێت، چ لەسەر ئاستی تاکەکان و، چ لەسەر ئاستی خێزان و بنەماڵەکان و، چ لەسەر ئاستی تیرەو عەشیرەت و گەل و نەتەوەکان.

**کەواتە:**

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: هەرکەسێك خۆی بەسەر یەکێکی دیکەدا هەڵکێشێ، بەهۆی ڕەنگ و زمانی، یان پارەو سامانی، یان وەجاخ و ڕەچەڵەکییەوە، ئەوە هەڵوێستێکی نەفامانەی نواندوە، هەربۆیەش کاتێك (أبوذر الغفاري) - خوا لێی ڕازی بێ - ڕەخنەی لە پیاوێك گرت، بەهۆی دایکییەوەو پێی گوت: (یا ابن السّوداء!) ئەی کوڕی ئافرەتە ڕەشەکە! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: (يا أباذر! أعيَّرتَهُ بِأُمِّهِ؟ إنَّك امرؤٌ فيك جاهلية...)، واتە: ئەی ئەبازەر! ئایا بەهۆی دایکییەوە عەیبت لێگرت ؟

بەڕاستیی تۆ کەسێکی نەفامییت تێدایە... وەك (بوخاریی) بە ژمارە: (٣٠) و (موسلیم) بە ژمارە: (١٦٦١) هێناویانە.

هەروەها (طبراني) گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەنێوەڕاستی ڕۆژەکانی (التشریق)دا بە سواری وشترێك، لە مینا وتاری داوەو فەرموویەتی:

((يا أيّها الناس ألا إنَّ ربّكم واحد، وانَّ أباكم واحد، ألا لا فَضْلَ لعربي على عَجَميّ، ولا لعجمي على عربي ولا لأسود على أحمر، ولا لأحمر على أسود، إلاّ بالتقوى، ألا هَلْ بَلَّغتْ؟ قالوا، نعم، قال: فليبُلِّغ الشاهِدُ على الغائِب)).

واتە: هۆ خەڵکینە! ئاگاداربن، بێگومان پەروەردگارتان یەکەو، باببیشتان یەکە، بزانن، کە عەرەب لە غەیرە عەرەب و، غەیرە عەرەب لە عەرەب و، ڕەش لەسپی و، سپی لە ڕەش، چاکتر نیە، مەگەر بە پارێزکاریی، ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ گوتیان: بەڵێ، فەمووی: دەجا با ئامادەبووان بە ئامادەنەبووانی ڕابگەیەنن.

## بنەمای دووەم: مسوڵمانان هەموویان یەكسانن و بەرزیی و نزمییان بەگوێرەی پارێزكارییە:

بەڵێ، لە كۆمەڵگایەكی مسوڵماندا، هیچ كەس بۆی نیە، بەهۆی ڕەچەڵەك وەجاخی، یان ماڵ و سامانی، یان ڕەنگ و دیمەنی، یان تیرەو حیزبی، یان پلەوپایەی سیاسیی و ئیداریی و كۆمەڵایەتییەوە، خۆی پێ لە هیچ كەس زیاترو بەرزتربێ، یان ماف و ئیمتیازێكی زیادە بەخۆی ڕەوا ببینێ، چونكە فەرمایشتی خوا: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾ ڕێ لە هەموو ئەو بیروبۆچوونانە دەگرێ، وەك لە كتێبی (سۆزی نەتەوایەتی)[1]دا بەدرێژیی باسم كردوە.

**وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە:**

* (( إنَّ الله لا ينظر الى صوركم وأموالكم، ولكن ينظر الى قلوبكم وأعمالكم)) رواه مسلم، بەژمارە: **٢٥٦٤**، واتە: بێگومان خوا تەماشای دیمەن و سامانەكانتان ناكات، بەڵكو سەرنجی دڵ و كردەوەكانتان دەدات.

* ((المسلمون تتكافأ دِماؤهم)) رواه أبوداود، واتە: مسوڵمانان خوێنیان یەكسانە.

دیارە پارێزكاریی (تقوى)یش بۆیە كراوەتە سەنگی مەحەكی حورمەت و ڕێزی لای خوا (سبحانه وتعالى)، چونكە هەموو مسوڵمانان بە وردو درشت و، نێرو مێ و، پیرو گەنج و، دەوڵەمەندو نەدارو.. هتدەوە، لە بەرانبەریدا یەكسانن و، هەموویان دەستیان دەیگاتێ.

پوختەی پێناسەی (تقوى)یش بریتیە لە: پابەندیی بە شەریعەتی خواوە، بە هەردووك دیوی ئەنجامدانی ئەركەكان و خۆ دوورگرتن لە قەدەغەكانەوە.

---

(١) بڕوانە: چاپی چوارەم/٢٠٠٥، نووسینگەی تەفسیر.

## بنەمای سێیەم: کۆمەڵگا بەگشتی سەرچاوەی دەسەڵاتە:

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گرنگ و گەورەی کۆمەڵگای ئیسلامییەو، لەنێو خەڵك و کۆمەڵگایەکی مسوڵماندا، هیچ کەس بەهۆی ڕەچەڵەك و وەجاخ و، ماڵ و سامان و، حیزب و مەزهەب و تایەفەو ...هتدەوە، پلەو ئیمتیاز بەسەر خەڵکی دیکەدا پەیدا ناکات و، ناتوانێ دەسەڵات بۆخۆی قۆرخ بکات، بەڵگەی سەلماندنی ئەم ڕاستییەش زۆرن، زەقترینیان ئەوەیە، کە خوای کاربەجێ هەمیشە کۆمەڵگای بڕوادارو مسوڵمانی مەدینەی - کە یەکەمین کۆمەڵگاو کیانی ئیسلامیی بووە - بە ڕستەی [يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا] ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، دواندوە و تەنانەت یەك جاریش نەیفەرمووە: (يَا أَيُّهَا العُلَماء)! یان (يَا أَيُّهَا الساسة)! تاکو هەموولایەك دڵنیا بن، کە خەڵك و جەماوەر سەرچاوەی دەسەڵاتن و، ئەوانن کە دەتوانن ڕەوایەتیی (شرعية) بە کاربەدەست و بەرپرسان بدەن، یان نا، وە ڕەوایەتییان لێ بستێننەوە، یان بیانهێڵنەوە.

**بنەمای چوارەم: پێکەوە تەباو ڕێك بوون و، هاوکاریی یەکدی کردن:**

بنەمایەکی دیکەی گەورەو گرنگی کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، بریتیە لە پێکەوە تەبابوون و هاوکاربوونیان و، نابێ بە هیچ بیانوو و پاساوێکەوە زەمینەی ناکۆکیی و دووبەرەکی خۆش بکەن، وەك خوای بێهاوتا فەرمووێەتی:

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ... ﴾ (آل عمران-١٠٣).

واتە: وەدەست بە ڕێسمانی خواوە بگرن و پەرتەوازە مەبن.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) کۆمەڵگای مسوڵمان بە دیوارێك دەچوێنێ، کە هەندێکی هەندێکی ڕاگیرو مەحکەم دەکات، وەك فەرمووێەتی:

((المؤمن للمؤمن كالبنيان يَشُدُّ بعضه بَعْضاً)) متفق عليه عن أبي موسى الأشعري.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەنیە، کە کۆمەڵگای مسوڵمان، ڕەخنە لە یەکدی گرتن و بیروڕای جیاوازو موونافەسەی تێدانیە! نەخێر، بەڵام نابێ شەڕو ناکۆکیی و شیروتیر لە یەکدی سوین و، لاقی یەکدی بڕینەوەو، پیلان لە دژی یەك گێڕان، هەبێ، وە پێویستە هەموولایەك بە میللەت و حکوومەتەوە، دەستبارگری یەکدی بن، بۆ هێنانەدی و چەسپاندنی ئامانجە باڵایەکان و بەرژەوەندییە گشتییەکان.

## بنەمای پێنجەم: بەزەیی بەیەکدا هاتنەوەو بۆ یەکدی دڵسۆزو بە پەرۆش بوون:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە پایەو بنەما گەورەکانی کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و، لەوبارەشەوە دەقی قورئان و سوننەت یەکجار زۆرن، بۆ نموونە:

* خوا (عزّ وجلّ) لە پێناسەو وەسفی کۆمەڵ و کۆمەڵگای بڕوادارادا فەرموویەتی:

﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ... ﴾ (التوبة-٧١).

کە پێشتریش هێنامان، وشەی (ولي)یش کە کۆیەکەی (أَوْلِيَاء)ە، مانای نیزیکیی و خۆشەویستیی و هاوکاریی و پشتگیریی کردن و دۆستایەتی، دەگەیەنێ.

* پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((الدين النَّصيحه))، واتە: دینداریی دڵسۆزییە، ئنجا کاتێك پرسیاری لێکراوە: دڵسۆزیی بۆ کێ؟! فەرموویەتی: (( لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامّتهم))، واتە: بۆ خواو کتێبەکەی و، پێغەمبەرەکەی و، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان و، بۆ تێکڕایان. (موسلیم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە: ٥٥.

* هەروەها فەرموویەتی: ((ما آمن بي، مَن بات شَبْعاناً وجارُهُ جائعٌ الى جَنْبِهِ وهو يَعلَمُ)) رواه الطبراني، واتە: ئەوکەسە ئیمانی بەمن نەهێناوە، کە بە تێریی شەوگار بەسەر دەبات، بەڵام دراوسێیەکی برسیی هەیەو، ئاگاشی لێیەتی!

**کەواتـــە:**

بابزانین کە مسوڵمانەتیی بەس نوێژکردن و ڕۆژووگرتن نیەو، ئەگەر بەتەنگ خەڵکی هەژارو برسیی و بێدەرەتانی خۆمانەوە نەبین، نیشانەیەکی پرسیاری گەورە لەسەر مسوڵمانەتییەکەمان دروست دەکەین، چونکە لەپێش فەرمایشتەکەی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) خوای دادگەر، کە باسی هۆکاری چوونە دۆزەخی بابای دۆزەخیی دەکات، دوو شتی کردوونە

هۆکار: یەکەم: بڕوا بە خوای مەزن نەهێنان، دووەم: هانی خەڵکی نەدان بۆ خواردن دان بە نەداران:

﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾ (الحاقە: ٣٣-٣٤).

واتە: بێگومان ئەو - کافرە - بڕوای بەخوای مەزن نەبوو. وە هانی خەڵکی نەدەدا لەسەر خواردن پێدانی نەدار.

## بنەمـای شەشــەم: پاکـیی دڵ و دەست و داوێن:

بەڵێ، بنەمایەکی دیکەی گرنگی کۆمەڵگای مسوڵمان، ئەوەیە کە تاکەکانی ئەندامەکانی دڵ و دەم و دەست و داوێنیان پاکەو، ڕێگا بە بڵاووبوونەوەو تەشەنەکردنی پیس و پۆخــەڵیی و دزیــی و گــەندەڵیی نـادەن، با سەرنجی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدەین، داخۆ چۆن چۆنی کۆمەڵگای مسوڵمانی یەکەم و، سەرجەم کۆمەڵگاکانی مسوڵمانانیش ڕێنمایی دەکات:

((لا تَحاسدوا ولا تناجشوا ولا تباغضوا ولا تدابروا ولا يَبِعْ بعضكم على بعضٍ، وكونوا عبادَ الله إخواناً: المسلمُ أخو المسلم لا يَظْلِمُهُ ولا يَخْذُلُهُ ولا يحقِرُهُ، التقوى ههنا ويشير الى صدره ثلاث مرات، بِحَسْب امريءِ من الشرِّ أنْ يَحقِرَ أخاهُ المسلم. كل المسلم على المسلم حَرامٌ: دَمُهُ و مالُهُ و عِرْضَهُ)) رواە مسلم، بە ژمارە: ٢٥٦٤.

واتە: ئێرەیی بەیەك مەبەن و، لە مامەڵەدا فێڵ لەیەك مەکەن، وە یەکدی مەبوغزێنن و، پشت لەیەك مەکەن، وە سەودا بەسەر سەودای یەکدییەوە مەکەن، وە ئەی بەندەکانی خوا! برابن، مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێناکات و، پشتی بەرنادات و، بەکەم تەماشای ناکات، پارێزکاریی لێرەدایە، وە سێ جاران ئاماژەی بە سینەی کرد، هەرکەسە ئەوەندە خراپەیەی بەسە، کە برای مسوڵمانی بەکەم بگرێ، هەموو شتێکی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان قەدەغەیە: خوێنی و سامانی و ئابڕووی.

بەڵێ، کۆمەڵگای مسوڵمان کۆمەڵگایەکی پاك و خاوێنەو، سەرجەم هاووڵاتییان، هەرکام لە: (ئایین و خوێن و ئابڕوو و عەقڵ و ئاساییش و وەچەو سامان)یان

سەلامەتەو، هەرکەسێك دەستدرێژیی بکاتە سەر هەر کام لەو حەوت شتانەی هەر هاووڵاتییەك، شەریعەت سزا و تۆڵەیەکی پڕ بە پێستی بۆ داناوە، کە لێرەدا مەودای خستنەڕوویانمان نیەو، لە چەند کتێب و نامیلکەیەدا باسمان کردوون، بۆ وێنە: کتێبی : ( چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)[١] نامیلکەی (سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك)[٢].

وە لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی: {ئیسلام و دەوڵەتداریی} داو، بەرگی هەشتەمی مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}[٣] دا، لێکۆڵینەوەیەکی باشمان لە بارەی ئەو سنوورە سزا شەرعییانەوە کردوە.

## بنەمای حەوتەم: تەبایی و پێکەوە ژیان، لە نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا:

کۆمەڵگای مسوڵمان، کۆمەڵگایەکی کراوەیە بەڕووی سەرجەم مرۆڤەکاندا، بۆیە کۆمەڵگای ئیسلامیی بە سروشت، کۆمەڵگایەکی چەند پێکهاتەو جۆراوجۆر (مُتَعدِّد (plural) ومُتَنَوِّع)ە، وە یەکەمین کۆمەڵگای ئیسلامیی، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بنیاتی نا، کۆمەڵگایەکی چەند پێکهاتەیی و جۆراوجۆر بوو.

**کەواتـــە:**

هەموو ئەوانەی وادەزانن کە ئیسلام تەحەممولی غەیری خۆی ناکات و کۆمەڵگای مسوڵمان کۆمەڵگایەکی داخراوو دەمارگیرە، با ئەو وەهمە لە مێشکی خۆیان دەربکەن، چونکە وێڕای چەندان دەقی قورئان و سوننەت، دژو پێچەوانەی واقیعی مێژوویی سێزدە سەدەیی دەوڵەت و کۆمەڵگا ئیسلامییەکانیشەو، لەسایەی کۆمەڵگا دەوڵەتی ئیسلامییدا، چەندان کەمایەتیی فیکریی و دینی وەك: (جوولەکە، نەصرانیی، مەجووسیی، بووژایی، بتپەرست، یەزیدیی...هتد)

---

(١) بڕوانە: چاپی شەشەم / ٢٠١٦.
(٢) بڕوانە: چاپی یەکەم/٢٠٠٧، نووسینگەی تەفسیر.
(٣) لە چاپی دووەمی دا بۆتە کتێبی (١١).

بە درێژایی چەندان سەدە، لەگەڵ مسوڵماناندا ژیاون و، مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا هیچ کەس، نەك هەر دەستدرێژیی نەکردۆتە سەریان، بگرە سەغڵەتیشی نەکردوون!

ئنجا ئایا ئەگەر تەبایی و پێکەوە ژیان و سەماحەت و سینگ فراوانیی، شتێکی ڕیشەدار نەبوایە لە ئیسلامدا، دەگونجا ئەو کەمایەتییە فیکریی و ئایینییانە، ئێستا ئاسارو پاسارییان مابایە؟!

کۆتایی ئەم باسەش بەم ئایەتە بەپێزە دێنین، کە بناغەی هەڵس و کەوتی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی، لەگەڵ نامسوڵمانانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، دیاریی دەکات:

﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ (الممتحنة- ٨).

واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات کە چاکەکارو بەخشەربن لەگەڵ ئەو - نامسوڵمان - انەدا، کە جەنگتان لەدژ ناکەن و، لە ماڵ و حاڵتان وەدەرتان نانێن، وە خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

شایانی باسیشە، کە لە بەشی حەوتەمی کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)دا تیشکێکی باشم خستۆتە سەر ئەم بابەتە.

لێرەشدا کۆتایی بەم بوارەی سێیەم دێنین و، دەگوازینەوە بۆ خستنەڕووی بواری چوارەم و کۆتایی بابەتەکەمان.

## بواری چوارەم: ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە کۆمەڵگا، لە بواری سیاسەت و دەوڵەتداریی دا

بە بۆچوونی بەندە، ئەگەر بمانەوێ ئەرکی سەرشانمان لەم قۆناغە گرنگ و هەستیارەدا، کە پێیدا ڕەت دەبین، بەرانبەر بە خەڵك و کۆمەڵگاکەمان جێبەجێ بکەین، لە بواری سیاسەت و دەوڵەتدارییدا، پێویستە هەموولایەك ئاگاداری ئەم پێنج بنەمایانە بین، کە هیچ قەوارەیەکی سیاسیی بەبێ ڕەچاوکردنیان بەڕێوە ناچێ:

**یەکەم: دەوڵەتداریی پێویستی بە عەقڵ و دڵێکی فراوانەوە، بە عەقڵی حیزبایەتیی و تیرەگەریی و بنەماڵەچییەتی، وڵات بەڕێوە نابرێ:**

بەڵێ، ئەگەر بمانەوێ لە ئەزموونی دەوڵەتداریی و حکوومەت بەڕێوەبردندا سەرکەوتوو بین، کە بەداخەوە هەتا ئێستا سەرکەوتنمان کەمبووە، پێویستە هەموولایەك، بەتایبەت بەرپرسانێك کە جڵەوی حوکم و سیاسەت و ئیدارەی وڵاتیان بەدەستەوەیە، واز لە عەقڵییەتی حیزبایەتیی و ناوچەگەریی و تیرەگەریی و بنەماڵەچییەتیی، بێنن و، عەقڵ و دڵی خۆیان هێندە فراوان بکەن، کە جێگای خەم لێخواردن و دڵسۆزیی و بەزەیی و پەرۆش نواندن بۆ تێکڕای هاووڵاتیانی تێدا ببێتەوە، بێ جیاوازیی خستنە نێوانیانەوەو فەرق پێکردنیان، بەهۆی ئینتمای فیکریی و سیاسیی و حیزبیی و، تەنانەت ئایینیشیانەوە!

چونکە ئەگەر حیزب تەنیا خەم لە ئەندامەکانی خۆی دەخوات و، سەرۆك تیرەو عەشیرەت، بەس لە بەرانبەر تیرەو عەشیرەتەکەیدا خۆی بەبەرپرسیار

دەزانێ و، سەرۆك و مشوورخۆری بنەماڵەش، تەنیا ئەندامانی بنەماڵەکەی چاوەڕوانییان لێی هەیە، ئەوە سەرۆك و بەرپرس و مشوورخۆری وڵات و دەوڵەت، سەرجەم هاووڵاتییان چاوەڕوانییان لێیانەوە، لە بەرانبەریشیاندا بەرپرسیارن!

ئنجا پێویستە هەمووڵایەکیشمان بزانین، کە لە وڵاتێکی وەك عێراق و هەرێمی کوردستانیشدا، ناگونجێ کەمینەیەکی زۆر خۆشگوزەران و بە ئیسراحەت و، زۆرینەیەکی بێزار و نارەحەت، پێکەوە هەتاسەر بژین، بەڵکو ئەوجۆرە بارودۆخ و هەل و مەرجە ناهاوسەنگانە، ئەگەر لێزانانە چارەسەر نەکرێن، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراوانە هەرەس دێنن، کە دیارە لە حاڵێکی واشدا هەمووڵایەك زیانبار دەبین.

**دووەم: پێویستە پێکهاتەکانی قەوارەی سیاسیی و دامەزراوەکانی، بوونی ڕاستەقینەیان هەبێ، ئەگەرنا خودی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی هەبوون، نیشانەی پرسیاری دەچێتەسەر:**

بەڵێ، کاتێك دەڵێین: دەوڵەت و حکوومەتمان هەیە، پێویستە بەکردەوەو لەسەر ئەرزی واقیع ئەو دامەزراوە (مؤسسة) و پێکهاتەنەمان هەبن، کە دەوڵەت و حکوومەتیان لێ پێك دێ، وە بە ئەندازەی ئەوەش کە پێکهاتەو دامەزراوەکان بوونی ڕاستەقینەو سەربەخۆیان دەبێ، چەمك و واتای قەوارەو حکوومەت هەبوون لە واقیعە سیاسییەکەماندا دێتەدی، ئەگەرنا وەك پێشینان گوتوویانە: (بە حەلوا حەلوا دەم شیرین نابێ!)، جا ئێمە لەسەرەتاو دەستپێکی ئەم بابەتەدا باسی ئەوەمان کرد، کە سوپاس بۆ خوا ئێمە هەر کام لە سێ پێکهێنەرە سەرەکییەکەی حکوومەتمان - بە مانا فراوانەکەی - هەن، کە: (ئەنجوومەنی یاسادانان و، دەستەڵاتی دادوەریی و، وەزارەتەکان)ن، بەڵام بێگومان هەر کام لەم سێ دامەزراوەیە، کەم وکووڕیی زۆریان تێدایەو، هیچ کەس ناتوانێ نکووڵیی لەو ڕاستییە بکا، کە هەتا ئێستاش حیزب - کە مەبەست هەردووك حیزبی حوکمڕانی پارتی و یەکیەتی یە- بەسەر هەموو شتێکدا زاڵەو، ئەوەی کە هەرکام لەو سێ دامەزراوەیە هەڵدەسووڕێنێ، ئیرادەی حیزبییە، نەك شتێکی دیکە!

ئنجا بێگومان هێشتنەوەی واقیعە سیاسییەکەمان، بەو شپرزەیی و ناڕێك و پێکییە، بە بیانووی ساوایی مان و، نائاسایی هەل ومەرجەکانمان، هیچ کەس ئیقناع ناکات و، هەموو کەسیش دەزانێ، کە هۆکاری بنەڕەتیی و سەرەکیی مانەوەی حاڵ وباڵی سیاسیی و ئیدارییمان بەوجۆرە، بەرژەوەندییە تایبەتییە حیزبیی و بنەماڵەیی و تاکییەکانن و (بەری خۆریش بە بێژینگ ناگیرێ) و چاکتر وایە هەمووڵایەکمان بەگشتی و هەردوو حیزبی حوکمڕان و، هەموو شت بۆخۆ قۆرخکەر، بەتایبەت، لەجیاتی ئەو جۆرە پاساوە بێهێزانە، بوێرانە بێینە مەیدانی چاکسازییەوەو، گرفتە گورچك بڕەکانمان چارەسەر بکەین، ئەگەر بە دەستبەرداربوون لە ئیمتیازو دەستکەوتەکانیش بێ، کە بە تەئکید زۆربەی هەرەزۆریان دەستکەوتی ناڕەواو ناشەرعیی و، بگرە نایاساییشن و، بێگومان بەبێ دەستبەرداربوونیشیان، حکوومەت و دامەزراوەکانی ناچەسپن و، زیاتر حاڵەتێکی شیعارییان، دەبێ، نەك کرداریی!

## سێیەم: کار پێسپاردن و لەخۆ نیزیك خستنەوەی کەسانی پسپۆڕو بوێر، نەك کەسانی هەر بە چەپڵەلێدان و بە بەڵێ قوربان کردن، فێر:

یەکێك لە گرفتەکانی حوکمڕان و دەستەڵاتداران ئەوەیە کە هەمیشە کەسانی خۆڕەپێشکەرو ماستاوچیی خۆیانیان لێ دەبەنە پێش و، دەست دەکەن بە مەدح و سەناو پێهەڵا گوتنیان و، سابوون لە بنی پێدانیان و، کڵاو لەسەرنانیان! بۆیە ئەگەر بەرپرس و حوکمڕانان دڵسۆزو وریا نەبن، هەر هێندە دەزانن دەوریان بەو جۆرە کەسانە تەنراوە، کە هەمیشە لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان، ڕەشیان بە سپیی و، سپییان بە ڕەش پێشان دەدەن و، وایان حاڵی دەکەن، کە هیچ عەیبیان نیەو، دنیا شامی شەریفەو، هەرگیز وەزع لەوە باشتر نابێ!

جا بابای حوکمڕان و بەرپرس، ئەگەر دڵسۆزو لێزان و وریا بێ، لەجیاتی ئەو جۆرە کەسانە، کەسانی مەعدەن پاك و بوێرو چاك لە خۆی نزیك دەخاتەوە، واتە لەجیاتی ئەهلی تەمەللوق، ئەهلی تەخەصصوص لەخۆی وەنزیك دەخات و، پاشان گوێیان بۆ دەگرێ و، لە شتی هەق و ڕاستدا بەقسەشیان دەکات.

شایانی باسیشە کە زانایانی ئیسلام، لەبەر تیشکی فەرمایشتی خوا، لەسەر زمانی یەکێك لە دوو کچەکانی پیاوە ساڵحەکەی مەدیەن:

﴿...يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ﴾ (القصص- ٢٦).

واتە: ئەی بابە! مووسا بەکرێ بە شوان بگرە، چونکە باشترین کەس، کە بەشوانیی بیگری، بابایەکی بەهێزی دەستپاکە - و مووساش وایە -، گوتوویانە: پێویستە هەرکەسێك کارێکی پێ بسپێرێ، هەم هێز (قوة)ی ڕاپەڕاندنی ئەو کارەو، هەم دەستپاکیی (أمانة)یشی هەبێ، چونکە هیچ کارێك بەبێ تواناو لێهاتوویی ناکرێ و، تواناو لێهاتووییش بەبێ دەستپاکیی داد نادات و، زۆر کەسی بەتوانا هەیە، کە بە هۆی تەماع و خیانەتەوە، کارەکەی زایە دەکات!

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە، کە بابای حوکمڕان و بەرپرس پێویستە جگە لە توانایی و شایستەیی، هیچ شتێکی دیکەی وەك خزمایەتیی و ناوچەگەرێتیی، لەکار پێسپاردنی بەرپرسانی ژێردەستیدا، ڕەچاو نەکات، فەرموویەتی:

((مَن وُلِّي من أَمرْ المسلمين شيئاً، فَوَلَّى رجُلاً وهو يَجِدُ من هو أَصْلَحُ للمسلمين منه فقد خانَ اللهَ ورسولَهُ))رواه الحاكم، واتە: هەرکەسێك ئەرکێکی مسوڵمانانی پێ بسپێرێ و، پیاوێك بکاتە کاربەدەست، کە لەو شایستەتری پێ شك بێ بۆ مسوڵمانان، ئەوە خیانەتی بەخواو پێغەمبەرەکەی کردوە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا، فەرموویەتی:

((مامِنْ راعٍ يَسْتَرعيه الله، يموت يوم يموت وهو غاشٌ لرعيَّتهِ، الاّ حرَّم الله عليه الجنّة)) متفق عليه. واتە: هەر حوکمڕانێك، خوا بیکاتە کاربەدەستی کۆمەڵێك و، لەکاتێکدا بمرێ، کە ناپاکیی لەگەڵیان کردوە، خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات.

هەڵبەتە هەر لێرەشدا پێویستە ئاماژە بەو ڕاستییەش بکەین، کە هەمیشە بابای حوکمڕان و کاربەدەست، خاوەنی چ جۆرە سروشت و مەعدەنێك بێ، هەر خەڵکی لەو جۆرەش لەخۆی کۆدەکاتەوە، چ چاك چ خراپ، عەرەبیش جوانیان گوتوە: (الطُّيور على أشكالِها تَقَع).

شاعیریش لەوبارەوە ڕاستی گوتوە کە دەڵێ:

لا تَسَـلْ عن المَرْءِ وسَلْ عن قرينه        فَكـــلُّ قرينٍ بالمقـــارن يقتدی

واتە: لە مرۆڤ مەپرسە کێیە، لەبارەی هاوەڵ و دەوروبەرەکەیەوە پرسیار بکە، چونکە هەرکەسە چاو لە هاوەڵ و نزیکی خۆی دەکات.

**کەواتە:**

هەرکات دەوروبەر (بطانة)یەکی باشمان لە نزیك کەسێکی بەرپرس و حوکمڕانەوە بینی، ئەوە مەگەر چۆن، ئەگەرنا، با دڵنیابین، کە خۆیشی باشەو، بە پێچەوانەوەش بە پێچەوانەوە، سەرنج بدە! بزانە گوڵ و چرۆ، جگە لە بولبول و هەنگ بەسەریەوە دەنیشن!، هەروەها پیسیی و کەلاکیش، جگە لە مێشەرِەشەو داڵ و خەرتەلیان بەسەرەوە دەبینی؟!

**چوارەم: بەرپرس و کاربەدەستان دەبێ، خۆیان بە خزمەتکاری خەڵك بزانن، نەك خۆیانیان لێ بگوڕێ و، پێیان وابێ خەڵك کۆیلەیەو ئەوان کوێخا:**

بەڵێ، بابای کاربەدەست و حوکمڕان، لە هەر ئاستێك دابێ، پێویستە ئەو ڕاستییە باش بزانێ، کە ئەو پایەو پلەو کورسی و دەستەڵاتەی پێیدراوە، لەئەسڵدا هی خەڵك و جەماوەرەو، وەك ئەمانەتێك تەسلیمی ویان کردوە، تاکو بەو هۆیەوە خزمەتیان بکات و، بەرژەوەندییەکانیان بۆ دابین بکا، وە نابێ پێی وابێ، هەر چونکە شوێنەکەی لە هی خەڵکی بڵندترە، لە هەموویان چاکترو بەرزترە!.

دیارە خاکێتیی و خۆ بەکەمگرتنیش لە هەموو کەس جوانە، بەڵام بەتایبەت بابای حوکمڕان و دەسترۆیشتوو لێی جوانترە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((... وما تواضع أحدٌ لله الاّ رَفَعَهُ الله)) رواه مسـلم، بەژمارە / ٢٥٨٨، واتە: وە هەرکەسێك لەبەر خوا خۆی بەکەم بگرێ، مسۆگەر خوا بەرزی دەکاتەوە.

ئەگەر سەرنجیشتان دابێ، هەمیشە کەسانی خاکیی و خۆبەکەمزان (مُتَواضع) لە دڵی خەڵکیدا شیرین و بەڕێزن و، بە پێچەوانەوە، کەسانی خۆبەزلگرو ڕووح زل، هەمیشە ڕەزاگران و بێزراون!

پاشان پێویستە هەموو لایەکیشمان ئەو ڕاستییە بزانین، کە هەرکەسە بە ئەندازەی ئەوە، کە لە خودی خۆیدا حورمەت و ڕێزی هەیە، ڕێز و حورمەتی خەڵکی دەگرێ و، وەك گوتراوە: (الهدايا على قدر مُهْدِيها) دیارییەکان بەگوێرەی خاوەنەکانیانن!

## پێنجەم: خەڵك و میللەت لەسەری پێویستە کە هاوکارو دەستبارگری حکوومەت و دامەزراوەو دام و دەزگاکانی بێت:

بەڵێ بەڕێزان!

خەڵك و میللەتیش بەگشتی لەسەری پێویستە، کە دڵسۆزو هاوکارو دەستبارگری حکوومەت و دامەزراوەکانی و دام ودەزگاکانی بێت، چونکە بێگومان هیچ حکوومەت و قەوارەیەکی سیاسیی، ناتوانێ بەبێ هاوکاریی و دڵسۆزی نواندنی خەڵك و جەماوەر، بە ئەرك و کارەکانی هەڵسێ.

هەڵبەتە دڵسۆزیی نواندنی خەڵك و جەماوەر بۆ حکوومەت و دامەزراوەو دام و دەزگاکانی و هاوکارییکردنی، پێش دەقەکانی قورئان و سوننەت، عەقڵ و مەنتیق دەیخوازن، چونکە عەقڵ و مەنتیق و ویژدان دەڵێن: پێویستە حکوومەتێکی دڵسۆز و خزمەتگوزاری خەڵك، سوپاس بکرێ و دڵسۆزیی بۆ بنوێنرێ و دەستباری چاکەی بۆ بگیرێ، چونکە بێگومان لە بەرانبەری چاکەدا، پێویستە هەر چاکە بکرێ:

﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ٦٠ ﴾(الرحمن- ٦٠).

ئنجا دەقی قورئان و سوننەتیش لەوبارەوە، کە پێویستە خەڵك و میللەت بەگوێرەی تواناو لە سنووری شەرع دا، هاوکارو دەستبارگری حکوومەت و دام و دەزگاکانی بێت، زۆرن بۆ نموونە:

* ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ... ﴾(النساء- ٥٩).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، وە هی کاربەدەستانێك، کە لەخۆتانن..

* ((على المرء المسلم السَّمع والطاعة فيما أَحَبَّ و كرِهَ إلاّ أن يُؤْمَرَ بِمَعصيةٍ فإذا أُمِرَ بِمَعصيةٍ، فلا سَمْعَ ولا طاعة)) متفق عليه، واتە: مرۆڤی مسوڵمان بیستن و فەرمانبەریی - بۆ بەرپرسانی خۆی- لەسەر پێویستە، لەوەدا کە حەزی لێدەکات و لەوەشدا، کە حەزی لێناکات، مەگەر فەرمانی بە سەرپێچیکردنی پێبکرێ، جا هەرکات فەرمانی پێکرا سەرپێچی بکات، ئەوە نەگوێڕایەڵیی و نەفەرمانبەریی دروست نیە.

بەڵام، پێویستە ئەوەش بزانرێ، کە ڕەخنەگرتنی بیناکەرو دڵسۆزانەو، قسەی هەق و ڕاست کردن لە ڕووی کاربەدەستاندا و، هەوڵدان بۆ ڕاستکردنەوەیان[1]، هیچ ناکۆکییەکی لەگەڵ ڕێزلێگرتن و فەرمانبەریی بۆکردنی حوکمڕان و کاربەدەستاندا نیە، بەڵکو ئەوەش بەشێکە لە دڵسۆزیی و هاوکاریی و پشتگیریی، وە لەڕاستیدا هەر کۆمەڵگایەك وایان لێهات نەتوانن و جورئەت نەکەن، دەستی بابای ستەمکار بگرن و، لە سنووری خۆیدا بیوەستێنن، ئەوە بە کۆمەڵگایەکی بێخێرو مردوو دادەنرێن، وەك پێشتریش باسمان کرد، وە پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

((إذا رأيت أُمَّتي تَهابُ الظالِمَ أن تقول لَهُ: إنَّك أنت الظالِمُ، فقد تُوَدِّع منهم)) رواه أحمد، واتە: هەرکات ئۆممەتمت بینی، نەیوێرا بەستەمکار بڵێ: تۆی ستەمکار! ئەوە حیسابیان ڕۆیشتوەو خێریان پێوە نەماوە.

دیارە هەر لێرەشەوەیە، کە حیکمەتی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، بۆچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قسەی هەق گوتنی لەلای حوکمڕانێکی ستەمکار، بە مەزنترین جیهاد لەقەڵەم داوە: ((إنَّ من أعظم الجهاد كلمة عَدْلٍ عندَ سُلطانٍ جائرٍ)) رواه الترمذي.

کۆتایی ئەم بواری چوارەم و کۆتاییەش، بەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دێنین، کە پێناسەی هەرکام لە حوکمڕان و کاربەدەستانی پەسندو چاك و، حوکمڕان و کاربەدەستانی ناپەسندو خراپمان، بۆ دەکات:

---

(١) کە هەرکام لە خۆپیشاندان (مظاهرة) و مانگرتن (إعتصام) و ڕێ پێوان (مسيرة)ش، شێوازو میکانیزمی ڕاست و ڕەوان لەو بوارەدا، بەمەرجێک بەشێوازی ڕاست و شارستانییانە بەڕێوە بچن.

((خیار أَئمتكم الّذین تحبّونهم و یحبّونكم، و تُصلّون علیهم ویُصلُّون علیكم، و شِرارُ أئمتِكم الّذین تُبْغِضونهم ویُبْغِضونكم، وتلعنونهم ویلعنونكم..)) رواه مسلم، بەژمارە: ١٨٥٥، واتە: چاكترین پێشەوایانتان (مەبەست حوكمڕان و كاربەدەستانە) ئەو كەسانەن، كە خۆشتان دەوێن و خۆشیان دەوێن و، بۆیان لەخوا دەپاڕێنەوەو بۆتان لەخوا دەپاڕێنەوە، وە خراپترین پێشەوایانتان ئەوانەن، كە ڕقتان لێیانەو ڕقیان لێتانەو، نەفرینیان لێدەكەن و نەفرینتان لێدەكەن.

كەواتە: سەنگی مەحەك و تەرازووی چاكیی و خراپیی، حوكمڕان و كاربەدەستان لە ئیسلامدا، ڕازیبوون و ڕازینەبوونی خەڵك و كۆمەڵگایە.

سا خوا بەكەرەمی بێسنووری خۆی میللەت و حكوومەتی ئێمە والێبكات، كە لەیەكدی ڕازی بن و، خۆشیی و بەختەوەریی یەكدی بەئاوات بخوازن، نەك بە پێچەوانەوە.

كە دیارە دەستپێشخەرییش، پێویستە لە كاربەدەست و حوكمڕانانەوە بێ، چونكە بێگومان ئەگەر ئەوان دڵسۆزو دادگەرو چاكەكار بن و، خزمەتی خەڵك و كۆمەڵگایان بكەن، حەتمەن خەڵكیش ڕازی و سوپاسگوزارو هاوكار دەبێ و، هەرچۆنیش بێ چەپڵە بە دەستێك لێنادرێ و، پێویستە هەموولایەك تەواوكەری یەكدی بین.

لێرەشدا كۆتایی بەم بابەتەمان دێنین و هیوادارم، كە بە هەوڵ و هیممەتی هەموولایەك بتوانین ئەو دەستكەوتانەی هەمانن بیانپارێزین و، چاكترو زیاتریان بكەین، وە قۆڵی مەردایەتییشی لێ هەڵبەكەین، بۆ پاكسازیی و چاكسازیی كردن لە هەرچوار بواری: تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیی و حوكمڕانیی داو، سەرەنجام بە هۆی خۆگۆڕین و خۆ چاككردنمانەوە، ئەم واقیع و هەل و مەرجەشمان بۆ بگۆڕێ، بە واقیع و هەل ومەرجێك، كە لە هەموو ڕوویێكەوە، شایستەی خەڵكێكی مسوڵمان بێت و، خوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەرورەرمان (صلی الله علیه وسلم)و خۆشمان بە هەموولایەكەوە، لێی ڕازی بین.

والسلام علیكم ورحمة الله وبركاتة

١٩ جمادى الأولى ١٤٢٩ ك
٢٥/ مایسی ٢٠٠٨ ز / شاری كۆیە هۆڵی ئۆسكار

# پێشەکی ئەم بەشە

**خوێنەری بەڕێز!**

بەمەبەستی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەم واقیعە نەخۆش و ناخۆش و قەیراناوییەی ئێستامان، لەبەرتیشکی ئایەتی:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ... ﴾ الإسراء -٩- دا. ماوەیەك لەقورئانەوە ڕامام و، سەرنجی ژمارەیەك لە ئایەتە بەپێزەکانیمداو، سەرەنجام ژمارەیەك بنەمای گەورەو گرنگم هەڵهێنجان، کە دڵنیام ڕەچاوکردن و پێوەپابەند بوونیان، مایەی دەربازبوونمانن "ئێمەی خەڵکی هەرێمی کوردستان"[١] لەم واقیع و بارودۆخە تاڵ و دژوارەی، خەریکە خەڵکێکی زۆر نائومێد دەکات و، بەقەناعەتی گەیشتنە بنبەست، دەگەیەنێ!

شایانی باسیشە ئەو بنەما قورئانییانە، کە ژمارەیان بیست و پێنج (٢٥) ە، هەرچەندە وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و، ئێمە لەداهاتوودا پێکەوە لەدوو توێی بەرهەمێکدا بڵاویان دەکەینەوە، بەڵام بەباشم زانی بۆ خێراتر گەیشتنیان بەژمارەیەکی زیاتری خوێنەران، سەرەتا بەدوای یەکدا لە لاپەڕەی تایبەتی خۆم لە (www.facebook.com/alibapir)دا دایانبەزێنم.

---

(١) هەڵبەتە ئەو بنەما قورئانییانە،گشتیین و، بۆ چارەی واقیعێکی دیکەی غەیری هەرێمی کوردستانیش، دەشێن، هەر بۆیەش زۆرجار باسی عێراقیش لەگەڵ خستنەڕووی بنەمایەکان دا تێکهەڵکێش دەکەین.

کاتی خۆشی لەساڵی (٢٠٠٨)دا، سێ وتارم لەبارەی واقیعی دژواری هەرێمی کوردستان و، چۆنیەتی چارەسەری کێشەو قەیرانەکانیەوە، لە دوو توێی کتێبێکدا بەناوی: (واقیعی هەرێمی کوردستان: دیدێکی ئیسلامییانە) بڵاوکردەوە، بەتەماشم پاش تەواوبوونی ئەم بنەما قورئانییانە، بیانخەمە نێو کتێبی ناوبراوەوە لەچاپی دووەمیدا.

هیواداریشم ئێوەی خوێنەری بەڕێز، بەتێبینیی و ڕەخنەو پێشنیارو سەرنجەکانتان، ئەم زنجیرەیە بەهێزو پێزتر بکەن و، بۆ ئەم ئیمێڵەی بنێرن: (Ameer.Maktab@Yahoo.com).

گومانیشی تێدانیە، کە ئەرکێکی شەرعیی و نیشتیمانیی هەر هاوڵاتییەکی هەرێمی کوردستانە، کە لەبارودۆخ و واقیعی نەخۆش و ناخۆشی قەوارە سیاسییەکەیەوە ڕانەمێنێ، بەڵکو هەرچی پێی دەکرێ بیکات و، درێغیی نەکات بۆ پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی و، ڕاستکردنەوەی باری لاری و، پێویستە لەم سێ ڕاستییەش دڵنیابین:

١- واقیعی خراپی ئێستامان، دەرەنجامی شێوەی خراپ و سەقەتی حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنی ڕابردوومانەو، بەبێ گۆڕانکاریی ڕیشەیی لەخۆماندا، واقیعە تاڵەکەمان ناگۆڕێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ...﴾ الرعد -١١-.

٢- هەتا زووتر دەست لەچارەسەرو گۆڕانکاریی بجووڵێنین، ئاسانتر دەبێ و تێچووی کەمتری دەوێ و، بەپێچەوانەشەوە، بەپێچەوانەوە.

٣- گرفت و کێشەکانمان هەرچەندە زۆربن و، قەیرانەکانمان هەرچەندە بێڕەزاو جۆراوجۆربن، ئیرادەی ئێمەی خەڵکی هەرێمی کوردستان، لەوان بەهێزترو باڵاترە، ئەگەر بەجیددیی بیخەینەکار.

ئیدی {لەئێمە حەرەکەت و لەخوا بەرەکەت}.

١٥ جمادي الأولى ١٤٣٦ك
٢٤ شوباتی ٢٠١٦ز / هەولێر

## بنەمای یەکەم

## بوونناسیی ئیسلامیی، خوازیاری ئازادیی و ماف و ڕێزی یەکسانە بۆ مرۆڤەکان

وشەی: بوونناسیی (معرفة الوجود ـ ontology)م لەجیاتی جیهانبینیی بەکارهێناوە، کە مەبەست پێی: ناسینی بوون (وجود) و زانیاریی هەبوونە لەبارەیەوە، مەبەستیش لە بوون (وجود) بەکورتیی: هەرکام لەخوای بەدیهێنەر (الله الخالق) و، سەرجەم بەدیهێنراوەکان (مخلوقات)یەتی.

**پوختەی بوونناسیی[1] ئیسلامییش، ئەوەیەکە:**

یەکەم: خوای بەرزی مەزنی بێ وێنە، سەرجەم دروستکراوەکانی بەسەرو خوارەوە، کە بە (السماء والأرض)، یان (السموات والأرض) تەعبیریان لێکراوە، بۆ ئەوە هێناونەدی، کە مرۆڤیان تێدا تاقی بکاتەوە و، پاشانیش لە قۆناغێکی دیکەدا، کە ڕۆژی دوایی (الیوم الآخر)ە، ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەیە وەربگرنەوە، بەژیانێکی نەبڕاوەی هەتا هەتایی، لەبەهەشت یان دۆزوخدا.

**ئەو ڕاستییە مەزنەش لە زۆر ئایەتی قورئانی بەڕێزدا خراوەتە ڕوو، بۆنموونە:**

١- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى

---

(١) بەرگی یەکەمی مەوسووعەی: (الإسلام کما یتجلی في کتاب الله) بۆ توێژینەوەی ئەو بابەتە گەورەو گرنگە تەرخان کراوە، لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی..)ییشدا پوختەیەکمان لێ خستۆتەڕوو.

ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ ﴾ هود -٧-.

واتە: وە (خوا) ئەو كەسەیە كە ئاسمانەكان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا (بەشەش قۆناغ) هێناونەدی، وەبارەگایەكەی لەسەر ئاوێ بوو، تاكو تاقیتان بكاتەوە: كامەتان كردەوەی باشترە! وە ئەگەر بڵێی: بەدڵنیایی دوای مردن زیندوو دەكرێنەوە (بۆ وەرگرتنەوەی پاداشت و سزا) ئەوانەی بێ بڕوان دەڵێن: ئەمە تەنیا جادوویەكی ئاشكرایە.

٢- ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية -١٣-.

واتە: وە (خوا) هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە، لەلایەن خۆیەوە بۆی ڕام و دەستەمۆ كردوون، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك بیربكەنەوە.

**دووەم:** خوای دادگەر بەگشتیی ڕێزی لە وەچەی ئادەم گرتوە و، لە چاكترین شێوەدا دروستی كردوون، بەبێ جیاكاریی بەهۆی ئایین و ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەكەوە:

﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴾ الإسراء -٧٠-.

**سێیەم:** خوای كاربەجێ مرۆڤی كردۆتە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، وە لەنێو هەموو دروستكراوەكانیدا، بۆ هەڵگرتنی سپاردە (أمانة)ی خۆی هەڵیبژاردوە:

﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ ... ﴾ البقرة -٣٠-.

﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴾ الأحزاب-٧٢-.

**چوارەم:** لە ڕووی ڕەچەڵەك (نَسَب)ەوە، هەموو مرۆڤەكان بەنێرو مێ وە، ڕۆڵەی باب و داكێكین، كە ئادەم و حەووان "سەلامی خوایان لێ بێ"، وەكامەیان

پارێزکارتر (مُتَّقي) بێ، لەلای خوا ڕێزی زیاترە، بەبێ جیاوازیی بەهۆی ڕەنگ و زمان و ڕەگەزو...هتدەوە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ الحجرات -١٣-.

ئێستاش لەبەر تیشکی ئەوچوار ڕاستییەی پێکهێنەری (بووناسیی ئیسلامیی)دا دەڵێین:

١- مادام خوای کار بەجێ تێکڕای بوون (وجود)ی بەسەرو خوارەوە، کردۆتە هۆڵی تێدا تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان و، هەموو دروستکراوەکانی بۆ سوودو بەهرەی هەموویان و بەبێ جیاوازیی، ڕام و دەستەمۆ کردوون.

٢- وە مادام خوا بەیەکسانیی و بەبێ جیاکاریی، ڕێزی لە وەچەی ئادەم و حەووا گرتوەو، لە باشترین شێوەدا دروستی کردوون.

٣- وە مادام خوا مرۆڤەکانی بەگشتی کردوونە خەلیفەی خۆی لەسەر زەوی و، سپاردەی خۆی خستۆتە سەر شانیان، لەنێو سەرجەم دروستکراوەکانیدا.

٤- وە مادام خوا تێکڕای خەڵکی بە هەموو هۆزو نەتەوەکانیانەوە و، بەجیاوازیی ڕەنگ و زمانەکانیانەوە، لە دایك و بابێك هێناونەدی و، بەڕێزترینیان لەلای: پارێزکارترینیانە.

**ئنجا مادام بەبێ:**

١- ئازادو سەربەست بوونی مرۆڤەکان و

٢- بۆ دابین کرانی سەرجەم مافەکانیان و

٣- پارێزرانی ڕێزو کەسایەتییان،

تاقیکرانەوەیان بۆ ئەنجام نادرێ و، خەلیفایەتیی خوایان بۆ ناکرێ و، سپاردەی خوایان بۆ هەڵناگیرێ، بۆیە:

(بووناسیی ئیسلامیی) خوازیاری ئەوەیە، کە تاك تاکی مرۆڤەکان لە: ئازادیی و، بۆ دابین کرانی مافەکانیان و، ڕێز و حورمەت پارێزرانیان دا، یەکسان و وەك یەك بن.

لەکاتی خستنە ڕووی بنەمایەکانی دیکەش دا، چۆنیەتی هۆکار بوونی ئەم بنەمایە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانمان لە هەرێمی کوردستان و عێراقیش دا زیاتر ڕوون دەبێتەوە و، لێرەش بەکورتیی دەڵێین: هەرکەس و لایەنێك ئازادیی و ماف و ڕێزی یەك مرۆڤیش پێشێل بکات، ئەو پێچەوانەی ئامانج و حیکمەتی خوا، لە دروستکردنی بوونەوەرو ژیان و مرۆڤدا، ڕەفتاری کردوە!

## بنەمای دووەم:
## خوا بەیەکگرتن (التوحید) خوازیاری یەکسان بوونی مرۆڤەکانە و، ڕێگرە لە پێشێلکردنی ئازادیی و ماف و کەرامەتیان

خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارییێتیی و پەرستراوییێتییدا (توحید الله في الخالقیة والربوبیة والألوهیة) کە بناغە و هەناوی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییە، وە خوا تێکڕای پێغەمبەرانی خۆی لە ئادەمەوە، تاکو خاتەم "علیهم السلام"، بۆ چەسپاندنی ڕەوانە کردوە:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾ الأنبیاء-٢٥-.

واتە: وە لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە: جگە لەمن، هیچ پەرستراوێك نیە، دەجا بەس من بپەرستن.

بەڵێ، خوا بەیەکگرتن، خوازیاری ئەوەیە، کە مرۆڤایەتیی بەهەموو نەتەوە و ڕەنگ و زمانانیانەوە و، بەهەردووك ڕەگەزی نێرو مێ وە، لەهەموو ڕوویێکەوە وەك یەك و یەکسانن و، بەهیچ جۆرێك بەرزیی و نزمیی و جیاوازیی یان لەنێواندا نیە و، هیچ تاك و بنەماڵە و هۆزو نەتەوە (فرد و عائلة وعشیرة و شعب) یێك لەئەسڵ دا پلە و ئیمتیازی، بەسەر تاك و بنەماڵە و هۆز و نەتەوەیەکی دیکە دانیە، چونکە خوای دادگەر هەموویانی "وێڕای ئەوەی کە لەڕووی ڕەچەڵەکەوە، لە باب و دایکێك هێناونەدی "بۆئەوە دروست کردوە، کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات-٥٦-.

کەواتە: بەندەی خوابوونی مرۆڤەکان و، تەنیا پەرستراو (معبود) بوونی خوا "سبحانه وتعالی"، خوازیار(مقتضي)ی یەکسان بوونیانە، لەهەموو ڕووێکەوە: چ لە ڕووی ئازادیی و ماف و ڕێزو حورمەتیانەوە، وە چ لەڕووی بەهرە وەرگرتنیان لە خێرو بێرو نازو نیعمەتەکانی سەرزەمینەوە، کە خوا بەڕاشکاویی فەرموویەتی: هەرچی لەزەمین دایە بۆ هەمووتانم دروستکردوە، بێ جیاوازیی:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا.... ﴾ البقرة-٢٩-.

ئنجا هەر لێرەشەوە دەزانین: بۆچی فیرعەون و نەمروود و حوکمڕانە خۆ سەپێنە خۆشگوزەرانەکان، هێندە بە پەیامی یەکتاپەرستانەی پێغەمبەرانی خوا قەڵس و نارەحەت بوونەو، بەهۆیەوە کێچیان کەوتۆتە کەوڵ ؟!

ئاخر ئەگەر بێت و خەڵك و جەماوەر، بیرۆکەی تەنیا پەرستراو بوونی خوا (توحیدالله) لەعەقڵ و دڵیدا بچەسپێ، بوار بۆ تاغووتەکان نامێنێ، لافی پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی (ربوبیة وألوهیة) بەسەر خەڵك دا لێبدەن و، فیرعەونانە بڵێن: ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾ النازعات-٢٤-، ﴿ ...مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرِى... ﴾! القصص-٣٨-

کەواتە: خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستن، وێڕای ئەوە کە گەورەترین ڕاستییە لە بوون (وجود) دا، باشترین کۆسپ و لەمپەریشە لەبەردەم حوکمڕاناندا، کە کەڵکەڵەی کوێخایەتییان بچێتە کەللەوە و، سەرەنجام خۆیان بەخاوەنی خەڵك و وڵات (عباد وبلاد) بزانن و، بەچاوی کۆیلە و خزمەتکاریش، تەماشای مرۆڤەکان بکەن و، لەئەنجامی ئەوەشدا، قۆرخکاریی و پاوانخوازیی بکەنە پیشە و، وڵات و کۆمەڵگا پڕبکەن لەقەیران و کێشەی زۆرو جۆراو جۆر!

ئنجا هەر لێرەشەوە دەزانین، بۆچی ئیسلام - دوا نوسخەی بەرنامە و هیدایەتی خوا بۆ مرۆڤایەتیی - وشەی بەرزی (لا اله الا الله)ی کردوە بەدروشمی خۆی!

چونکە (لا) شمشێرێکە ملی هەرچی پەرستراوی ساختەیە - لەشەیتان و مرۆڤ و حیزب و ڕژێم و دارو بەرد و ئەستێرە و ئارەزوو و....هتد - دەپەڕێنێ و، تەنیا پەرستراوێتیی بۆ خوای تاکە پەرستراوی ڕاستەقینەی شایستەی پەرستران، دەچەسپێنێ، هەر بۆیەش زانایانی ئیسلام ناویان لێناوە: (كلمة النَّفي والإثبات) وشەی لابردن و چەسپاندن!

**تەنیا پەرستنی خواش کاتێك دێتەدی کە مرۆڤ:**

ئەوپەڕی: خۆشویستن و، لێترسان و، پشت پێ بەستن و، بەگەورەو مەزن گرتن و، ملکەچکردنی، تەنیا بۆ خوا بێ.

هەروەها: جگە لەخوا پەرستن (عبادة غير اللّه)، کە هاوبەشدانان (شرك)ی پێدەگوترێ، بەوە دێتەدی کە مرۆڤ: ئەو پەڕی خۆشویستنی، یان لێترسانی، یان پشت پێ بەستنی، یان بەگەورەو مەزن گرتنی، یان مل بۆکەچکردنی، بۆ جگە لەخوا بێ.

## بنەمای سێیەم :

## خوا (سبحانه وتعالى) هەموو پێغەمبەرانی بۆ چەسپاندنی دادگەریی ناردوە، تاکو ڕێ لەستەم و چەوساندنەوە بگیرێ

بەڵێ، خوای دادگەر (عزّوجل) وەك چۆن لەئایەتی (٢٥)ی (الأنبياء)دا "کە لەبنەمای دووەمدا هێنامان" ڕایگەیاندوە، کە تێکڕای پێغەمبەرانی خۆی "عليهم السلام" - لەبواری پەیوەندیی مرۆڤەکان لەنێو خۆیاندا - بۆ ئەوە ناردوە کە مرۆڤەکان تەنیا خوا بپەرستن، واتە: ئەهلی تەوحید بن و، خۆیان لەشیرك دوور بگرن، بەهەمان شێوەش: لە ئایەتی (٢٥)ی (الحديد)دا، ڕایگەیاندوە کە سەرجەم پێغەمبەرانی خۆی "عليهم السلام" بەبەڵگە ڕوونەکان و بەکتێب و تەرازووەوە ڕەوانەکردوون، تاکو خەڵك بەدادگەریی (قسط) بەڕێوەبچن:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ... ﴾

(قسط)یش مانایەکەی لەوشەی (عَدْل)ەوە زۆر نیزیکە، بەڵام هاوواتا (مُتَرادِفْ) نین، چونکە وشەی (قسط) زیاتر بواری ماددیی و ئابووریی دەگرێتەوە و، وشەی (عَدْل)یش مانایەکەی گشتییە، یان زیاتر بواری مەعنەویی دەگرێتەوە.

دیارە دادگەریی و یەکسانیی (العدل والمساواة)یش ماناکانیان تاڕاددەیەکی زۆر تێکهەڵکێشن و، هەردووکیان پێچەوانەکەیان ستەم (ظلم)ە، هەر بۆیەش لەهەر شوێنێك دادگەریی و یەکسانیی هەبێ، ستەم و جیاکاریی نابێ.

هەڵبەتە ئەو دادگەرییەش، کە خوای کاربەجێ هەموو پێغەمبەرانی پایەبەرزی خۆی "علیهم السلام" بۆ چەسپاندنی ناردوە، گشتگیرە و تایبەت نیە بەلایەنێك و دووانەوە، بەڵکو سەرجەم بوارەکانی:

نەتەوەیی، سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، دەگرێتەوە.

ئنجا بەپێی ئەو بنچینە شەرعییەی زانایان لەسەری ڕێککەوتوون: (الأمر بالشيء، أمرٌ به وبكل ما هو متوقف عليه) واتە: فەرمانکردن بەشتێك، فەرمانکردنە بەخودی ئەو شتە و، بەهەرشتێکیش، کە ئەو پەکی لەسەری کەوتوە.

بۆ وێنە: فەرمانکردن بەنوێژ: فەرمانکردنیشە بەتارەت گرتن و، دەستنوێژ گرتن و، پۆشاکی خاوێن لەبەرکردن و، لەشوێنی پاك وەستانیش، چونکە نوێژکردن بەبێ هیچ کام لەوانە، دروست نیە.

بەڵێ، بەپێی ئەو بنچینە شەرعییە " کە لەهەمان کاتدا بنچینەیەکیی عەقڵییشە" هەموو ئەو هۆکار و ئامرازانەی، کە چەسپاندنی دادگەریی و، بەڕێوەچوونی خەڵك و کۆمەڵگا بەشێوەیەکی دادگەرانە، پەکیان لەسەریان دەکەوێ، دابین کردن و دەستەبەرکردنیان پێویست دەبێ، وەك:

١- هەبوونی سیستمێکی حوکمڕانیی تەندروست.
٢- بەدامەزراوەکردنی کارەکان.
٣- پابەندیی بەدەستوورەوە.
٤- سەروەریی یاساو.. هتد..

**کەواتـــە:**

**ئێمەی خەڵکی مسوڵمانی عێراق و هەرێمی کوردستانیش:**

١- مسوڵمان بوونمان.

٢- شوێنکەوتنمان بۆ پێغەمبەران "علیهم السلام" بەگشتیی و، پێغەمبەری کۆتایی (محمد) "صلی الله علیه وسلم" بەتایبەت.

٣- وە ئیمان هەبوونمان بەقورئان.

لەسەرمان پێویست دەکەن، کە هەوڵ و هیممەتمان بخەینەکار، بۆ چەسپاندنی ئەو دادگەرییەی، کە خوای میهرەبان تێکڕای پێغەمبەرانی خۆی بۆ چەسپاندنی ناردوە، وە بۆ فەڕاهەم هێنان و دەستەبەرکردنی، سەرجەم ئەو هۆکار و ئامڕازانەی، هاتنەدی دادگەریی لەسەریان وەستاوە، کە پێشتر باسمان کردن.

**ئنجا لەلایەکی دیکەشەوە:**

لەسۆنگەی ئەوەوە کە جێگرەوە (بدیل)ی دادگەریی، ستەم (ظلم)ە و ستەمیش قەدەغەکراوە، بگرە ستەمکاران لەلایەن خواوە لەعنەتیان لێکراوە:

﴿...أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هود -١٨-.

بۆیە جارێکی دیکەش لەسەر هەموولایەك پێویستە، هەوڵی هێنانەدی دادگەریی و، ڕیشەکێشکردنی دژ و پێچەوانەکەی بدەن، تاکو لەخەشم و تووڕەیی و نەفرینی خوا دووربن!

لەبنەمای چوارەمیشدا، باسێکی ستەم (ظلم) و بەرهەم و دەرهاویشتە شوومەکانی لەدنیا و دواڕۆژدا، دەکەین.

## بنەمای چوارەم :

## ستەمکاریی، هۆکاری نەفرینی خوا و ڕووخانی کۆمەڵگایە

ئەگەر بەهۆی دادگەرییەوە، خاوەن مافەکان بەمافی خۆیان دەگەن، لەسایەی شوومی ستەم (ظلم)دا، ستەمکاران مافەکانی خەڵکی پێشێل دەکەن، هەربۆیەش ئەگەر بەهۆی ڕووناکیی دادگەرییەوە، وڵات بۆ هەموولایەك فراوان و، ژیان و گوزەران ئاسان دەبێ، بەپێچەوانەوە: لەئەنجامی ستەم دا، نەك هەر وڵات، بگرە مرۆڤ چوار دیواری ماڵەکەی و، تەنانەت دڵ و سینەی خۆیشی لێ وەتەنگ دێ.

هەڵبەتە ستەمێکیش هێندە شووم و بەزەبر بێ، شتێکی چاوەڕوانکراوە، کە خوای دادگەر نەفرین لەخاوەنەکانی بکات و، ئیعلانی دژایەتیی لەگەڵدا کردنیان بکات:

﴿...أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ هود -١٨-.

ئنجا بەدڵنیاییشەوە: هەر کەس و کۆمەڵێك نەفرینی خوا ڕوویان تێبکات و بەرۆکیان بگرێ، هیچ خێرێکیان لێ هەڵناوەرێ و، هەموو نەگبەتیی و نەهامەتییەك شانیان دەگرێ.

هەر بۆیەش خوای کاربەجێ و شارەزا، لەچەندان شوێنی قورئاندا ڕایگەیاندوە، کە ئاوەدانیی وڵاتان بەدادگەرییەوە پەیوەستەو، لەئەنجامی ستەمکارییدا، هەرەس دێنن و، سەریان بەفەتارەت دەچێ، وەك فەرموویەتی:

﴿...وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ﴾ القصص -٥٩-.

واتە: وە ئێمە عادەتمان نیە ئاوەدانییەکان بفەوتێنین، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکاربێ.

هەربۆیەش خوای زانا و توانا، خەڵکی لەنێوان ئیمان و کوفردا ئازاد و سەرپشك کردوە:

﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ...﴾ الكهف -٢٩-.

واتە: وەبڵێ هەق لەپەروەردگارتانەوەیە، ئنجا کێ دەیەوێ بابڕوابێنێ و، کێش دەیەوێ با بێبڕوا بێ.

بەڵام بەهیچ جۆرێك ڕێی ستەمی نەداوە، چونکە خەڵك و کۆمەڵگا، دەگونجێ بەئیمان و کوفرەوە، پێکەوە بژین، بەڵام ستەم، هاوسەنگیی کۆمەڵگا تێك دەدا و شیرازەی دەپچڕێنێ، بۆیەش زانایانی ئیسلام لەمێژە گوتوویانە: (قد يدوم الملك مع الكفر، ولا يدوم مع الظلم) حوکمڕانیی بەکوفرەوە بەردەوام دەبێ، بەڵام بەستەمەوە دەوام ناکات.

دیارە ستەمیش زۆر جۆری هەن و، لەزۆر بواراندا بەرجەستە دەبێ: سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی..

**هەڵبەتە بەچەسپاندنی دادگەریی و ئامراز و هۆکارەکانیشی:**

سیستمی حوکمڕانیی تەندروست، دامەزراوەکان، سەروەریی یاسا.. هتد، ڕێ لە ستەم دەگیرێ، بەڵام پێویستە خەڵك و جەماوەریش ئازاد و ئازا و بوێربێ و بەدەنگی دلێر لەگەڵ ستەمکاران دا ڕوو بەڕووبێتەوە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: (سيد الشهداء حمزة، ورجل قام الى إمامٍ جائرٍ فأَمَرَهُ ونهاهُ، فقتله) رواه أبو داود.

واتە: سەروەری شەهیدان حەمزەیە، وە پیاوێکە لەحوکمڕانێکی ستەمکار هەڵدەستێ و، فەرمانی پێدەکات (بەچاکە) و ڕێگریی لێ دەکات (لەخراپە)، ئەویش دەیکوژێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" قسەی هەق و دادگەرانەکردنی لەڕووی حوکمڕانی ستەمکاردا، بەباشترین جیهاد داناوە: (إِنَّ من أعظم الجهاد كلمة عدلٍ عند سلطان جائر) رواه الترمذي.

وە بەپێچەوانەوە: پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" کۆمەڵگایەکی بەمردوو و بێ خێر لەقەڵەم داوە، کە جورئەت ناکات بەستەمکار بڵێ: تۆ ستەمکاری! وەك فەرموویەتی: (إذا رأيت أُمَّتي تَهَابُ الظالم أن تقول لَه: إنك أنت الظالم، فقد تودِّع منهم) رواه أحمد.

ئنجا شتێکی ئاشکراشە، کە کۆمەڵگای ئێمە لەمێژە - بەهۆی شێوەیەکی حوکمڕانیی سەقەتەوە، کە لەجیاتی دامەزراوەکانی: پەرلەمان و، دادوەریی، کە ڕەوایی لەئیرادەی خەڵك و جەماوەرەوە وەردەگرن، تاك و بنەماڵە و گرووپ و حیزب، باڵادەست و بڕیار بەدەستن - ستەمکارییەکی بێڕەزای جۆرا وجۆر بۆتە کابووسی سەرسینگی و، تەواو سەغڵەت و بێزاری کردوە.

بۆیە ئەرکێکی شەرعیی و نیشتمانیی سەرشانی هەموولایەکە، کە قۆڵی هیممەتی لێ هەڵماڵین، بۆ کۆتایی پێهێنانی ستەمکاریی و چەسپاندنی دادگەریی لەشوێنی دا، کە پێم وایە بۆ ئەم مەبەستەش، پێویستە سەرەتا بیروڕا و قەناعەتە هەڵەکانمان وەلا بنێین، چونکە بۆچوونی مرۆڤە، کە هەڵوێستی دیاریی دەکات و، کەسێك یان کۆمەڵێك بۆچوون (تصوّر)ی لار بێ، بێگومان ڕەفتار (تصرّف)یش هەر لار دەبێ.

ئامانجی سەرەکیی ئەم زنجیرەیەشم ڕاستکردنەوەی بیروقەناعەتە لار و هەڵەکانە، کە ئەم واقیعە لار و پڕ هەڵە و پەڵەیە، بەرهەم و دەرهاویشتەکەیانە.

لەبنەمای پێنجەمیشدا، باسی دوو بوارە سەرەکییەکەی تێدا بەرجەستە بوونی ستەم دەکەین، کە بریتین لە: دەسەڵات و سامان (السلطة والثروة).

## بنەمای پێنجەم :

## قۆرخكردنی دەسەڵات و دەست بەسەرداگرتنی سامان، دوو بەرجەستەكەری سەرەكیی ستەمن

وەك لەبنەمای چوارەم دا باسمان كرد: ستەم (ظلم) لەزۆر بواران دا بەرجەستە دەبێ، بگرە كاریگەریی خراپ لەسەر هەموو شتێك دادەنێ و، زەڕ و شوومی ستەم، ورد و درشتی ژیان و گوزەران و كۆمەڵگا دەگرێتەوە.

بەڵام بەپلەی یەكەم، ستەم: لە قۆرخكردنی حوكم و دەسەڵات و، پاوانكردن و دەست بەسەرداگرتنی ماڵ و سامانی وڵات دا، بەرجەستە دەبێ.

ئنجا هەر لێرەشەوە نهێنیی ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ، كە بۆچی سەرسەختترین دوژمن و ناحەزی پێغەمبەرانی خوا "علیهم الصلاة" و پەیام و بەرنامە دادگەرانە و ئازادیخوازەكەیان، لەژێر دوو ناوونیشانی:

١- خۆبەزلگران (المستكبرین).

٢- خۆشگوزەرانان (المترفین) دا،

خۆیان بینیوەتەوە؟! وەك لەم ئایەتانەوە دەردەكەوێ:

١- ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾ الأعراف -٨٨-.

واتە: ئەو دەمڕاستانەی خۆیان بەزل دەگرت لەگەلەكەی، گوتیان: ئەی شوعیب! خۆت و ئەوانەی بڕوایان لەگەڵت هێناوە، لەوڵاتەكەمان دەرتان دەكەین،

یان دەگەڕێنەوە نێو ئایینەکەمان.

٢- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ابراهيم -١٣-.

واتە: وە ئەوانەی بێبڕوابوون بەپێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: لەسەر زەمینی خۆمان وەدەرتان دەنێین، یان دەبێ بگەڕێنەوە نێو ئایینەکەمان، پەروەردگاریان پێیڕاگەیاندن: بێگومان ستەمکاران دەفەوتێنین.

٣-﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ سبأ -٣٤-.

واتە: وە هیچ ئاگادارکەرەوەیەکمان لەهیچ ئاوەدانییەکدا نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە بێبڕواین بەوەی پێی ڕەوانەکراون.

وەك دەبینن لەئایەتی (٨٨)ی (الأعراف)دا، دەمڕاست و حوکمڕانە خۆبەزلگر و خۆسەپێنەکانی گەلی مەدیەن، هەڕەشە لە (شعیب)ی پێغەمبەریان "علیه السلام" دەکەن، کە خۆی و بڕوادارانی شوێنکەوتووی شاربەدەر دەکەن، ئەگەر دەست بەرداری ئایین و بەرنامەکەیان نەبن!

وە لەئایەتی (١٣)ی (إبراهیم)دا، تێکڕای حوکمڕانانی کافری خۆسەپێن و ستەمکار، هەڕەشەی شاربەدەرکردن، یان هەڵگەڕانەوە لەبەرنامەی خوا و گەڕانەوە سەر ڕێبازی وان، لەتێکڕای پێغەمبەران "علیهم السلام" دەکەن، بەڵام سەرەنجام خوای دادگەر لەسەر پێغەمبەران و شوێنکەوتوانی چەوساوەیان وەدەنگ دێ و، موژدەی لەبەین بردنی حوکمڕانانی خۆسەپێن و ستەمکاریان پێدەدات: ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، هەڵبەتە لێرەدا خوای باڵادەست لەبەین بردنی ستەمکارانی، وەك عادەت و یاسا (سنة)یەکی بەردەوامی خۆی خستۆتەڕوو، واقیعی مێژووی بەشەریش بەجوانترین شێوە ئەو یاسایەی خوای بەرز و مەزنی تێدا بەرجەستەبووە.

وە لەئایەتی (٣٤)ی (سبأ)دا، خوای زانا و شارەزا ڕایدەگەیەنێ، کە هەمیشە چینی خۆشگوزەرانی شەپ و گوپ لێدەر، لەسەر حیسابی خەڵك و جەماوەری ڕەش و ڕووت و چەوسێنراوە، دوژمن و ناحەزانی پێغەمبەران و، پەرچ و لەمبەری سەرڕێیان بوون.

شایانی باسیشە کە (فرعون) - لەقورئانێ دا- ڕەمزی حوکمڕانی خۆسەپێن و ستەمکار (الحاکم المستبد الظالم)ە، بۆیەش بەسەرهاتەکەی زۆر دووبارە بۆتەوە بەشێوازی جۆرا وجۆر، چونکە خوای پەنهانزان زانیویەتی، کە شێوەی حوکمڕانیی فیرعەونانە، لەژێر ناوونیشانی جۆرا وجۆردا، لەژیانی مرۆڤدا بەردەوام دەبێ.

**پوختەی بیروڕای سیاسەتی فیرعەونیش، لەئایەتی (٢٩)ی (غافر)دا هاتوە:**

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾.

واتە: فیرعەون گوتی: تەنیا ئەوەتان بۆ پەسەند دەکەم، کە خۆم پێم باشە، وە من تەنیا ڕێی چاکتان پێشان دەدەم!

هەڵبەتە هەر ئەو جۆرە بیرکردنەوە و سیاسەتکردنەش، لەبابایەك چاوەڕێ دەکرێ، کە خۆی بەپەروەردگاری بەرزتری خەڵك و، پەرستراویان بزانێ:

﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾ النازعات -٢٤-.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرِى ﴾ القصص -٣٨-.

بەڵێ وێناکردن (تصّور) و بیرکردنەوەی مرۆڤە، کە جۆری هەڵس و کەوت (تصرّف) و ڕەفتاری دیاریی دەکات، بۆیەش لە گۆڕین و چاککردنی واقیعی پڕ ستەم و خراپەکاریی، حوکمڕانە خۆسەپێن و ستەمکارەکان، لە ڕاستکردنەوە و ڕیشەکێشکردنی بیروڕا و قەناعەتە چەوتەکانیانەوە دەست پێدەکات.

هەروەها (قارون)یش ڕەمزی کەسانی خۆشگوزەران و، دەست بەسەرداگری سامان و موڵکی خەڵك و جەماوەرە، وە (هامان)یش ڕەمزی کەسانی خەڵك

چەواشەکار و فریودەرە، وە هەمیشەش خۆشگوزەرانانی کۆکەرەوەی ماڵ و سامانی حەرام، لەگەڵ حوکمڕانانی خۆسەپێن دا، لەسەنگەرێکدان، دژی خەڵك و، کەین و بەینیان پێکەوە هەیە، هەروەها ڕاگەیاندنی وابەستە و دابەستەی چەواشەکار و ماستاوچیی و دەهۆڵکوتیش، لەخزمەت هەردووکیاندایە، بۆیەش خوای زانا و توانا، لەزۆر شوێنی قورئاندا، ناوی (فرعون) و (قارون) و (هامان) پێکەوە دێنێ، بۆ وێنە:

﴿وَقَـٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَـٰبِقِينَ﴾ العنكبوت -٣٩-.

دیارە (قارون) لەڕووی ڕەچەڵەکەوە، لەگەڵی چەوساوەی (بني إسرائيل) بووە، بەڵام بۆ ئەوەی لەپەنای دەستەڵاتی ناڕەوا و خۆسەپێنانەی فیرعەون دا، سامانی حەرام پەزمەندە بکات و وەسەرێك بنێ، لەگەڵە ستەمدیدەکەی هەڵگەڕایەوە و، دایە پاڵ فیرعەون و هامان و دار و دەستەکەیان:

﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ ...﴾ القصص -٧٦-.

(هامان)یش ڕۆڵی ڕاگەیاندنی چەواشەکاریی خەڵك و جەماوەر و، دەهۆڵ کوتی دەستەڵاتی خۆسەپێنی گێڕاوە:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَـٰهَـٰمَـٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَـٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَـٰبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَـٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَـٰذِبًا..﴾ غافر -٣٦، ٣٧-.

بەڵێ: سێکوچکەی: {فرعون، قارون، هامان}، ڕەمزە بۆ سێکوچکەی شوومی:

١- دەستەڵاتی قۆرخکراوی ناڕەوا.

٢- ماڵ و سامانی بەحەرامیی وەسەرێك نراو.

٣- ڕاگەیاندنی کرێگرتەی چەواشەکاری ماستاوچیی.

ئنجا لەحاڵێکدا، کە ئێمەش کۆمەڵگایەکی مسوڵمانین و، دەزانین خوای دادگەر چەندە ئەو سێکوچکە (ثالوث)ە شوومە: [فرعون، قارون، هامان] دەبوغزێنێ، دەبێ زۆر لەخۆمان وریابین، کە نەك هەر نەبینە بەشێکی پێکهاتەی ئەو سێکوچکە شووم (الثالوث المشئوم)ە، بەڵکو پێویستە هەموو هەوڵ و هیممەتیشمان بخەینەکار، بۆ ڕێگرتن لە: تەنانەت چەکەرەکردن و ڕوانی بیرۆکەی ئەو سێکوچکەیەش، چ جای سەرهەڵدانی لەسەر ئەرزی واقیع.

هەڵبەتە هەر ئەوەش حیکمەتی زۆر دووبارەکردنەوەی بەسەرهاتی مووسا و فیرعەونە، لەقورئانێدا: خوای کاربەجێ لەپشت ئەو بەسەرهاتەوە پێمان دەفەرموێ:

مەهێڵن بیرۆکەی فیرعەونایەتییتان لەنێودا دروست بێ و، هەرکات فیرعەونێك، یان چەند فیرعەونێکیش پەیدابوون، لەبەرنبەریان دا ببنە مووسا!

## بنەمای شەشەم :

## با سیمرغانە بیرنەکەینەوە:
## گۆڕانی واقیعمان، بەرهەمی خۆگۆڕینمانە!

هەموو لایەکمان کەم و زۆر، بیر لەچاککردن و گۆڕینی واقیع و بارودۆخی ناهەموار و پڕ گرفتاریی هەرێمەکەمان دەکەینەوە و، لەبارەیەوە دەدوێین، بەڵام کەمتروایە یەکێکمان بیر لەوە بکاتەوە، کە دەبێ خۆیشی بگۆڕێ و لەخۆیەوە دەست پێ بکات!

ئنجا ئەم حاڵەتەمان، بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی پڕپەند، دێنێتەوە یاد، کە هەوڵ دەدەم زۆر بەکورتیی بیگێڕمەوە:

دوای ئەوەی باڵندەکان گوێ بیستی ئەوە دەبن، کە باڵندەیەك هەیە لەپشت کێوی (قاف) بەناوی (سیمرغ)کە پادشای سەرجەم باڵندانە، لەنێوخۆیاندا ڕێك دەکەون، کە سی (٣٠) دانە باڵندە (مەل) بەنوێنەرایەتیی سی (٣٠) جۆر لەباڵندان وەك: قاز مراویی، کۆتر، لەقلەق، کەو...هتد، پێکەوە بەڕێ بکەون، بەرەو کێوی قاف، بەمەبەستی دیداری سیمرغ.

ئیدی ئەو سی باڵندەیە، بەڕێ دەکەون و، هەر دەڕۆن و دەڕۆن، هەتا ماوەیەکی زۆر دەبڕن، بەڵام هیچ سەر وسۆراخی کێوی قاف و سیمرغ دیارنابێ، پاشان لەنێوخۆیان دا دەکەونە ڕاوێژ و بیرکردنەوە و، سەرەنجام دەگەنە ئەو قەناعەتە، کە نەکێوێك هەیە بەناوی (قاف) و، نەباڵندەیەکیش بەناوی (سیمرغ)، بەڵکو سیمرغ (سی مرغ: سی باڵندە) هەرخۆیانن!

ئنجا ئێمەش خۆمان پێکهێنەری واقیعەکەی خۆمانین و، هەر گۆڕانکارییەکمان بوێ، لەواقیعی هەرێمەکەماندا ڕووبدات، دەبێ لەخۆماندا بیکەین و، هەرکامێکیشمان لەخۆیەوە دەست پێ بکات.

خوای کاربەجێ و زانا لەوبارەوە، فەرمووبەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ...﴾ الرعد -١١-.

واتە: بەدڵنیاییی خوا واقیع و حاڵی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ، تاکو ئەوان حاڵ و باڵی خودی خۆیان نەگۆڕن..

**مەبەستیش لە (مابأنفسهم) بەگشتی سێ شتە:**

١- بیر وبۆچوونەکانی عەقڵ و هۆش.

٢- هەست و سۆزەکانی دڵ و دەروون.

٣- ئاکار و ڕەفتارە پەنهان و ڕواڵەتەکان.

بەڵێ، بێگومان واقیع و بارودۆخی چاك، یان خراپی هەر گەل و کۆمەڵگایەك، ڕەنگدانەوەو زادە و بەرهەمی بیرۆکەکان و، هەست و سۆزەکان و، ئاکارەکان (الأفکار والعواطف والسلوکیات)یانە، وەهەر کۆمەڵگایەك بیەوێ گۆڕانکاریی لە واقیعی خۆیدا بکات، دەبێ لەخۆگۆڕینەوە دەست پێ بکات، با وێنەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست بێنینەوە:

لەکۆمەڵگای ئێمەدا، کە ستەم و قۆرخکاریی لەهەردووك بواری: حوکم و سیاسەت و، ماڵ و سامان دا، هاوسەنگیی و شیرازەی کۆمەڵگای تێکداوە و، خەریکە تەواو فزرە لەچینی هەژار و نەدار ببڕێ و، بەبەردەوامیی لەڕووی حوکمڕانییەوە: قۆرخکاریی و خۆسەپاندن، ڕێژەکەی هەڵدەکشێ و، لەڕووی ئابوورییشەوە، ژمارەی هەژارەکان زۆرتر و دەرامەتیان کەمتر و، ژمارەی ساماندارەکان کەمتر و سامانەکانیان زیاتر دەبێ، لەحاڵێکدا کە خۆمان بەکۆمەڵگایەکی مسوڵمان دادەنێین و، خوای کاربەجێش بۆ مسوڵمانانی دیاریی کردوە، کە دەبێ هەرکام لە:

١- دەستەڵات (السلطة).

٢- سامان (ثروة).

دووربن لەقۆرخکاریی و، لەنێوان خەڵکدا دەستاو دەست (مداولة)یان پێ بکرێ: وەك لەبارەی دەستاو دەست پێکردنی دەستەڵاتەوە، فەرمووویەتی:

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ... ﴾ آل عمران -١٤٠-.

وە لەبارەی قۆرخ نەکرانی سامانەوە، لەدەستی دەوڵەمەنداندا، فەرمووویەتی:

﴿ ... كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ... ﴾ الحشر -٧-.

ئنجا ئەگەر بویسترێ، ئەو واقیعە دەستەڵات و سامانەی تێدا قۆرخکراوە، لەلایەن چەند کەسێکی کەمەوە، بگۆڕرێ، پێویستە سەرەتا:

**یەکەم:** قۆرخکارەکانی دستەڵات و سامان، بیر وڕا و قەناعەتە هەڵەکانی نێو عەقڵ و هۆشیان و، هەست و خولیا بێ ویژدانییەکانی نێو دڵ و دەروونیان و، ئاکار و خەسڵەتە پەنهان و ڕواڵەتەکانیان، کە بوونەتە زەمینەخۆشکەری قۆرخکارییەکەیان، بگۆڕن و بەخۆیان دابچنەوە و، دڵنیابن - وەك لەبنەمای یەکەم و دووەم دا خستمانەڕوو - کە هاوولاتییانی دیکەش، وەك ئەوان و بێ کەم و زیاد، مرۆڤن و، هەقیان نیە کەڵکەڵەی هەبوونی هیچ جۆرە پلە و ئیمتیازێکیان لەکەللەدا هەبێ بەسەریانەوە، وە هەر ئەندازەیەك لە دەستەڵات و سامانیان، بەشێوازێکی ناڕەوا دەست بەسەردا گرتبێ و قۆرخ کردبێ، پێیان حەرامە و بەستەمکار (ظالم) دادەنرێن و، ستەمکارانیش لەدنیا و دوارۆژدا سەرەنجامیان ڕیسوایی و سەربەفەتارەت چوونە، وەك خوای دادگەر فەرمووویەتی:

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ .... ﴾ یونس -١٣-.

واتە: وە بێگومان سەدەکانی پێش ئێوەمان، بەهۆی ستەمەوە فەوتاندن..

**دووەم:** هەروەها پێویستە خەڵك و جەماوەری چەوساوە و بەشخوراویش: عەقڵ و هۆشی خۆی هۆشیار و، دڵ و دەروونی بێدار بکاتەوە و، خۆی لەئاکار و خو و خدەی

نزم و پەست بژار بکات و، ئەو ڕێز و حورمەتە، کە خوا لێیناوە و، ئەو پلە وپایە بەرزە کە پێیداوە، کە جێنیشینایەتیی خوا کردنە لەسەر زەوی، لەخۆیدا بیپارێزێ و، ڕێ بەهیچ کەس و لایەنێك نەدات، کە بەچاوی کۆیلە و خزمەتکار سەیری بکات و، ماف و کەرامەت و ئازادییەکانی پێشێل بکات، وە دڵنیابن کە وەك چۆن ستەمکاران لەسەر ستەمکردنەکەیان، گوناهبار و سزابارن، ستەملێکراوانی ملکەچکەریش، لەسەرر ڕازیبوونیان بەستەمدیدەیی و بەشخوراویی، گوناهبار و سزاباردەبن، چونکە خوای دادگەر هەرکام لەستەمکردن و ستەم قبووڵکردنی، قەدەغەکردوون، وەك فەرموویەتی:

﴿...لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ﴾ البقرة -٢٧٩-.

واتە: نەستەم بکەن و نەباستەمیشتان لێبکرێ.

هەروەها خوای باڵادەست و زاڵ، وەك چۆن حوکمڕانانی خۆسەپێنی ستەمکار، دووقات سزا دەدات، بەهەمان شێوەش شوێنکەوتووانی ملکەچکەر بۆ ستەمکارانیش، دووقات سزا دەدات، وەك فەرموویەتی:

﴿..حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ﴾ الأعراف -٣٨-.

واتە: هەتا کاتێك کە هەموویان خڕکرانەوە سەریەك، شوێن کەوتووەکان بەپێشکەوتووەکانیان گوت: پەروەردگارمان! ئەوانە گومڕایان کردین، بۆیە دووقات سزایان بدە لەئاگر - ی دۆزەخ - دا، (خوا) فەرمووی: بۆ هەرکامتان (سزای) دووقات هەیە، بەڵام نازانن.

دیارە ئەگەر سزای دووقاتی سەرکردە ستەمکارەکان، لەبەرانبەر خراپە و ستەمی خۆیان و شوێنکەوتوانیشیانە، سزای دووقاتی شوێنکەوتوە فریوخواردوە ملکەچەکانیش، لەبەرانبەر خراپەی خۆیان و، لەبەرانبەر ئەوەش دایە، کە ئەو ملهوڕانەیان لەسەر خۆیان و خەڵك کردۆتە گەورە و سەروەر و، بەدەستی خۆیان ڕێشمەی وانیان خستۆتە گەردنیان و، باری ئەوانیان خستۆتە سەرپشتیان!

بۆیە ئەوانیش وەك سەرکردە ستەمکارەکان، موستەهەقی سزای دووقاتن!

بەدڵنیاییشەوە: خەڵك و کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، ئەگەر هەر تۆزێك لەو ئایەتە قورئانییانە ڕامێنێ، کە باسی سەرەنجامی شوومی ستەمکاریی و، ستەمکارانی ملهور و خۆسەپێن و سامان و دەستەڵات قۆرخکەر و، ستەملێکراوانی ملکەچکەرو پشت دانەوێنەر بۆ باری ستەمکاران، دەکەن، بەهەموو هێز و توانایانەوە، لە ستەم (ظلم) دەسڵەمنەوە و، بوێرانە بەرۆکی ستەمکاران دەگرن و، وڵات و کۆمەڵگا لەستەم و خراپەیان بژار دەکەن، تاکو لەدنیادا بەئاگری ستەمکاران نەسووتێن و، بەهۆی ئەوەشەوە لەڕۆژی دواییدا، بەئاگری دۆزەخ سزا نەدرێن، چونکە هەرکەس لەدنیادا تەسلیمی ئیرادەی ستەمکاران ببێ و، خۆی بخاتە ژێر ڕکێفیان، لەڕۆژی دوایی دا، گیرۆدەیی سزای خوا دەبێ و، ڕەگەڵ ستەمکاران دەخرێ، وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ... ﴾ هود -١١٣-.

واتە: وە لەستەمکاران نیزیك مەکەونەوە، ئاگرتان تووش دەبێ.
وە فەرموویەتی:

﴿ ٱحْشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُواْ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ ﴾ الصافات -٢٢،٢٣-.

واتە: ستەمکاران و هاوکارانیان و ئەوانەی لەجیاتی خوا دەیانپەرستن، خڕبکەنەوە و بەرە و ڕێی دۆزەخ ڕێنماییان بکەن.

**لەکۆتاییدا لەخوای مەزن دەپاڕێمەوەو دەڵێم:**

خوایە! یارمەتیمان بدە کە:

١- ستەمکار نەبین و
٢- هاوکاری ستەمکارانیش نەبین و
٣- لەبەرانبەر ستەمکارانیشدا، بێ دەنگ و بێ هەڵوێست نەبین.

## بنەمای حەوتەم:

## بینینی هەڵەو تاوانەكانمان و دانپێدانانیان، یەكەمین هەنگاوی چاكسازییە

مرۆڤ تاكو هەڵەو پەڵەكانی خۆی نەبینێو، قەناعەتی بەبوونیان نەبێو دانیان پێدانەهێنێ، بێگومان هەوڵی نەهێشتنو خۆ لێ بژاركردنیان نادات، بۆیەش پێغەمبەری خاتەم (محمد) "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: (إذا أراد الله بِعَبْدٍ خيراً، زهّدهُ في الدنيا وبصّرهُ بعيوبه) أخرجه البيهقي في (شعب الإيمان)، واتە: هەركات خوا چاكەی بەندەیەكی بوێ، وای لێدەكات دنیا بەكەم بگرێ، وەكەم و كورییەكانی خۆی دەخاتە بەرچاوی.

كاتی خۆیشی ئادەم و حەووا، باب و دایكی مرۆڤایەتیی "سەلامی خوایان لێ بێ"، پاش ئەوەی بەخوتخوتەو دنەدانی ئیبلیس، تووشی هەڵەبوون و، لەبەری درەختە قەدەغەكراوەكەیان خواردو، خوای میهرەبان سەرزەنشتی كردن، بێ سێ و دوو دانیان بەهەڵەوستەمی خۆیاندا هێناو، داوای لێبوردنیان لەپەروەردگاریان كرد، وەك خوا لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿...فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ الأعراف -٢٢،٢٣-.

بەڵام ئیبلیس بەپێچەوانەوە: لەجیاتی بینیی هەڵەو تاوانەکەی و، پێ لێنان و داوای لێبوردن کردن، هەوڵیدا بەپاساو هێنانەوەیەکی بێ جێ، تاوانەکەی بپۆشی و نادیدەی بگرێ، بگرە خەتای خوای تاك و پاکیش بگرێ، کە فەرمانێکی بێ جێ ی پێکردوە، کە پێی فەرمووە: سڵاو لە خەلیفەکەی (ئادەم) بکات و ڕێزی لێ بگرێ، بۆیە لاملیی لێکردوەو، جێ بەجێی نەکردوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ٧٥ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴾ ص -٧٥،٧٦-.

کەواتە: دان بەهەڵەو تاوانی خۆداهێنان، عادەتی باب‌و دایکی مرۆڤایەتیی ئادەم‌و حەووایەو، خۆبەزلگرییش لەبەرانبەر هەڵەی خۆ دیتن و دان پێداهێنانیدا، عادەتی ئیبلیسی نەگریسە!

دیارە سەرەنجامی هەرکام لەئادەم و حەووا (سەلامی خوایان لێ بێ)، لەلایەك و، ئیبلیسیش لەلایەکی دیکەوە، ڕوون و ئاشکرایە، ئادەم و حەووا خوالێیان خۆش بوو و ڕێزی لێگرتن و هەڵیبژاردن:

﴿ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴾ طه -١٢٢-.

ئیبلیسیش خوا غەزەبی لێ بگرت و نەفرینی لێکرد:

﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٧٧ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ص-٧٧، ٧٨-.

**کەواتـــە:**

بائێمەش - هەموو لایەکمان و، هەرکەس و لایەنە لەقەدەر خۆی و هەڵەو تاوانەکانی- ئادەمانە: هەڵەو لادان و تاوانەکانمان وەك خۆیان ببینین و، دانیان پێدابێنین و داوای لێبوردن لەخواو، گەردن ئازایی لەخەڵك و جەماوەرمان بکەین، نەك ئیبلیسانە: لادان و تاوانەکانمان، نەك هەر نایدە بگرین، بگرە بەچاك و پەسندیش بزانین و، هەر لەسەریان سووربین.

هەڵبەتە بەرپرسیاری سەرەکیی ئەم واقیعە ناخۆش و نەخۆش و هەل و مەرجە دژوارو نالەبارەش، بڕیاربەدەستانی چارەگە سەدەی ڕابردووی هەرێم و، دەستو پێوەندو دەوروبەرە گەندەڵ و مشەخۆرەکەیانە، هەربۆیەش پێویستە ئەوان بەرلەهەرکەس: ڕاشکاوانە دان بەهەڵە و لادان و تاوانەکانیان دابێنن، پاشان ئیرادەی جیددییان بخەنەکار بۆ چاککردنەوەی هەرچی، کە لەماوەی ڕابردوودا خراپیان کردوە، ئەگەرنا بێگومان بەدان پێدانەهێنانی هەڵەو لادانەکانیان، هیچ لەواقیعی خۆیان ناگۆڕن و، خەڵك و جەماوەر دەزانێ چ باسە؟ وە واقیعی هەرێمەکەشمان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ خراپتر دەبێ، چونکە هەڵەو تاوانەکان ژەهرێکن: سات بۆ سات، خاوەنەکەیان بێحاڵترو دەردەدارتر دەکەن، هەتا سەری بەفەتارەت دەدەن.

بەڕاستییش سەرم لەبڕیار بەدەستانێك سوڕماوە، کە واقیعی نەخۆشی هەرێمەکەیان دەبینن، کەچۆن ڕۆژ بۆ ڕۆژی، دەردو نەخۆشیی، شپرزی دەکەن، کەچی هیچ هەنگاوێکی کردەیی جیددیی بۆ چارسەرکردنی نانێن، ئایا چاوەڕێن دەردو نەخۆشییەکانی هەرێم لەخۆوەو بەتێپەڕبوونی کات چاك ببن؟!

ئەرێ هیچ نەخۆشێك هەبووە، بەدەست چەندان دەردەوە گرفتار بێ و، تەنیا بەتێپەڕبوونی کات و، بێ هەوڵدان بۆ چارەسەر، چاك بووبێتەوە؟!

بەندە وەك: (٢+٢=٤) دەیبینم، کە ئەگەر بێت و بڕیاربەدەستانی وڵات، بوێرانە و جوامێرانە، لەقاوغ و قەپێلکی بەرژەوەندییە نارەوایەکانی خۆیان و دەورو بەریان، نەیەنە دەرێ و، خۆیان لەستەم و هەڵەو لادانەکان دەرباز نەکەن و، ئیرادەی جیددیی نەخەنەکار، بۆ هێنانەوە سەر ڕاستەڕێی کاروبارەکان: قەوارە سیاسییەکەمان، بەرەو کێشە و قەیرانی زیاتر دەچێ و، سەرەنجامیش فشۆڵ و کرمۆڵ بوون و دارمان ڕووی تێدەکات.

## بنەمای هەشتەم

## گەڕانەوە بۆ لای خوا،مایەی دەرووی خێر لێکرانەوەیە

پێشینان گوتوویانە: (دنیا شاری بێ خاوەن نیە)، بەڵێ، خوای کاربەجێ کە بوون (وجود)ی هێناوەتەدی بەمرۆڤیشەوە، چەند یاسایەکی گشتی تێدا داناون، کە وردو درشتی بوون، بەسەر و خوار (سماء وأرض)ەوە، پێیانەوە پەیوەستن.

ئنجا یەکێك لە یاساکان (سنن)ی خوا لە ژیانی بەشەردا، ئەوەیە کە مرۆڤەکان بەهۆی ئیمان و فەرمانبەریی (الإيمان والطاعة)یەوە، بەختەوەری دنیا و سەرفرازیی دوارِۆژ دەبێ و، بەپێچەوانەشەوە: بەهۆی بێبڕوایی و ستەم و خراپەکارییەوە، گیرۆدەی ژینتاڵیی دنیا و، ڕیسوایی و سزاباریی دوارِۆژ دەبێ.

وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی:

﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾ الأعراف -٩٦-.

واتە: وەئەگەر هاتباو خەڵکی ئاوەدانییەکان بڕوایان هێنابا و پارێزیان کردبا، دەروازەکانی پیت و پیێزی ئاسمان و زەویمان بەسەردا دەکردنەوە، بەڵام بێبڕوا بوون، بۆیە بەهۆی ئەو (کردەوە خراپان)ەوە، کە کردیانن (بەسزای سەخت) گرتمانن.

بەڵام، دوای ئەوەی کۆمەڵگاکان تووشی لادان و تاوانیش دەبن، دیسان دەرفەتی گەڕانەوە و چاکسازییان هەر هەیە و، دەگونجێ هەرچی پێشتر بەلادان و تاوانەکانیان و، بە لەخوا دوورکەوتنەوەیان، تێکیان داوەو خراپیان کردوە،

بەگەڕانەوە بۆلای خوا و، فەرمان بەریی و چاكەكاریی، دروستی بكەنەوە و چاكی بكەنەوە.

تاكە نموونەیەكیش، كە خوای میهرەبان لەو بارەوە هێناویەتەوە، گەلی یونس (قوم یونس)ە سەلامی خوای لێ بێ، كە لەنەینەوا بوون، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴾ یونس -٩٨-.

واتە: دەبووایە ئاوەدانییەك - كە پێغەمبەریان بۆ لا نێرراوە - بڕوایان هێنابا و ئیمانەكەیان سوودی پێ گەیاندبایانە (لە مێژوودا ئەوە نەبووە) جگە لەگەلی یونس، دوای ئەوەی بڕوایان هێنا، سزای ڕیسوایی مان (لەدنیادا) لەسەر هەلگرتن و، هەتا ماوەیەكی دیارییكراو، بەخۆشییەوە ژیاندمانن.

سەرجەم پێغەمبەرانی پایە بەرزی خواش (علیهم السلام) موژدە و بەڵێنی ئەوەیان بەكۆمەڵگاكەیان داوە، كەئەگەر بگەڕێنەوە و دەست لە كوفر و ستەم و تاوان هەڵبگرن و، داوای لێبوردن لە خوا بكەن، خوا لێیان دەبووریّ و، دەرووی خێریان لێدەكاتەوە و، بەرەكەتیان بۆ دەردەخسێنێ لەسەرو ماڵیان دا، بۆ نموونە:

١- (نوح) علیه السلام ئاوا گەلەكەی خۆی لەوبارەوە دواندوە:

﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ ﴾ نوح.

واتە: ئنجا گوتم: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن، بەدڵنیایی ئەو لێبوردەیە، لەسەرێوە ئاوی بەخورزەمتان بەسەردا دەڕێژێ، وەسامان و كوڕانتان بۆ دەردەخسێنێ و، باغ و بێستانی زۆر و، ڕووبارانتان پێدەبەخشێ.

٢- (هود) یش (علیه السلام) لەسیاقی چەند قسەیەك دا، بەگەلەكەی (عاد) دەفەرموێ:

﴿ وَيَـٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟ مُجْرِمِينَ ﴾ هود -٥٢-.

واتە: ئەی گەلەکەم! داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆلای، لەسەرەوە ئاوی بەلێزمەتان بەسەردا دەڕێژێ، وەهێزی دیکە دەخاتە پاڵ هێزتان، وەتاوان بارانە پشت هەڵمەکەن.

ئاشکراشە کە مەبەست لەگەڕانەوە بۆلای خوا، گەڕانەوەیە بۆ فەرمانبەریی (الطاعة) و، دەست هەڵگرتن لەتاوان و سەرپێچیی، بەهۆی پابەندیی بەئایین و بەرنامەی خواوە.

هەڵبەت لەئەنجامی فەرمانبەریی کردن بۆخوا و، پابەندیی بەشەریعەتەکەیەوەش، کۆمەڵگا لەستەم و تاوان و خراپە دوور دەبێ و، هەوڵدەدات لەسەر بناغەی دادگەریی و یەکسانیی، پێکەوە تەبا و تۆکمە و یەکدەنگ و یەکسەنگ بێ، بێگومان کۆمەڵگایەکی ئاواش، بەسەر گرفت و کێشە و قەیرانەکانیدا زاڵ دەبێ و، خوا دەرووی خێری لێدەکاتەوە و،پیت و پێز دەخاتە ژیان و گوزەرانییەوە.

لەمێژیشە بەتایبەتی لەدوای ڕاپەڕینی جەماوەریی مانگی (٣)ی (١٩٩١)ەوە، کەبەندە چەندان جار، لەوتارو نووسین و کۆبوونەوە تایبەتیی و گشتییەکانم دا، جەختم لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە:

یەکەم: باسوپاسگوزاریی بۆخوا بکەین، لەسەر چاکەکانی - بەتایبەت قوتار بوونمان لەڕژێمی بەعسی ستەمکار -.

دووەم: وە باوریابین لە لەخۆبایی بوون (غرور)، چونکە گوتراوە :(الغرور يَقْصِمُ الظُّهورَ) لە خۆبایی بوون پشتان دەشکێنێ.

سێیەم: وە بائاگامان لەخۆمان بێ - بەتایبەت لەسەر ئاستی حوکمڕانان - کە هەمان ڕەفتار و خەسڵەتە خراپەکانی ڕژێمی بەعس، لەخۆماندا دووبارە نەکەینەوە، وەك:

أ- ستەم و قۆرخکاریی و بێ ویژدانیی .

ب - تەنیا خۆو خزم و نزیکان و دەوروبەر دیتن و، خەڵك فەرامۆش کردن.
ج - ماڵ و سامانی حەرام خڕکردنەوەو وەسەر یەك نان.
د - سەرپێبوون (إنتماء)ی بنەماڵەیی و خزمەیەتیی و حیزبیی و سیاسی کردنە پێوەر، لەجیاتی هاوڵاتیی بوون و، ئینتیما بۆ کۆمەڵگا و نیشتمان.

**لە کۆتاییش دا دەڵێم:**

بێگومان بۆلای خوا گەڕانەوەی هەموو کەس - وەك لە کتێبی: ((گەڕانەوە بۆ لای خوا))دا گوتوومە - هەر پێویستە، بەڵام بۆ لای خوا گەڕانەوەی تاکەکان (أفراد) تەنیا بۆخۆیان باشە و، لێی بەهرەمەند دەبن، ئەگەرنا واقیعی کۆمەڵگای پێناگۆڕێ و چاك نابێ، بەبەڵگەی ئەوە، کە چ لە کۆمەڵگایەکانی پێغەمبەرەکانی پێشوودا (علیهم السلام)، وەچ لە کۆمەڵگایەکانی ئەم ڕۆژگارەی مسوڵمانان دا، کەم و زۆر ژمارەیەك تاکی ساڵح و خواپەرست هەبوون و هەن، کە بۆ لای خوا عزوجل گەڕاونەوە، بەڵام هەبوونی چەند تاکێکی بۆخوا سوڵحاو، لەکۆمەڵگایەکانی پێغەمبەرانی پێشوودا نەبۆتە ڕێگر و پەرچ، لەبەردەم لەبەین چوونیان و، بەڵای خوا بۆهاتنیان دا!

هەروەها هەبوونی چەندان تاکی بۆ لای خوا گەڕاوە و بۆخوا سوڵحاویش، لەکۆمەڵگایەکانی ئەمڕۆی مسوڵمانان دا، نەبۆتە مایەی دەرووی خێر لێکرانەوە و دەرباز بوونیان لەقەیران و نەهامەتییەکان!

کەواتە: مەبەست لە (بۆ لای خوا گەڕانەوە)یەك، کە واقیعی کۆمەڵگای پێ دەگۆڕێ و، دەبێتە مایەی چاکسازیی تێدا کرانی، بۆلای خوا گەڕانەوەی گشتی کۆمەڵگایە، بەهەموو پێکهاتەکانیەوە، وە بۆلای خوا و شەریعەتەکەی گەڕانەوەی بڕیار بەدەست و بەرپرسانە بەتایبەت، چونکە بڕیار بەدەست و حکومڕانان، سوکان بەدەستی کەشتی خەڵك و وڵاتن.

بۆیەش جەختم لەسەر خستنە ڕووی ئەم ڕاستییە کردەوە، چونکە هەندێك لەوتار بێژەکان وادەزانن و، خەڵکیش واحاڵی دەکەن، کە ئەگەر خەڵك و جەماوەر ئەهلی طاعەت بن و، واز لەگوناهان بێنن، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی واقیعی

خەڵك و وڵات چاك دەبێ، هەرچەندە حوكمڕان و بڕیاربەدەستانیش ستەمكار و تاوانبار بن!

كە بێگومان ئەوە ڕاست نیە، بەڵكو پێچەوانەكەی ڕاستە و، حكومڕانان و بڕیار بەدەستانی ستەمكار، دەبنە مایەی گرفتار بوونی تێكڕای خەڵك و وڵات، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَٱتَّقُواْ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ الأنفال -٢٥-.

واتە: وە خۆتان لە بەڵایەك بپارێزن، كە تەنیا تووشی ئەوانەتان نایەت كەستەمیان كردوە - بەڵكو هەمووتان دەگرێتەوە - وەبزانن كە خوا سزای توندە.

لەبنەمای نۆیەمیش دا، ئەرك و بەرپرسیارێتیی خەڵك و جەماوەر، لەبەرانبەر حوكمڕان و بڕیار بەدەستانی ستەمكار و لادەردا، دەخەینەڕوو.

## بنەمای نۆیەم :

## خەڵك و جەماوەر بۆ چاککردنی واقیعی کۆمەڵگا، بەرپرسیارێتیی سەرەکییان لەسەرشانە

بەسەرنجدانی ئایەتە بەپێزەکانی قورئان، بۆمان دەردەکەوێ، کەخەڵك و جەماوەر بەرپرسیارێتیی سەرەکییان لەسەر شانە، بۆ گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگاو، پێش ئەوەش بۆ ڕێگرییکردن و پێشگرتن لەستەمکار و خراپەکاران و دەست کۆتاکردنیان، چونکە بێگومان: پارێز لەچارەسەر باشترە (الوقاية خير من العلاج)، وە تێچووی (خرجی)شی زۆر کەمترە.

**دەشتوانین زۆر بەڵگە لەئایەتەکانی قورئان لەسەر ئەوە بێنینەوە، کە خەڵك و جەماوەر بەگشتی بەرپرسیارێتیی سەرەکییان لەسەرشانە، بۆنموونە:**

١- خوای بەرز وەمەزن لەبارەی بەنی ئیسرائیلەوە، فەرموویەتی:

﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾ المائدة -٧٨-٧٩-.

واتە: ئەوانەی بێبڕوا بوون لەبەنی ئیسرائیل، لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم نەفرینیان لێکرا، ئەویش بەهۆی ئەوەوە، کە سەرپێچییان کردو سنوورشکێنییان دەکرد . عادەتیان وابوو لەنێو خۆیان دا یەکدییان لەخراپەیەك کەدەیان کرد، نەدەگێڕایەوە، ئەویش خراپترین شت بوو، دەیان کرد.

وەك دەبینن خوای کاربەجێ باسی نەفرین لێکردنی هەرکام لە داوود و عیسا - سەلامی خوایان لێ بێ - لەبێبڕوایانی گەلی بەنی ئیسرائیل دەکات، پاشان هۆکاری نەفرین لێکرانەکەش ڕوون دەکاتەوە، کەبریتییە لە یەکدی قەدەغەنەکردنیان لەخراپە و تاوان، وە ئەو بێهەڵوێستییەشیان لە بەرانبەر خراپە و تاوان دا، بەخراپترین ڕەفتارو کردەوەیان دادەنێ.

ئنجا ئاشکراشە، کە مادام خەڵکی بەنی ئیسرائیل شایستەی نەفرین لێکران بووبن، بەهۆی هەڵوێست نەبوونیان لە بەرانبەر خراپەدا، دیارە خراپەکارەکان خودی خەڵك و جەماوەرەکە نەبوون، بەڵکو کەسانی دیکە بوون، کە بێگومان حوکمڕان و دەسترۆیشتووەکان بوون.

کەواتە: خەڵك و جەماوەری بێ هەڵوێست لە بەرانبەر حوکمڕان و کاربەدەستانی خراپەکارو ستەمکاردا، مادام لەوەدا کە پێی دەکرێ بکات کەمتەرخەمی بکات، نەفرین لێکراو و دوورخراوەیە لەبەزەیی و بەخششی خوا عزوجل!!

٢- کاتێك خوای بێ وێنە، جێژوان (موعد) و بەڵێنگە (میقات)یەکی چل شەویی بۆ مووسا (علیه السلام) دادەنێ، تاکو تەوراتی بداتێ، کە لەسەر چەند بەردێکی تەخت (ألواح) نووسراوەتەوە، وە هەتا مووسا دەگەڕێتەوە لای گەلەکەی (بنی إسرائیل) دەبینێ زۆربەیان (سامیری) هەڵیخەڵەتاندوون و، هەر چەندە (هارون)یش علیه السلام زۆری هەوڵ لەگەڵدان، بەڵام بەقسەیان نەکردوە و، دەستیان کردوە بەپەرستنی ئەو گۆلك (عِجْل)ەی، کە سامیریی لەخشڵەکانیان - پاش قاڵکردنەوەی لەقاڵبێك دا - بۆی دروست کرد بوون.

ئنجا کاتێك مووسا دەگەڕێتەوە، زۆر پەست و تووڕە دەبێ و، دەکەوێتە هەوڵدان بۆ چارەسەری ئەو لادان و تاوانە زلەیە و، سەرەتا سەرکۆنەی خەڵکەکە دەکات، پاشان هی هاروونی برای، ئنجا هی سامیریی، بەم جۆرە:

١- ﴿ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ٨٦ ﴾ طه -٨٦-.

واته: موسا زۆر بەتوڕەیی و خەفەتەوە گەڕایەوە لای گەلەكەی و فەرموی: ئەی گەلەكەم! ئایا پەروەردگارتان بەڵێنێكی باشی پێنەدابون! (كە پێدانی تەورات بوو) ئایا ماوەی هاتنەدیی بەڵێنەكەتان لەسەر درێژ بۆوە، یان ویستتان توڕەییتان لە پەروەردگارتانەوە بێتە سەر، وە سەرەنجام ئەو گفتەی پێتان دابووم، نەتان بردە سەر، كە بریتی بو لە (نەپەرستنی جگە لە خوا)؟!

٢- ﴿ قَالَ يَـٰهَـٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴾
طه -٩٢-٩٣-.

واته: (موسا) فەرموی: ئەی هاڕوون! چ شتێك ڕێی لێگرتی كاتێك بینیتن گومڕابون، شوێنم بكەوی، ئایا سەرپێچیت لە فەرمانەكەم كرد؟!

٣- ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَـٰسَـٰمِرِىُّ ﴿٩٥﴾ ﴾ طه -٩٥-.

واته: (مووسا) فەرموی: ئەی سامیری ! هۆكاری چی بوو، تۆ واتكرد؟!
كەواتە :

پێویستە خەڵك و جەماوەر هەمیشە هەست بەبەرپرسیارێتیی بكات و، بەبیانووی كەمتەر خەمیی بەرپرس و بڕیاربەدەستان و، ستەم و فێڵ و خراپەی خراپەكارانەوە، شان لەبن باری بەرپرسیارێتیی دەرنەهێنێ.

هەڵبەتە كۆمەڵگایەكیش تاكەكانی بەگشتی هەست بە بەرپرسیارێتیی بكەن، خەڵك و كۆمەڵگایەكی كارا و زیندووە، كۆمەڵگای كاراو زیندووش، هیچ بەرپرس و بڕیار بەدەستێك ناتوانێ خۆی بەسەردا بسەپێنێ و ستەمی لێ بكات، هەروەها هیچ بابایەكی ئاژاوەگێڕو فێڵبازیش، ناتوانێ فریوی بدات و كڵاوی لەسەر بنێ.

جێی سەرنج و پەند لێوەرگرتنیشە، كە خوای دادگەر لە لێپرسینەوەی قیامەتیش دا، هەركام لە سەركردە خۆبەزلگر و زۆردارەكان و، شوێنكەوتووە چەوساوە هەڵخەڵەتاوەكانیش، بەستەمكار(ظالم )ناودەبات، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ

إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ﴾ سبأ-٣١-.

واتە: وە ئەوانەی بێبڕوا بوون گوتییان: نە بڕوا بەم قورئانەو نەبەو (کتێبان)ەی لەپێشەوەش بون، دێنین، وە ئەگەر ببینی کاتێك ستەمکاران لەلای پەروەردگاریان وەستێنراون، پێکەوە شەڕە قسەدەکەن: ئەوانەی چەوسێنراوەوە، بەوانە دەڵێن کە خۆیان بەزلگرتوە: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە بڕوادار دەبووین.

وەك دەبینن خوای دادگەر هەرکام لە چەوسێنراوان (ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ) و خۆبەزلگران (لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ) بەستەمکار ناوزەد دەکات (إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ) !

پێشتریش ئەو ڕستە قورئانییەمان هێنا، کە خوای کاربەجێ تێیدا ڕایدەگەیەنێ، کە بۆ هەرکام لە: پێشکەوتووان (أولاهم) و، دواکەوتووان (أُخراهم) سزای دووقات هەیە:

﴿ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴾ الأعراف -٣٨-.

واتە: (خوا) فەرموی: بۆ هەرکارەتان سزای دووقات هەیە، بەڵام نازانن.

هەڵبەتە کاتێکیش خەڵك و جەماوەر لەو ڕاستییە مەزنە قورئانییە تێدەگات و، بڕوای پێ دێنێ و، کارلێکی لەگەڵ دەکات، هەرگیز لەبەرانبەر خراپەکار و ستەم کاران دا، دەست بەخۆیدا بەر ناداتەوە، بێدەنگ نابێ، بەڵکو بەپاڵنەری سەرفرازیی دنیا و دووارۆژ، هەموو هەوڵێك بۆ ڕیشەکێش کردنی ستەم و چەوساندنەوە و خراپەکاریی دەدات.

بنەمای دەیەم:

با پەند لەمێژوو وەربگرین،
چونکە یاساکانی خوا (سنن الله)
لەژیانی بەشەردا، هەمیشەیی و گشتگیرن

خوای بەرزومەزن لەزۆر شوێنی قوڕئانێدا، باسی ئەو ڕاستییە دەکات، کە لەژیانی بەشەردا - وەك تێکڕای بوون - کۆمەڵێك یاسا (سنة) ی داناون، کەهەمیشە جێ بەجێ دەبن و، گشتگیریشن بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیانی بەشەرو، سەرجەم کۆمەڵگایەکانی، بۆنموونە:

١- ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ آل عمران -١٣٧-.

واتە: لە پێش ئێوەدا یاساکان (ی خوا) ڕابردوون، بەزەمین دا بڕۆن، سەرنج بدەن، سەرەنجامی بێبڕوایان چۆن بوو!

٢- ﴿ . فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا ﴾ فاطر -٤٣-.

واتە: ئایا چاوەڕێی چی دەکەن،جگە لە (بەسەرداچەسپانی) یاسای پێشووان؟، هەرگیز یاسای خوا ناگۆڕێ و، هەرگیز یاسای خوا لانادرێ.

هەڵبەتە ئەگەر ژیانی بەشەریش بەپێی یاساکانی خوا (سنن الله) بەڕێوە نەچووبایە، سەرنجدانی مێژوو و بەزەویدا گەڕان و، تەماشاکردنی شوێنەواری پێشووان، هیچ سودێکی نەدەبوو، وە دەرس و پەند وەرگرتن لەبەسەرهاتی ڕابردووان - کە قوڕئان زۆر فەرمانیان پێدەکات - هەرگیز مەیسەر نەدەبوو،

چونکە کاتێك دەرس و عیبرەت لە کۆمەڵێك وەردەگیرێ، کە ئەگەری هەبێ، ئەوان چییان کردوە و، لەئەنجام دا چییان بەسەرهاتوە، هەمان شت دووبارە بێتەوە، ئەوەش تەنیا کاتێك دەبێ، کە ژیانی بەشەر بەپێی چەند یاسایەك بەڕێوە بچێ.

با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست، وێنەیەك بێنینەوە:

(ئاو) لەپلەی چوار (٤)ی ژێر سفردا (٤-)دەیبەستێ و، لەپلەی (١٠٠)دا دەکوڵێ، ئیدی ئەوە یاسایەکی گشتییە و، لەهەموو کات و شوێنێك دا - لەسەر زەوی - بەسەر ئاودا دەچەسپێ، بۆیە لەهەر شوێنێك ئاو ببینین، دەتوانین پێشبینیی ئەو دووحاڵەتەی بۆ بکەین، بەپێی ئەو دوو یاسایە.

ئنجا خوای کاربەجێ و شارەزا هەواڵی پێداوین، کە ژیانی بەشەریش بەپێی چەند یاسایەك بەڕێوە دەچێت، کەبەسەر هەموو مرۆڤەکاندا دەچەسپێن، لەهەموو کات و شوێنەکاندا، وەهەر لەسەر ئەو بناغەیەش، خوا فەرمانمان پێدەکات، کە سەرنجی ژیان و بەسەرهات و شوێنەواری پێشووان بدەین و، پەندیان لێوەر بگرین، بۆ نموونە:

١- لە کۆتایی بەسەرهاتی (یوسف)دا فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ... ﴾ یوسف -١١١-.

واتە: بێگومان لە بەسەر هاتەکانیان دا، پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان.

٢- وە لەسیاقی گێڕانەوەی بەسەرهاتی دەرکرانی هۆزی (بنو النّضير)ی جوولەکەدا، فەرموویەتی:

﴿ ...يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴾الحشر-٢-.

واتە: بەدەستی خۆیان و بڕواداران ماڵەکانیان دەڕووخێنن، ئەی خاوەن دیدان، پەند وەربگرن!

٣- وەهەروەها لەبارەی پەند و عیبرەت وەرگرتنەوە، لەبەسەرهاتی کۆمەڵگای بێبڕوا پێشووەکان، فەرموویەتی:

﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾ الأنعام -١١-.

واتە: بڵێ: بەزەمین دابڕۆن، پاشان سەرنج بدەن سەرەنجامی بێبڕوایان چۆن بوو؟!

ئنجا بینا لەسەر ئەوە، کە ڕابرد دەڵێین:

وەك چۆن یەكێك لەیاسا گەردوونییەكان (السُّنن الكونية)ی خوا، ئەوە یەكە لەئەنجامی ستەمكاریی و نەمانی دادگەرییدا، وڵات و ئاوەدانییەكان كاول دەبن، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾الأنبياء-١١-.

واتە: وە زۆر ئاوەدانییمان كەستەمكار بوون، تێك شكاندن، وە دوای وان كۆمەڵێكی دیكەمان پێگەیاندن.

بەهەمان شێوە و لەبەرانبەریش دا، یاسایەكی دیكەی گەردوونیی خوا ئەوەیە، كە ئاوەدانییەكان، بەهۆی ستەمەوە نافەوتێنێ، مادام خەڵكەكەیان چاكسازیی بكەن و مل بۆ ستەم نەدەن، وەك فەرموویەتی:

﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ﴾ هود -١١٧-.

واتە: وە پەروەردگارت ناگونجێ بەهۆی ستەمەوە ئاوەدانییەكان بفەوتێنێ، مادام خەڵكەكەیان چاكسازیی بكەن.

هەڵبەتە دەشگونجێ مانای وشەی (بِظُلْمٍ) ئەوەبێ: كەخوا ستەم لە ئاوەدانییەكان ناكات، كە لەكاتێك دا خەڵكەكەیان چاكسازیی دەكەن، بیانفەوتێنێ.

كەواتە: با ئێمەش لەهەرێمی كوردستان و عێراق دا، پەند لەو كۆمەڵگایانە وەر بگرین، كە بەهۆی ستەمكارییەوە فەوتاون و، هەڵەی وان دووبارە نەكەینەوە، تاكو هەمان چارەنووسی ڕەشی ئەوانمان نەبێ و، با هەوڵبدەین، چاو لەو كۆمەڵگایانە بكەین، كە بەهۆی هەڵسانیان بە چاكسازیی كردن و، بەرهەڵستیی كردنی ستەم و خراپەوە، شایستەی بەختەوەریی و سەرفرازیی بوون.

گوتراویشە: (السّعيد مَنْ اتّعظ بغيره) بەختەوەر كەسێكە، پەند لە غەیری خۆی وەربگرێ.

بەڵێ، باهەوڵبدەین پەند لەخەڵك وەربگرین، نەك بۆ خەڵك ببینە پەند!

بنەمای یازدەیەم :

پاکسازیی بە پاکان و، چاکسازیی بەچاکان و، ڕاستکردنەوە بەڕاستان، دەکرێ

یاسایەکی عەقڵیی ڕوون و بێ چەند و چوونە، کە کەسێك شتێکی نەبێت، پێی نابەخشرێ (فاقد الشيئ لايعطيه)، هەر بۆیەش هەرکەسێك بیەوێ: پاکسازیی و چاکسازیی و ڕاستکردنەوە (تطهير وإصلاح وتقويم) لەکۆمەڵگا و دەورو بەرەکەیدا بکات، دەبێ سەرەتا: خۆی پاك و چاك و ڕاست بکات، ئەگەرنا هیچ بەهیچ ناکات.

بەڵێ، مرۆڤ، بەئەندازەی پاکیی و چاکیی خۆی، پاکسازیی و چاکسازیی بۆ دەکرێ، وە هەتا خۆی ڕاست و دروست نەبێ، ئەرکی ڕاست کردنەوەی بۆ ئەنجام نادرێ.

**ئەو ڕاستییەش لەچەندان ئایەتی بەپێزی قورئانی بەڕێز، وەردەگیرێ، بۆ نموونە:**

١- ﴿ ..إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾ يونس -٨١-.

واتە: بێگومان خوا کاری خراپەکاران چاك ناکات.

٢- ﴿ ..وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ البقرة-٢٥٨- التوبة -١٠٩-.

واتە: وە خوا ڕێنمایی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات.

٤- ﴿ ..وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾ التوبة -٨٠-.

واتە: وە خوا كۆمەڵی لادەران ڕێنمایی ناكات.

**پێشم وایە دەبێ لەو ڕاستییە قوڕئانییە، دوو پەندی گەورە وەربگرین:**

**یەكەم:** هەركات ویستمان بیر لە هەڵسان بەئەركی گۆڕینی كۆمەڵگاو پاكسازیی و چاكسازیی تێداكردنی و، ڕاستكردنەوەی لارییەكان، بكەینەوە، پێویستە زۆر بەجیدیی مشووری: خۆ پاك و چاك و ڕاست كردنمان بخۆین.

ئنجا بێگومان: پاك و چاك و ڕاست بوونی مرۆڤیش، بەبێ بوونناسیی (Ontology) یەكی ڕاست و، ئیمان و عەقیدەیەكی پاك و، خوا پەرستییەكی ساغ و، ڕەوشت و ئاكارێكی بەرزوپەسند، مەیسەر نابێ، چونكە گۆزە چی تێدابێ، هەر ئەوەی لێ دەڕژێ.

**دووەم:** باهۆشیارو بێداربین و بەقسەی خۆش و بۆش و، شیعاری بێ كرداری كەسانێك، نە فریو بخۆین و، نەخۆشحاڵیش بین، كەخۆیان و دەوروبەریان هەتا بیینە قاقایان، بەخراپە و ستەم (فساد وظلم)دا چوونە خوارو، لافی پاكسازیی و چاكسازیی كردنیش لێدەدەن، چونكە كەسێك خۆی پێ پاك و چاك نەكرێ، لەدەرەوەی خۆشی هیچی پێناكرێ!

بەڵێ، هەركات ئەو جۆرە كەسانە، لەخودی خۆیان و دەوروبەریان دا، كەلەژێر ڕكێف و قەڵەمڕەوی ڕاستەوخۆیان دان، هەنگاوی كردەییان ناو، شوێنەواری چاكسازیی یان دەركەوت، ئەو كاتە بە ئەندازەی ئەوە، با متمانەیان پێ بكرێ و، دڵ بەقسەكانیان خۆش بكرێ!

خوای پەنهانزانیش بەو جۆرەكەسانەی - كە قسە و شیعاریان چاكیان هەیە، بەڵام كردەوەو پەرێزی خراپ - فەرمووە:

﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ البقرة -٤٤-.

واتە: ئایە فەرمان بەخەڵك دەكەن چاكەبكەن و خۆتان فەرامۆش دەكەن، لەحاڵێك دا، كە كتێبی خواش دەخوێننەوە، ئایا نافامن؟!

## بنەمای دوازدەیەم :
## خۆبەزلگران نەمانیان و، چەوسێنراوان مافەکانیان، لە پەیامی پێغەمبەران دا دەبینن

لە تێکڕای بەسەرهاتەکانی پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خوا (علیهم السلام) و کۆمەڵگایەکانیان دا، ئەوە بەدی دەکرێ، کە بەزۆریی شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، خەڵکی چەوساوەو نەدار و، ناحەز و نەیارانیشیان، خۆبەزلگران و خۆشگوزەرانان بوون.

**باسەرەتا لەوبارەوە، سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین:**

١- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ ... ﴾ هود -٢٥-٢٦-٢٧-.

واتە: بە دڵنیایی نووحمان بۆ لای گەلەکەی نارد، فەرمووی: من بۆ ئێوە ترسێنەرێکی ئاشکرام. کە جگە لە خوا نەپەرستن، بیمی ئازاری ڕۆژێکی بەئێشم بۆتان هەیە، ئەو دەسترۆیشتووانەی بێبڕوان لە گەلەکەی گوتیان: تەنیا وەك بەشەرێکی خۆمان دەتبینین، وە ناشبینین هیچکەست شوێن کەوتبێ، بێجگە لەوانەمان، کە نمووەو عەقڵ سووکن.

٢- ﴿ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ (٥٣) إِنَّ هَؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ (٥٤) وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ (٥٥) وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ (٥٦) ﴾ الشعراء-٥٣-٥٤-٥٥-٥٦-.

واتە: فیرعەون کۆکەرەوەکانی (خەڵکی) بۆ شاران ناردن، (گوتی:) بێگومان ئەوانە (شوێنکەوتوانی مووسا) کۆمەڵۆکەیەکی کەمن. وە پەرستکەر (توورەکەری) ئێمەن. وە ئێمەش کۆمەڵێکی وریاو گورج و گۆڵین.

٣- ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴾ سبأ-٣٤.

واتە: وە هیچ ترسێنەرێکمان لە هیچ ئاوەدانییەك دا نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە بەوەی پێی نێرراون، بێبڕواین.

٤- ﴿ وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴾ الأنعام-٥٣-.

واتە: وە بەوجۆرە هەندێکیان بەهەندێکیان تاقی دەکەینەوە، تاکو بڵێین: ئایا ئەوانن کە خودا لە نێو ئێمەدا چاکەی لەگەڵ کردوون - کە هیدایەتی دان-؟ ئایا خوا بەسوپاسگوزاران زاناترنیە؟!

٥- ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٥٠) وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ (١٥١) الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ (١٥٢) ﴾ الشعراء -١٥٠-١٥١-١٥٢-.

واتە: دەجا پارێز لەخوا بکەن و فەرمانبەرییم بکەن، وە بەقسەی زێدە ڕۆیان مەکەن، ئەوانەی خراپە لە زەمین دەکەن و چاکسازیی ناکەن.

لەکۆی ئەم ئایەتانەوە - کە چەند نموونەیەکن - دەردەکەوێ، کە هەمیشە و دایم دوژمن و ناحەزانی پێغەمبەران (عليهم السلام) و پەیام و بەرنامەکەیان:

کەسانێکی دەسترۆیشتوو و خۆپێ زۆر(مَلَأ)ی، خۆشگوزەران (مترفوها)ی، زێدە ڕۆیی کار (مُسْرِفِينُ)ی، خراپەکار و تێکدەر (يفسدون) بوون.

شوێنکەوتوانیشیان: کەسانێکی سادە و ڕەش و ڕووت (أَرَاذِلنَا)ی کەمینەی (لشرذمة قليلون)ی، بەکەم سەیر کراو (لِيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا)، بوون!

**هەڵبەتە هۆکاری ئەم دوو حاڵەتەش، زۆر ڕوونە:**

**یەکەم:** هەرچی خۆبەزلگرانی قۆرخکەری دەستەڵات و سامانن، کە بە(مستکبرین ومترفین ومسرفین) وەسف کراون، بۆیە ئیعلانی دژایەتیی پێغەمبەران و بەرنامە و ڕێبازەکەیانیان کردوە، چونکە دڵنیا و مسۆگەر بوونە، کەئەگەر ئەوەی ئەو زاتانە دەیڵێن، لەسەر ئەرزی واقیع بچەسپێ، ئەوان ئەو بەزم و بازاڕەیان لێ تێکدەچێ، کە بەزۆری زۆرداریی و ملهوڕیی و، لەسەر حیسابی خەڵك پەیدایان کردوە!

**دووەم:** وە هەرچی خەڵکی ڕەش و ڕووت و سادە و چەوساوە بوون، بۆیە ئیعلانی شوێنکەوتنی پێغەمبەران و، پەیڕەویی لێکردنی بەرنامەکەیانیان کردوە، چونکە وێڕای ئیقناع کردن و تێرکردنی ئەقل و دڵ و دەروون و فیطرەتیان، زانیویشیانە، کە بەرگریی لەکەرامەت و ئازادیی و مافەکانیان دەکەن، لەبەرانبەر حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆشگوزەران و ملهوڕەکان دا، چونکە وەك لەبنەماکانی پێشوودا گوتمان: تێکڕای بەرنامەکانی خوا و، کتێبە بەرز و بەپێزەکانی، کە بەپێغەمبەرانی پایە بەرزی دا ناردوونی، بۆ چەسپاندنی دوو ئامانج و مەبەستی بنەڕەتیی هاتوون، کە بریتین لە:

١- خوا بەیەکگرتن (التوحید) وەك پەیوەندیی نێوان خواو مرۆڤەکان.

٢- دادگەریی (العدل ـ القسط) وەك پەیوەندیی مرۆڤەکان لە نێوان خۆیاندا، کە ئامانجی یەکەمیان، لە ئایەتی (٢٥)ی (الأنبیاء) و، هی دووەمیشیان لەئایەتی (٢٥)ی (الحدید) دا، بەڕوون و ڕاشکاویی خراونە ڕوو، ئنجا لێرەشەوە دەگەینە ئەنجامگیریی (إستنتاج) یەکی زۆرگرنگ، ئەویش ئەوەیە کە:

نیشانە و بەڵگەیەکی گەورە و بنەڕەتیی ڕەسەنایەتیی (أصالة) هەر تەوژم و کۆڕوکۆمەڵێکی ئیسلامیی، ئەوەیە کە هەمیشە داکۆکیکاری کەرامەت و ئازادیی و مافەکانی خەڵکی سادە و بەشخوراو و چەوساوەبێ و، لەسەنگەری ستەملێکراوان (مظلومین) دابێ و، لە سەنگەری دژایەتیکردنی ستەمکاران (ظالمین)ێك دابێ، کە سامان و دەستەڵات لەکۆمەڵگا و خەڵك قۆرخ دەکەن و، لافی پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی (ربوبیة وألوهیة)کردن، بەسەر خەڵك دا لێدەدەن!

## بنەمای سێزدەیەم :

## تێكدان ئاسانە و، بەكەمێكیش دەكرێ، بەڵام بنیاتنان قورسە و، بەزۆران نەبێ ناكرێ

ئەوە شتێكی ئاشكرایە و عەقڵی سەلیم بەسێنایی دەركی پێدەكات، كە هەمیشە تێكدان و وێرانكردن ئاسانە و، بەكۆمەڵێكی كەم، بگرە جاری وایە بەچەند كەسێك و بەكەسێكیش دەكرێ، بەڵام بنیاتنان و دروستكردن، وانیە، بەڵكو قورس و زەحمەتە و، كاری هەرەوەزیی و پێكەوەیی دەوێ و، جاری وایە بەزۆرینەنەبێ، ناكرێ، ئنجا هەرچەندە ئەوەی گوتمان، مادام عەقڵی ساغ دەركی پێدەكات، حەوجێی بەبەڵگەی نەقڵیی و دەقی شەرعیی ناكات، لەسەری بهێنرێتەوە، بەڵام ئاماژە بەچەند دەقێكیش دەكەین لەوبارەوە :

١- ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ الأنفال -٢٥-.

واتە: وە پارێز لە بەڵایەك بكەن، تەنیا تووشی ئەوانەتان نابێ، كە ستەمیان كردوە، وەبزانن كە خوا تۆڵەی توندە.

كەواتە: چەند كەسێكی ستەمكار و خراپەكار، دەبنە هۆی هاتنی بەڵایەك بۆ هەموو لایەك، وەك سزایەكی توندی خوا، بۆ زۆرینەیەكی كەمتەرخەمی بێ هەڵوێست.

٢- ﴿ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴾ طه -٨٥-.

واتە: (خوا) فەرمووی: ئێمە دوای خۆت - کەهاتی بۆ بەڵێنگەی چل شەویی - گەلەکەتمان تاقیکردەوە و بەڵامان بۆ ناردوون، وە سامیریی گومرای کردن .
کەواتە: دەگونجێ یەك کەسی خراپەکار، ببێتە هۆکاری بەڵا لێدرانی کۆمەڵگایەك، بەهۆی گومڕاکردن و سەر لێتێکدانییەوە بۆیان.

٣- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْ ... ﴾ آل‌عمران -١٥٥-.

واتە: بەدڵنیایی ئەوانەتان، کە ڕۆژی پێك گەیشتنی دووکۆمەڵەکە، هەڵاتن، تەنیا شەیتان بەهۆی هەندێك لەو - کردەوە خراپان - ەوە کە وەدەستیان هێنا بوون، خلیسکاندنی ..

لێرەدا قسە لەسەر بەشداربووانی جەنگی (ئوحود)ە، بەتایبەت ئەوانەیان کە خۆیان بۆ دژە هێرش و پەلاماری دوژمن ڕانەگرت و، پشتیان لە دوژمن کرد، وەك دەبینین خوای پەنهانزان هەندێك لەگوناهو خراپەکانی، ئەوانەی پشتیان لەدوژمنان کردوە، بەهۆکاری هەڵاتنەکەیان دادەنێ و، ئاشکراشە کە بەهۆی سەرپێچیی کردنی پەنجا کەسە تیرهاوێژەکەی سەر شاخۆلکەی تیرهاوێژان (جبل الرماة)ەوە، لەفەرمانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم - کە فەرمووی: لەهیچ حاڵان دا لەشوێنی خۆتان نەجووڵێن - سوپای ئیسلام بەفەرماندەیەتیی پێغەمبەری خاتەم، جەنگی ئوحودیان دۆڕاند!

کەواتە: کەمێك بوونە هۆکاری شکستی سوپایەك، کەسەرەتای جەنگەگەشیان بردبۆوە و، دوژمنیان شکاندبوو.

**ئنجا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەڵێین:**

ئێمەش - لە عێراق و لە هەرێمی کوردستان دا- پێویستە لەخۆمان وریا بین: چەند کەسێك لەبڕیار بەدەستان، بەهۆی ستەم و قۆرخکاریی و گەندەڵییەوە، کارێك نەکەن کەکۆی کۆمەڵگایەکەمان شایستەی ئەوەبێ، سزاو بەڵای خوا ڕووی تێبکات و، قەوارە سیاسییە نەخۆش و دەردەدارەکەمان، سەری بەفەتارەت بچێ، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً ...﴾ الأنبياء -١١-.

واتە: وە گەلێك ئاوەدانییمان کە ستەمکار بوونە، تێك شکاندوون...

بەڵێ، پێویستە خەڵك و جەماوەر، دەستی ستەمکاران بگرن و، ڕێی ستەم و خراپەیان لێ بگرن، تاکو سەری خۆیان و، کۆمەڵگایەکەشیان بەفەتارەت نەدەن، پێغەمبەری پێشەواشمان، لەو بارەوە هۆشداریی جۆراوجۆری داونە جەماوەر، کەنابێ لەبەرانبەر ستەم و لادانی حوکمڕانانی ستەمکار و لادەردا، بێ دەنگ و بێ هەڵوێست بن، ئەگەرنا، خوا سزای هەموویان پێکەوەو وێکڕا دەدات، بۆ نموونە:

(إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ، أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللَّهُ بِعِقَابِهِ). رواه أصحاب السنن وصحَّحه الترمذي.

واتە: هەرکات خەڵك بابای ستەمکاریان بینی و دەستیان نەگرت و، ڕێیان لێ نەگرت، زۆر نزیکە خوا سزایەکی گشتییان بۆ بنێرێ.

## بنەمای چواردەیەم :
## هۆكاری بنەڕەتیی سەركەوتن و شكستمان، خۆمانین، نەك دەوروبەرمان

ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین، دەبینین زۆر بەڕوون و ڕاشكاویی ڕایدەگەیەنێ، كە هۆكاری بنەڕەتیی سەركەوتن و بەختەوەریی، یان شكست و ناكامیی مرۆڤ، لەسەر ئاستی تاك و كۆمەڵ، خودی مرۆڤە و، هۆكارە دەرەكییەكان، كاریگەریی لاوەكیی (ثانوي) یان هەیە، وە زۆرجار دەرهاویشتەی هۆكارە خودییەكانن، باسەرەتا سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ المائدة -١٠٥-.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئاگاتان لەخۆتان بێ، ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست گرتووبن، ئەوەی گومڕابووە، زیانتان لێ نادات، گەڕانەوەتان بۆ لای خوایە، ئنجا هەواڵی ئەوەتان پێدەدا، كە دەتان كرد.

٢- ﴿.. وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔا... ﴾ آلعمران -١٢٠-.

واتە: وە ئەگەر خۆڕاگربن و پارێزبكەن، پیلان و فێڵی ئەوان (دوژمنان) هیچ زیانتان لێ نادات.

٣- ﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ ... ﴾ آلعمران -١٦٥-.

واتە: ئایا کەبەڵایەکتان تووش بوو(کە شکستی جەنگی ئوحود بوو، وە کوژرانی حەفتا لەهاوەڵان بوو) کە ئێوە (لەجەنگی بەدردا) دوو هێندەی ئەوەتان دەستکەوت بوو (کە کوشتنی حەفتا کەس و، بەدیل گرتنی حەفتا کەس بوو) بەسەرسوڕمانەوە گوتتان: ئەمە لەکوێوە بوو؟ بڵێ: ئەوە لەخۆتانەوە بوو.

٤- ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴾ الشورى -٣٠-.

واتە: وە هەر بەڵاو نارەحەتییەکتان بەسەر بێ، کردەی دەستی خۆتانە، وە(خوا) لەزۆریش دەبووری.

٥- ﴿ وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ الأعراف -٩٦-.

واتە: وە ئەگەر خەڵکی ئاوەدانییەکان بڕوایان هێناباو پارێزیان کردبایە، دەروازەی پیت و پیرۆزەکانی ئاسمان و زەویمان بەسەردا دەکردنەوە، بەڵام بێبڕوابوون، بۆیە بەهۆی ئەو (خراپان)ەوە، کە دەیانکردن، گرتمانن و سزاماندان.

لەکۆی ئەم ئایەتە بەپێزانەش دەفامرێتەوە، کەئەوە هەڵەو کەمتەرخەمیی و کەم و کوڕییەکانی مرۆڤەکانن - چ وەك تاك، چ وەك کۆمەڵ - کەهۆکاری نەهامەتیی و بەڵاو گرفتارییەکانیانن، هەروەها دوژمن و ناحەزانیشیان، هەر لەسۆنگەی ئەوەوە، زەفەریان پێ دەبەن.

هەر بۆیەش کاتێك مرۆڤ - چ وەك تاك، چ وەك کۆمەڵ - ڕێك و پێك بێ و ڕێی ڕاست گرتوو(مهتدي) بێ و، خۆی لەهەڵە و تاوان و لادان بپارێزێ، نەبەڵا و نەهامەتییەکان و، نە دوژمن و ناحەزانیش، زەفەری پێ نابەن، چونکە ئەوان هەر لەڕێی ئەو کەلێن و درزانەوە بۆی دێن، کەخۆی دروستی کردوون.

**کەواتـــە:**

با هەمیشە لەجیاتی خەتای ئەم و ئەو گرتن، چاو بەخۆمان دابگێڕینەوە و خۆمان لەهەڵە و پەڵە و کەم و کوڕییەکانمان، بژار بکەین، چونکە بێگومان بەزۆریی

هەڵە و پەڵە و لادان و تاوانەکانمانن، کە زەمینە بۆ هۆکارە دەرەکییەکانیش دەڕەخسێنن، کە زیانمان لێ بدەن.

نەك هۆکارە دەرەکییەکان بکەینە بیانووو پاساوو، پینە و پەڕۆی هەڵە و پەڵە و کەمتەرخەمییەکانمانی پێ بکەین و، سەرەنجام بەهەڵە و کەم و کوڕیی و لادان و تاوانەکانمانەوە بتلێینەوە و، بەردەوام بەڵاو نەهامەتییەکانمان، بەهۆی هۆکارە بنەڕەتییە خودییەکانمانەوە، دوو بارە ببنەوە!

**بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد، دەڵێین:**

با ئێمەش لەهەرێمی کوردستان دا، چی دیکە بۆ خۆدزینەوەو دان پێدانەهێنانی هۆکارە ڕاستەقینەکانی کێشە و قەیرانەکانمان، کە لەخۆمانەوە سەرچاوەیان گرتوە، بیانوو بەشەڕی داعش و، بودجە بڕینی بەغداد و، دابەزینی نرخی نەوت نەهێنینەوە، چونکە هەرچەندە هەرکام لەو شتانە کاریگەریی نەرێنییان لەسەر بارودۆخی هەرێم هەبووە، بەڵام هۆکاری بنەڕەتیی گەورەو بێڕەزای کێشە و قەیرانەکانمان، بەتایبەت لە ڕووی سیاسیی و ئابوورییەوە، خۆمانین، بەتایبەت، کە بڕیار بەدەستانی هەرێم لەماوەی چارەگە سەدەی ڕابردوودا، ئیرادەیەکی جیددییان نەبووە بۆ:

١- هێنانەدی سیستمێکی حوکمڕانیی ڕاست و ڕەشید.
٢- هەبوونی دامەزراوەکان: پەرلەمان، حکومەت، دادوەریی، سوپایەکی نیشتمانیی..
٣- سەروەرکردنی یاسا، بەسەر هەمووکەس و هەموو لایەك دا.
٤- بە پێوەر گرتنی هاووڵاتیی بوون، نەك ئینتیمای حیزبیی و سیاسیی و بنەماڵەیی.
٥- چەسپاندنی دادگەریی و ڕیشەکێش کردنی گەندەڵیی و ستەمکاریی و قۆرخکاریی.

دیارە لەئەنجامی ئەوەشدا، زەمینە بۆ هۆکارە دەرەکییەکانیش خۆش بوو، کە ڕۆڵی خۆیان لەدروستکردن و قووڵکردنەوەی قەیرانەکان دا بگێڕن، هەروەها لە ئەنجامی نەخۆشیی و گرفتە خودییەکانەدا، هەرێم لەهەموو ڕوویێکەوە: سیاسیی، ئابووریی، سەربازیی، پەیوەندییەکان، بێهێزیی ڕووی تێکردووەو، نەیتوانیوە بەسەر قەیران و کێشەکانی دا زاڵ بێ و، سەرەنجام ئەم بارودۆخە قەیراناوییە هاتۆتەدی.

## بنەمای پازدەیەم :

## خەرجیی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و خراپە، زۆرکەمترە، لەباجی بەردەوامبوون لەسەر ملکەچکردن بۆ ستەم و خراپە

بێگومان ئەوە ڕاستییەکی جەربێندراوو سەلمێنراوە، کە تێچوو(خرجی)ی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و خراپە (الظلم والفساد) هەمیشە لە باج (ضريبة)ی ملکەچکردن بۆ ستەم و خراپە و، مانەوە لەژێر نیری ستەمکاراندا، سووکترو کەمترە.

ئێستاش باسەرەتا سەرنجی دوو ئایەتی بەپێزی قورئان بدەین، کە خوای زانا و توانا تێیان دا، باسی مشت و مڕو وتووێژێکی مووسا "عليه السلام" و گەلەکەی (بني إسرائيل) دەکات:

﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦۖ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ الأعراف-١٢٨-١٢٩-.

واتە: مووسا بەگەلەکەی فەرموو: یارمەتی لەخوا وەربگرن و خۆڕاگربن، بێگومان زەوی هی خوایە، دەیکاتە میرات هەر کام لەبەندەکانی کە بیەوێ، وە سەرەنجام بۆ پارێزکارانە.

(گەلەکەی ) گوتیان: بەرلەوەی بێیە لامان و، دوای ئەوەش، کە هاتیە لامان، هەر ئازار دراین (لەلایەن فیرعەون و دەستە و دایەرەکەیەوە) (مووسا) فەرمووی: نزیکە پەروەردگارتان دوژمنتان بفەوتێنێ و، ئێوە لەو سەرزەمینە (ی وان) بکاتە جێنشین، ئنجا تەماشا بکات: داخۆ چۆن دەکەن؟

**هەڵبەتە ئەو ڕاستییەی کردوومانەتە ناوونیشانی ئەم بنەمایەی پازدەیەم:**

(خەرجیی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و خراپە، کەمترە لەباجی بەردەوام بوون لەسەر ملکەچکردن بۆ ستەم و خراپە) وەك ڕۆژی لەژیان و بەسەرهاتی گەلی مووسا (بني إسرائيل)دا دیارە، کە فیرعەون دەیچەوساندنەوە و سۆغرە و بێگاریی پێدەکردن و وەك کۆیلە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، چونکە دوای ئەوەی خوای میهرەبان مووسای نارد بۆ دەربازکردنیان و، بەقسەی مووسایان کرد و، لەسەر بەرەنگاربوونەوەی فیرعەون و سیاسەتە ستەمکارانەکەی خۆڕاگربوون، سەرەنجام قوتاربوون و، فیرعەون و دارودەستە و سوپایەکەشی لە بەین چوون، بەڵام ئەگەر هاتبا و هەر لەسەر ملکەچکردن و ژێردەستەییەکەیان بەردەوام بووبان و، هیچ بەرهەڵستیی فیرعەونیان نەکردبایە و، ئەو تێچوو(خرجي)ە کەمەی بەرەنگاربوونەوەیان نەدابایە، دەبوو هەر لەسەر باج (ضريبة) دانی بێڕەزای ژێردەستەیی و زەبوونیی، کە وێڕای سوغرە و بێگار و چەوسێنرانەوە، سەربڕانی کوڕەکانیان و، هێشتنەوەی کچەکانیان بوو! بەردەوام بووبان!

وەك خوای بەرزومەزن لەوبارەیەوە فەرموویەتی:

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ ابراهيم -٦-.

واتە: وە یاد بکەوە، کاتێك مووسا بەگەلەکەی فەرموو: چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، کە لەدارودەستەی فیرعەون دەربازی کردن، خراپترین ئازاریان پێ دەچێژتن،وە کوڕەکانتانیان سەر دەبڕی و، ئافرەتەکانتان بەزیندوویی

دەهێشتنەوە، وە لەو حاڵەتان دا - کەخوا ڕزگاریی کردن - تاقیکردنەوەیەکی مەزنی پەروەردگارتان هەبوو.

شایانی باسیشە بەرهەڵستیی کردنی ستەم و چەوساندنەوەی ستەمکاران و بەرەنگاربونەوەی، بەگوێرەی حاڵەت و هەل و مەرجە جیاواز و جۆراوجۆرەکان، شێواز و میکانیزمی جۆراوجۆر دەخوازێ، گرنگ خۆڕاگریی و پشوو درێژیی و خۆبەدەستەوە نەدان و، بەچۆك دانەهاتن و، ڕەفز کردنی بارودۆخی ستەمکارانەو، دان پێدانەهێنانی و، ڕەوایەتیی (شرعیة) پێ نەدانیەتی.

ئەگەرنا ئەوەی تێبینی دەکرێ: تێکڕای پێغەمبەران (علیهم السلام) هەرفەرمانیان بەشوێنکەوتووە چەوساوەکانیان کردوە، کەخۆڕاگربن و، هیچ پێغەمبەرێك ئاماژەی بەبەکارهێنانی هێز نەکردوە! وە خوای کاربەجێ لەسەر زمانی سەرجەم پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان، ڕووبە حوکمڕانە ملهوڕ و خۆسەپێن و ستەمکارەنیان، فەرموویەتی:

﴿...وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾ ابراهیم -١٢-.

واتە: وە بەدڵنیاییی هەر خۆڕاگر دەبین، لەسەر ئەو ئازارەی دەماندەن، وە پشت بەستووانیش باهەر پشت بەخوا ببەستن.

ئنجا هەرچەندە حوکمڕانە ستەمکار و خۆشگوزەران و خۆسەپێنەکان، بەسامان و دەسەڵاتە ناڕەواو لەخەڵك و جەماوەر زەوتکراوەکەیان، پشت ئەستووربن، بەڵام سەرەنجام هەر بۆخەڵك و جەماوەری چەوساوەو خۆڕاگرە، چونکە ویست(إرادة)ی خوای باڵادەستیان لەپشتە، وەك لەبنەمای شازدەیەم دا دەیخەینە ڕوو.

## بنەمای شازدەیەم :
## ویستی خوای دادگەر، پشتیوانی چەوساوانە و، دژی ستەمکار و چەوسێنەرانە

بەڵێ، یەکێك لەیاسایەکانی خوا (سنن الله) لەژیانی بەشەردا، ئەوەیە کە خوای کاربەجێی باڵادەست، هاوکار و پشتیوانی خەڵکی ستەمدیدە و چەوساوەیەو، دژی ستەمکارانی خۆسەپێن و چەوسێنەرە.

**ئەم ڕاستییەش وەك خۆری دراوشاوە بەنێوە ڕاستی ئاسمانەوە، لەم دوو ئایەتەدا دەدرەوشێنەوە:**

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ٥ وَنُمَكِّنَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنُرِيَ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنۡهُم مَّا كَانُواْ يَحۡذَرُونَ ﴾ القصص-٥-٦-.

واتە: وە دەمانەوێ چاکە لەگەڵ ئەوانە دابکەین، کە لەزەویدا چەوسێنرانەوە (واتە: بەنی ئیسرائیل ) وە بیانکەینە پێشەوا (حوکمڕان) و بیانکەینە میراتگر (بۆ فیرعەون و دارودەستەکەی) وە (دەمانەوێ) کە دەستڕۆیشتوویان بکەین لەزەوی دا، وە ئەوەی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان مەترسییان لێی هەبوو، لەلایەن ئەوان (چەوساوان)ەوە، پێشانیان بدەین و بیهێنینەدی.

شایانی باسیشە، کە لەسۆنگەی ئەوەوە، من وشەی دەمانەوێ (نُريدُ) م لێرەدا بەوە لێکدایەوە، کە مەبەست پێی خستنە ڕووی یاسای (سنة) یەکی

خوایە، چونکە وشەی (إرادة) کە لە قورئانێدا بۆ خوای پەروەردگار بەکاردێ، دەگونجێ مەبەست پێی: ویستی یاسا دانەرانە (الإرادة التشريعية)بێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی: ویستی دروستکارانە(الإرادة التكوينية)بێ، ئنجا ئەوەی ئەو دووانەش لەیەك جیادەکاتەوە - کەکامیان مەبەستە - ئەو سیاقەیە، کە وشەی تێدا هاتوەو، ئەو مەبەستەیە، کە بۆی بەکارهێنراوە.

بۆ نموونە:

﴿...يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ...﴾ البقرة-١٨٥-.

واته: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و، زەحمەت و بارگرانیی بۆتان ناوێ.

ئاشکرایە کە مەبەست لە (إرادة) لێرەدا، ویستی یاسادانەرانە (تشريعية)یە، نەك ویستی بنیاتنەرانە (تكوينية)، چونکە خوای میهرەبان باسی ئەوە دەکات، کە ئەگەر لەمانگی ڕەمەزاندا بەسەفەر چوون، یان نەخۆش کەوتن، بۆتان هەیە ئەو ڕۆژانەی کاتی سەفەر و نەخۆشیی نەگرن و، دوایی بیانگرنەوە:

﴿...وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ...﴾البقرة-١٨٥-.

ئنجا، کە دوای ئەوە باسی ویستی ئاسانیی (إرادة اليسر) دەکات، دیارە مەبەست پێی، ویستی شەرعیی یە، چونکە پێشتر ئەوە باسکراوە.

بەڵام لەئایەتی (٥)ی (القصص)دا، ئاشکرایە کە مەبەست پێی خستنەڕووی یاسایەکی گەردوونیی (سنة الكونية)یە، چونکە ئایەتەکانی پێشتر، باسی حاڵەت و واقیعێکی نەخوازراو و، لەگەڵ حیکمەت و دادگەرایی خوادا نەگونجاو، دەکەن، کە بریتیە لەیاخیی بوونی فیرعەون لەسەر زەوی - میصر- و گێڕانی خەڵکەکەی بەچەند چینێك و، چەوساندنەوەی بەشێکیان و، سەربڕینی نێرینەکانیان و، هێشتنەوەی مێینەکانیان و، خراپە کاریی کردنی لە زەمین دا.

﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ القصص-٤-.

کەواتە: کە دوایی دەفەرمویٚ:

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ... ﴾

ئاشکرایە کە مەبەست پێی: خستنە ڕووی یاسایەکی گەردوونییە (سنة الكونية)یە، کە بەرجەستە کەری ویستی گەردوونیی و قەدەریی خوایە، بەگۆڕینی ئەو حاڵەت و واقیعە نەخوازراوەی، کە فیرعەون بەسەر گەلی بەنی ئیسرائیلیدا هێناوە، بۆ حاڵەت و واقیعێکی دیکە، کە خواستی میهرەبانیی و حیکمەتی خوایە.

ئنجا بێگومان دەرك کردنی ئەو ڕاستییە: هەم مایەی دڵخۆشیی و تین و وزە وە بەرنانی چەوساوانە و، هەم زەنگێکی هۆشیاریی و بێدارییشە، بۆ ستەمکارانی چەوسێنەر و خۆسەپێن، چونکە :
بەدڵنیایی هەرچی خوا بیەویٚ، دەبیٚ و دێتەدی:

﴿ ... إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴾ الحج -١٤-

واتە : خوا هەرچی بویٚ، دەیکات.

﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾ البروج -١٦-.

واتە: خوا زۆرباش ئەنجامدەری هەرشتێکە کەبیەویٚ.

خوای داد گەریش بەویستی گەردوونیی خۆی (الإرادة التكوينية) ویستوویەتی و دەیەویٚ، چەوساوان و ستەمدیدان، لەبن نیری زۆرداران و ملهوڕان دەربێنیٚ و، بیانکاتە جێنشین و میراتگریان!

بنەمای حەڤدەیەم :

## با لەسەر بناغەی دڵسۆزیی و ساغیی و ڕاستیی (النُّصْح والإخلاص والصدق) بۆیەكدی، پێكەوە مامەڵە بكەین، نەك بەگرێ و گۆڵی دەروونییەوە

دڵسۆزیی و ساغیی و ڕاستیی (النُّصْح والإخلاص والصدق) سێ سیفەتی گەورەو بنەڕەتیی پێغەمبەرانی خوان (علیهم السلام)، كە لەسەر بناغەیان، مامەڵەیان لەگەڵ خەڵكدا كردوە، بە یار و نەیار و، چاك و خراپیانەوە.

ئنجا ئێمە لێرەدا تەنیا قسە لەبارەی دڵسۆزیی (نصیحة)یەوە دەكەین، چونكە دڵسۆزیی، هەركام لەساغیی و ڕاستییش دەگرێتە خۆی و، هەركەسێك بۆ خەڵك دڵسۆزو بەپەرۆش بێ، لەگەڵیشیان ساغ و ڕاست دەبێ.
سەرەتاش باسەرنجی چەند دەقێكی قورئان و سوننەت بدەین:

١- ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمْ ... ﴾ الأعراف -٦٢-.

واتە: پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێڕادەگەیەنم و، دڵسۆزیتان بۆ دەنوێنم.

٢- ﴿أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ الأعراف -٦٨-.

واتە: پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێڕادەگەیەنم و من بۆتان دڵسۆزێكی ئەمیندارم.

٣- ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ ... ﴾
الأعراف -٧٩-.

واتە: پشتی تێکردن و فەرموویی: ئەی گەلەکەم! بەدڵنیایی پەیامی پەروەردگارمم پێڕاگەیاندن، وە دڵسۆزیی و پەرۆشیم بۆ نواندن.

٤- ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ ﴾ الأعراف -٩٣-.

واتە: پشتی تێکردن و فەرمووی: ئەی گەلەکەم! بەدڵنیایی پەیامەکانی پەروەردگارمم پێڕاگەیاندن، وە دڵسۆزییم بۆ نواندن.

**وەك دەبینین:**

چوار لەپێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا (علیهم السلام)، کە (نوح و هود و صالح و شعیب)ن، بەگەلەکانیان - کە بەگشتی بڕواشیان پێیان نەهێناوە و، لەسەر کوفر ماونەوە - ڕادەگەیەنن، کە بۆیان بەپەرۆشن و دڵسۆزن.

٥- (الدِّينُ النَّصِيحةُ: قلنا : لِمَنْ ؟ قَالَ : لِلهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ المُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ) رواه مسلم:٥٥ والبخاري:٧٠ بلفظ قريب منه.

واتە: دینداریی دڵسۆزیی یە، گوتمان: بۆکێ؟ فەرمووی: بۆ خوا و، بۆ کتێبەکەی و، بۆ پێغەمبەرەکەی و، بۆ پێشەوایان و (حوکمڕانان)ی مسوڵمانان و، بۆ تێکڕایان.

شایانی باسیشە کە وشەی (نصیحة) هەرچەندە، کە لەزمانی کوردیی دا، بەمانای ئامۆژگاریی (موعظة) بەکاردێ، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، بۆیە من بەمانای (دڵسۆزیی و بەتەنگەوە بوون) لێکم داوەتەوە، چونکە زانایان بەم جۆرە پێناسەیان کردوە:

(النُّصح والنَّصيحة: إرادة الخير للمنصوح) واتە:(نصح) و(نصیحە) بریتیە لەوەی، کە هەرچی بۆ بەرانبەرەکەت باشە و سوودی هەیە، ئەوەت بۆی بوێ.

**ئنجا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەڵێین:**

هەرکەسێکی بەر پرس و مشورخۆری وڵات، مادام خۆی بەمسوڵمان و شوێنکەوتووی پێغەمبەران (علیهم السلام) بزانێ، پێویستە لەمامەڵەی لەگەڵ

خەڵك و جەماوەردا بەگشتیی و، بەرپرس و مشوور خۆرانی دیکەدا بەتایبەت، دڵسۆز و ساغ و ڕاست و بێ گریّ بێ و، دڵ و زمان و پەنهان و ئاشكرای لەگەڵیان دا، وەك یەك بێ.

وە لەڕاستییدا خەسڵەتە خراپەكانی وەك: درۆ و، دووڕوویی و، حەسەد و، بوغز و غەرەز و، خۆ بەزلگریی و.. هتد، لەهەموو كەس هەر ناشیرن و دزێون، بەڵام لەبابای بەرپرس و مشوورخۆری خەڵك و وڵات، بەتایبەت لەگەڵ هاوەڵانی بەرپرس و مشوور خۆری دا، ناشیرینتر و خراپترن!

لەكۆتاییشدا دەڵێم:

ڕەوشتی بەرز و خەسڵەتی پەسند، بۆ هەموو بوارەكانی ژیان و گوزەران، پێویستە، بەڵام بۆ بواری حوكمڕانیی و كاری سیاسیی پێویستترە، وە لەڕاستییدا هەركات بواری سیاسیی و حوكمڕانیی، ڕەوشتی بەرز و ئاكاری پەسندی تێدا نەماو، بوو بە مەیدانی درۆ و دەلەسە و قۆڵبڕین و نیفاق و فریودان، ئەوە بۆ خەڵك و كۆمەڵگا دەبێتە ژەهر و ژەقنە مووت و، مایەی نەخۆشیی و ناخۆشیی و، سەرەنجام بنكۆڵ بوون و، پووچەڵ بوون و داڕووخانی، كۆمەڵگاو دەوڵەت.

زۆریش حەیف و مەخابن، كە لەئەنجامی ئەزموونی چەندان ساڵەی كارو چالاكیی سیاسیی دا، گەیشتوومە ئەو قەناعەتەی، كە دڵسۆزیی (نصح) و، ڕەوشت و ئاكارە بەرز و پەسندەكانی دیكەی وەك: ڕاستیی و، ساغیی و، دادگەریی و، بەزەیی و، وەفاداریی و، جوامێریی.. لەنێو كارو كایەی سیاسییدا، لەعێراق و لەهەرێمی كوردستاندا، زۆر كەمە و، ئەوەش هۆ كارێكی گرنگی ئەم واقیع هەل و مەرجە نەخۆش و ناخۆشەمانە!

## بنەمای هەژدەیەم :

## با لەواقیع دا بژین، نەك لە مێژوودا و، لێنەگەڕێین ڕابردوومان دەستمان ببەستێ، لەبەردەم ئێستامان دا

کۆمەڵگای کارا و زیندوو، کۆمەڵگایەکە، جاروبار ئاوڕ لە مێژوو دەداتەوە، بۆ دەرس و پەند لێ وەرگرتنی، بەڵام هەمیشە لەواقیع دا دەژی، وە هەرچەندە هەوڵ دەدات ئاگاداری ڕابردووی بێ، بەڵام هەرگیز ڕێ نادات ڕابردووی لەبەردەم ئێستادا، دەستی ببەستێ و، لەبەرانبەر ڕووداوو پێشهاتەکان دا، دەستە و ئەژنۆ دابنیشێ.

خوای بەرز و بێ هاوتا، لە دوو ئایەتی بەپێزی کۆتایی کتێب و فەرمایشتی خۆیدا باسی ئەو ڕاستییەی سەرەوەی کردوە:

﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ البقرة -١٤١،١٣٤-.

واتە: ئەوانە - مەبەست خاوەن کتێبەکانە - کۆمەڵێك بوون، ڕابردوون، ئەوەی وەدەستیان هێناوە - لەکردەوان - هی خۆیانە، ئێوەش هەرچی وەدەستتان هێناوە، هی خۆتانە، وە لەوەی کە دەیانکرد، ئێوە لێتان ناپرسرێتەوە.

بۆیەش وەك هەژدەیەمین بنەمای قورئانیی پێویست، بۆ چارەسەری بارودۆخی دەردەدارو نەخۆش و، واقیعی ناهەموار و ناخۆشی عێراق و هەرێمی کوردستان، باسی ئەو ڕاستییەم کرد، کە پێویستە لە واقیع دا بژین و، مێژوو ڕابردوو پەلکێشمان نەکات و، بەرەو دواوە ڕامان نەکێشێ و، لەسەر حیسابی

ئێستامان بە ڕابردووەوە خەریك نەبین، چونکە باش ئاگادارم، کە لەسەر ئاستی کەس و گرووپ و تیرە و هۆز و لایەنی سیاسیی، لە مێژوودا ژیان و، گرێ دراویی بەڕابردووەوە زۆرەو، بگرە هۆکارێکی سەرەکیی زۆرێك لەکێشەکان، ئەو حاڵەتە فیکریی و دەروونییە یە.

بەڵێ، ئەگەر بمانەوێ لە عێراق و لە هەرێمی کوردستان دا - هەروەها لەهەر شوێن و بەشێکی دیکەی کوردستان و جیهانیشدا - کۆمەڵگایەکی تۆکمە و قەوارەیەکی سیاسیی پتەو و نەلەخشاو بنیات بنێین، پێویستە عەقڵ و دڵی خۆمان لە گرێ و گۆڵە دەروونیی و مێژووییەکان بژار بکەین و، پاك بکەینەوە و، لەقاوغ و قەپێلکی تەسکی بەرژەوەندییە کەسیی و بنەماڵەیی و حیزبییەکان بێینە دەر، بۆ نێو بازنە و فەزای فراوانی خەڵك و وڵات.

کە بێگومان ئەوەش، بەبێ هێنانەدی تێگەیشتن و بیرۆکە ڕاست و دروست و، بەهاو ئاکارە بەرزو پەسندەکان، مەیسەر نابێ، کە لەبنەمای نۆزدەیەمدا، تیشکێك دەخەینە سەر ئەو بابەتە گرنگە.

## بنەمای نۆزدەیەم :

## تێگەیشتن و بیرۆکە ڕاست و، ئاکار و بەها بەرزەکان، هۆکارێکی گرنگی تەبایی کۆمەڵایەتیی و سیاسیین، لەکۆمەڵگادا

تەبایی و گەشە کردن و پێشکەوتنی کۆمەڵگا، یان بەپێچەوانەوە: ناتەبایی پووکانەوە و دواکەوتنی، تاڕاددەیەکی زۆر بەرهەمی ئەو بیرۆکە ڕاست و سوود بەخشە، یان هەڵە و زیان بەخشانەیە، کە لەعەقڵ و هۆشیان دا جێگیر دەبن، وە بەرهەمی ئەو ئاکارو خەسڵەتە بەرز و پەسند، یان خراپ و پەستانەیە، کە لەگەڵ دڵ و دەروونیان دا، ئاوێتە دەبن.

هەر بۆیەش پێغەمبەری کۆتایی(محمد)صلی الله علیه وسلم بەفەرمانی خوا، گرنگیی زۆری بە فێر کردن و پەروەردەکردن (التعليم والتربية) داوەو، خوای زانا وشارەزا لەچوار شوێنی قورئاندا، چوار ئەرکە سەرەکییەکەی پێغەمبەری خۆی، لەو دوو بوارەدا چڕکردوونەوە:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ... ﴾ الجمعه -٢-.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە، کەلە نێو نەشارەزایان دا، پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردوە ئایەتەکانییان بەسەر دەخوێنێتەوە و، کتێب و حیکمەتیان فێردەکات.

هەروەها هەمان مەبەست بە تۆزێك جیاوازییەوە، لەئایەتەکانی: (١٢٩) و (١٥١)ی (البقرة) و، (١٦٤)ی (آل عمران)یشدا هاتوە.

وە بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە تەبایی و گەشە کردن و پێشکەوتنی کۆمەڵگا، تا ڕاددەیەکی زۆر بەرهەمی بیرۆکە ڕاستەکانی نێو عەقڵ و هۆش و، خەسڵەت و ئاکارە پەسندەکانی نێو دڵ و دەروونی تاکەکانی کۆمەڵگایە، با سەرنجی ئەم ئایەتانە بدەین:

﴿ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ ... ﴾ آل عمران -١٠١-١٠٣-.

واتە: وە چۆن بێبڕوا دەبن! لەحاڵێکدا کە ئێوە ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێندرێنەوە و، پێغەمبەرەکەشی لەنێوتان دایە؟! وە هەرکەس دەست بە (بەرنامەی) خواوە بگرێ، ئەوە بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنمایی کراوە، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەك بۆ خوا شایستەیە، پارێزی لێ بکەن و، بەمسوڵمانییش نەبێ مەمرن، وە تێکڕا دەست بەڕێسمانی خواوە بگرن و، پەرتەواز مەبن، وە یادی چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە بکەنەوە، کە پێکەوە دوژمن بوون، بەڵام (بەهۆی ئیسلامەوە) دڵتانی پێکەوە جۆشدا..

وەك دەبینن: خوای کاربەجێ سەرەتا باسی بەسەرداخوێندرانەوەی ئایەتەکانی قورئان و ئامادەبوونی پێغەمبەرەکەی (لەم ڕۆژگارەش دا ڕێبازەکەی) لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەم دا و، ڕێنمایی کرانیان بەرەو ڕاستە ڕێ (کە ئەویش ئیسلامە و کۆی قورئان و سوننەتە)، دەکات.

واتە: باسی بیرۆکە ڕاستەکان و، هۆشیار بوونەوەی عەقڵیان بە زانیاریی ڕاست و بێ هەڵەی وەرگیراو لە وەحی، دەکات.

پاشان باسی پارێزکاریی (تقوى)ی شایستە بۆ خوا دەکات.

یانی: باسی بێداربوونەوەی دڵ و دەروون، بەهۆی پەیوەست بوون بە خواوە و، ڕازانەوەی بە خەسڵەتە پەسندەکان( فضائل) و ئاکارە بەرزەکان دەکات، چونکە گوتراوە:

(التقوى ينبوع الفضائل كلّها)، واتە: پارێزکاریی کانگای گشت خەسڵەتە بەرزەکانە.

ئنجا لە قۆناغی سێیەمدا، باسی تەبایی و یەکڕیزیی مسوڵمانان و، دڵ و دەروون پێکەوە جۆشدرانیان دەکات، کە ئەویش زادە و بەرهەمی هۆشیار بوونەوەو، ڕۆشن بوونەوەی عەقڵیانە، بەبووںناسیی (معرفة الوجود)ی ڕاست و، ئیمان و عەقیدەی ساغ و، زانیاریی و بیرۆکەی دروست و بەجێ، وە بەرهەمی بێدار بوونەوەی دڵ و دەروونیانە، بەهۆی تەقواو تەزکییە و، خەسڵەتە بەرز و پەسندەکان و ئاکارە بەرزەکانەوە.

**ئنجا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەڵێین:**

ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگایەکەمان تەبا و ڕێك و گەشەسەند و پێشکەوتوو بێ، نابێ تەنیا چاو لەسەر چاکسازیی کردن لە بواری سیاسییدا چڕدا بگرین، وەك هێنانە دی سیستمێکی حوکمڕانیی ڕاست و ڕەشید و، بە دامەزراوەکردنی کارەکان و، یاسا سەروەریی و، بەپێوەر گرتنی هاووڵاتێتیی، بەڵکو پێویستە هاوکات لەگەڵ چاکسازیی سیاسیی، کاری جیددییش لەسەر چاکسازیی فیکریی و ڕووحیی و ئەخلاقیی و کۆمەڵایەتییش بکەین.

وە پێویستە بزانین، کە ئەو تەبایی و هێمنییە کۆمەڵایەتیی و سیاسییە و، گەشەسەندن و پێشکەوتنە شارستانیی و، ئەدەب و سەلیقە ژیاریی و کۆمەڵایەتیی و، کلتوور (ثقافة) و نەریتە جوان و دڵگیرانەی لە وڵاتانی ڕۆژ ئاوادا هەن، بەرلەوەی زادە و بەرهەمی بارودۆخی سیاسیی و، حوکمڕانیی ڕەشید و دروستیان بێ، بەرهەمی ئەو پاکسازیی و چاکسازیی و گۆڕانکارییەیە، کە لە عەقڵ و دڵ و دەروونیان دا کردوویانە، کە ئەویش زۆرێك لە توێژو پێکهاتەکانی کۆمەڵگاکانیان پێی هەڵساون، لە حیزبی سیاسیی و ڕێکخراوی مەدەنیی و نووسەر و هونەرمەند و ئەدیب و شاعیر و زانایانی ئایین و سیاسەتمەدار و.....هتد، بگرە ئەگەر پاکسازیی و چاکسازیی و گۆڕانکارییان، لەبواری فیکریی و فەرهەنگیی و کۆمەڵایەتییاندا نەبووایە، مەحاڵ بوو بتوانن گۆڕانکاریی ئەرێنیی لەبواری حوکمڕانیی دا بکەن، چونکە بێگومان فیکر و کلتوور و ئاکار و ڕەوشت، بناغە و ژێرخانی سیاسەت و حوکمڕانیین.

## بنەمای بیستەم :

## تەبایی و هاوكاریی پێكەوە كردنی پێكهاتەكانی كۆمەڵگا، مەرجی بنەڕەتیی بەرەو پێشچوون و سەركەوتنیەتی

وەك پێشتریش باسمان كرد - لەبنەمای سێزدەیەم دا - تێكدان (تخریب) بەكەمانیش دەكرێ و ئاسانە، بەڵام بنیاتنان (بناء) قورس و زەحمەتە، بەزۆرینە یان لانی كەم: خەڵكێكی زۆر نەبێ، ناكرێ.

هەر بۆیەش هەر كۆمەڵگایەك بیەوێ بەرەوپێش چوون و سەركەوتن و، سەرەنجام بەختەوەریی دنیا و سەرفرازیی دوارِۆژ، بۆخۆی دەستەبەر و مسۆگەر بكات، بەبێ تەبایی نێوخۆ و هاوكاریی و دەستبار بۆیەكدی گرتنی، تێكڕای پێكهاتەكان (مكوِّنات) بەو ئامانجە ناگات.

هەر بۆیەش لەزۆر دەقی قورئانی بەپێزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێز (صلى الله عليه وسلم) دا، جەخت لەسەر تەبایی و یەكڕیزیی و هاوكاریی پێكەوەكردنی، تاكەكان و پێكهاتەكانی كۆمەڵگا كراوەتەوە، بۆ نموونە:

١- ﴿ ..وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ .. ﴾ المائدة -٢-.

واتە: وە لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی، پێكەوە هاوكاریی بكەن..

٢- ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ .. ﴾ التوبة -٧١-.

واتە: وە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتی بڕوادار، هەندێكیان دۆست و پشتیوانی هەندێكیانن..

٣- (المؤمن للمؤمن كالبنيان يَشُدُّ بعضُهُ بَعْضاً - وشبَّك بين أصابِعه-) رواه البخاري: ٢٤،٤٦، ومسلم: ٢٥٨٥.

واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار، وەك دیوارە، هەندێکی هەندێکی قایم دەکات - وە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پەنجەکانی هەردووك دەستی خستنە نێو یەکدی-.

بەڵێ، تەبایی و هاوکاریی نێوخۆی کۆمەڵگا، مایەی بەهێز و پێزبوونی و گەشەکردن و بەرەو پێشچوونیەتی، وە بەپێچەوانەشەوە: ناتەبایی و ناکۆکیی کۆمەڵگا، هێز و پێزی ناهێڵێ و، پووچەڵ و بێخێری دەکات و، بەرە و پاشەوەی دەبات.

دەشتوانین بۆ وێناکردنی گرنگیی و پێویستیی تەبایی و یەکدەنگیی و ڕەنگیی کۆمەڵگا، چوار ژمارەی: (١،١،١،١) بە وێنە بێنینەوە:

ئەو چوار ژمارەیە، ئەگەر بەپرژو بڵاویی دابنرێن: (١+١+١+١=٤) تەنیا بەهاو هێزی چوار (٤) وەدی دێنن:

بەڵام ئەگەر بێت و بەشێوەیەکی ڕێك و پێك ڕیز بکرێن، بەمجۆرە:(١١١١) بەهاو هێزی: هەزار و سەد و یازدە(١١١١) یان لێ پێکدێ، کە لەگەڵ (٤) زۆر جیاوازن!

کەواتە: ڕێك وپێکیی و یەکڕیزیی لە هەرشتێك دا، هۆکاری هێزوپێزو تۆکمەیی یە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکی دا، بەزەیی و هاوسۆزیی و خۆشویستنی مسوڵمانان بۆ یەکدی، وەك پێکەوە پەیوەستبوونی ئەندامانی جەستەیەك، وێنا دەکات و دەفەرموێ: (مَثَلُ المؤمنين في توادِّهِم وتراحمهم وتعاطفهم مَثَلُ الجَسَدِ، اذا اشتكى منه عضوٌ، تداعى له سائِرُ الجسد بالسَّهَرِ والحُمَّى) رواه البخاري: ٦٠١١،ومسلم:٢٥٨٦.

واتە: وێنەی بڕواداران، لەیەکدی خۆشویستن و بەزەیی بەیەکدا هاتنەوە و هاوسۆزییان لەگەڵ یەکدا، وەك جەستەیەك وایە، ئەگەر ئەندامێکی نەساغ بوو، تێکڕای جەستە، بەشەو نخوونیی و تالێهاتن بەشداریی دەکات.

وە بەپێچەوانەوە: پەرتەوازەیی و دووبەرەکیی و ناکۆکیی، مایەی بێهێز و پێزیی و پووکانەوەو پووچەڵ بوونە، وەك خوای بێ هاوتا فەرمووییەتی:

﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ الأنفال-٤٦-.

واتە: وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، وە پێکەوە ناکۆك مەبن، ئەگەرنا فەشەل دێنن و، هێز و پێزتان نامێنێ، وەخۆڕگربن، بێگومان خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە.

دەشتوانین بۆ وێناکردنی چۆنیەتی نەمانی هێز و پێز، بەهۆی ناکۆکیی و دووبەرەکییەوە، ئەم وێنەیە بێنینەوە.

ئەگەر سەد (١٠٠) کەس یاریی گوریس پچڕکێنە (جَرُّالحَبْل) بکەن، پەنجا (٥٠) کەس لەلایەك و، پەنجاش لەلایەکی دیکە، بێگومان هەرکام لەو دوو پەنجاکەسە، هێزی یەکدی سفر دەکەنەوە و، سەرەنجام هێزی ئەو سەد کەسە، دەبێتە هیچ (صفر)!

بەڵام ئەگەر ئەو سەد کەسە، هەموویان بەیەك ئاڕاستە (إتجاه)دا، هێزی خۆیان بخەنە کار، دەبێتە هێزی سەد کەس!

هەڵبەتە گەلی کوردیش زۆرجاران بەهۆی ناکۆکیی و پەرتەوازەییەوە، هێز و پێزی مادديی و مەعنەویی خۆی سفر کردۆتەوە، کەبەداخەوە هەتا ئەم تاوە (لحظة)یەش، کە ئەم وتارەی تێدا دەنووسم، ئەو حاڵەتە خۆکوژییە، لەسەر ئاستی کۆی نەتەوەی کورد لە هەموو کوردستان دا و، لەسەر ئاستی هەر کام لەبەشەکانیشی، هەر بەردەوامە و، نازانم کەی گەلی کورد، واز لەو گوریس پچڕکێنە شوومە دێنێ؟!

## بنەمای بیست و یەکەم :

## بەهۆی نەزانیی و ترس و تەماعەوە، خەڵك بەژێر دەستەیی ستەمکاران، قایل دەبێ

هەمیشە حوکمڕانە خۆ بەزلگر و خۆسەپێنەکان، ویستوویانە بەهۆی سێکوچکەی: (نەزانیی+ترس + تەماع)ەوە، زەفەر بەخەڵکی ببەن و، لەژێرنیری چەوساندنەوەی خۆیان دا، بیان هێڵنەوە.

هەر بۆیەش هەر حوکمڕانێکی ستەمکار و خۆسەپێن، هەمیشە لەهەوڵی ئەوە دایە هەرکام: دەستەڵات و سامان و ڕاگەیاندن (السلطة والثروة والإعلام) بۆخۆی و وابەستە و دابەستەکانی، قۆرخ بکات، تاکو:

١- بەهۆی دەستەڵاتە ناڕەوایەکەیەوە، خەڵك و جەماوەر بترسێنێ.

٢- وە بەهۆی پارە و سامانە حەڕامەکەیەوە، تەماعیان وەبەرنێ و زاریان شیرین بکات.

٣- وە بەهۆی ڕاگەیاندنی چەواشەکەریەوە، لە نەزانییدا بیانهێڵێتەوە و فریویان بدات.

ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد: حیکمەتی زۆر دووبارە بوونەوەی، بەسەرهاتی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ)، لەگەڵ سێکوچکەی: فیرعەون + هامان + قاڕوون دا، ئەوەیە کە ئەو حاڵەتی قۆرخکران و خراپ بەکارهێنرانی: دەستەڵات و سامان و ڕاگەیاندن، لەلایەن حوکمڕانە خۆ بەزلگرو خۆ سەپێنەکانەوە، هەمیشە لەژیانی بەشەر و کۆمەڵگایەکانی دا، دووبارە دەبێتەوە.

بەڵێ، حوکمڕانە ستەمکار و خۆسەپێنەکان، هەمیشە ویستوویانە و دەیانەوێ، لە و سێ خاڵە بێهێزەوە: (نەزانین و ترس و تەماع)، زەفەر بەخەڵکی بەرن، بۆیەش هەموو هەوڵیان بۆ ئەوەیە، کە هەرکام لە دەستەڵات و سامان و ڕاگەیاندن، لەدەستی خۆیان و دەور وبەری بەهرەمەندیاندا، قۆرخ بکەن.

ئنجا ئەگەر حوکمڕانە ستەمکار و خۆ بەزلگرەکان و، یستوویانە لەڕێی هەرسێك خاڵی بێهێز (نقطة ضعف)ی: (نەزانیی، ترس، تەماع)ەوە، لەگەڵ خەڵك و جەماوەردا مامەڵە بکەن، تاکو زەفەریان پێ بەرن و لەخشتەیا ببەن، بەپێچەوانەوە: پێغەمبەرانی خوا (عليهم السلام)، هەردەم ویستوویانە: لەڕێی خاڵە بەهێزەکان (نقاط القوة)ی مرۆڤەکانەوە، مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، کە بریتین لە: (هۆشیارکردنەوەی عەقڵ و، بێدارکردنەوەی دڵ).

هەڵبەتە عەقڵیش بەزانیاریی (علم) هۆشیار و ڕۆشن دەبێ و،بنەڕەتیی ترین جۆری زانیارییش، ئەوەیە کە مرۆڤ خواو، خۆی و بوونەوەر و دەوروبەری پێ بناسێ، کە وەك زاراوە، پێی دەگوترێ :( بوونناسیی/ معرفة الوجود/ ontology).

دڵیش بەئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروست، بێدار دەبێ، کە کاکڵ و بناغەکەی بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (توحيد الله) .

ئنجا کاتێکیش مرۆڤ عەقڵی هۆشیار دەبێ و، دڵی بێدار دەبێ، سێکوچکەی شووم (الثالوث المشئوم)ی: نەزانیی، ترس، تەماع (الجهل، الخوف، الطمع) لەخۆی دادەدڕنێ و، لەئاکامدا: خۆڕاگر و ئازاد و ئازا دەبێ.

باشترین نموونەش کەلەئەنجامی: هۆشیاربوونەوەی عەقڵ، بەهۆی زانیاریی و، بێداربوونەوەی دڵ، بەهۆی ئیمانەوە، تەلیسمی سێکوچکەی شوومی: نەزانیی و ترس و تەماع، شکاوە، جادووگەرەکانی فیرعەونە، باسەرنجی ئەم ئایەتانە بدەین:

﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ
ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ

أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُوا۟ لَا ضَيْرَ ۖ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾
إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ﴾ الشعراء -٤٦-٥١-.

واتە: ئنجا كاتێك جادووگەرەكان هاتن، بەفیرعەونیان گوت: ئایا ئەگەر ئێمە زاڵبووین، كرێ و پاداشتمان دەبێ؟ (فیرعەون) گوتی: بەڵێ، وە ئەگەرەوابێ، ئێوە لە زۆر نیزیكان دەبن.

موسا پێی فەرموون: ئەوەی دەتانەوێ بیكەن، فڕێیبدەن، ئەوانیش پەت و گۆچانەكانیان فرێدان و گوتیان: بەعیززەتی فیرعەون هەر ئێمە زاڵ دەبین.

مووساش گۆچانەكەی فڕێدا، یەكسەر هەرچی لەدرۆ وجادوو كردبوویان هەڵیلووشی.

یەكسەر جادوو گەرەكانیش بەكڕنووشدا كەوتن، گوتیان: بڕوامان بەپەروەردگاری جیهانیيان هێنا، پەروەردگاری مووسا و هارووون.

(فیرعەون) گوتی: چۆن بەر لەوەی مۆڵەتتان بدەم، لەبەر وی بڕواتان هێنا؟ بێگومان ئەوە گەورە (مامۆستایە)كەتانە، كە جادووی فێركردوون، لەمەودوا دەزانن (چیتان لێدەكەم!) دەست و لاقانتان ڕاست چەپ دەبڕم، وە بەدڵنیایی هەمووانتان (بەدارخورمایانەوە) هەڵدەواسم.

(جادووگەرەكان) گوتیان: هیچ زیانێك ناكەین، چونكە ئێمە بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، ئێمە هیوامان وایە، لەسۆنگەی ئەوەوە كە یەكەمین بڕوادار بووین، پەروەردگارمان لەگوناهەكانمان بمانبووری.

وەك دەبینین:

لەسەرەتاوە جادووگەرەكان، كە جارێ هەر لەژێر كاریگەریی سێكوچكەی شوومی: نەزانیی و ترس و تەماع دابوون و، عەقڵ و دڵیان بەزانست و ئیمان، هۆشیار و بێدار نەبوو بۆوە، هێندە خۆیان لەلا نزم و بچووك بوو، كە وەك كرێگرتەیەك چاوەڕێی زارشیرینكردن و خەڵاتكردن و، چەپڵە و ئافەرینێكی فیرعەونیان دەكرد و، لەبەرانبەری دا زەبوون و سەرشۆڕ بوون و، ئازادیی و ئیرادەی خۆیانیان لەدەست دابوو!

بەڵام پاش بینینی موعجیزە و بەڵگە ڕۆشنەکەی مووسا و، دڵنیابوونیان لەوە، کە ئەوەی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ)، هیچ پەیوەندیی بەجادووەوە نیە و، موعجیزەیە و مووسا پێغەمبەری خوایە، وە سەرەنجام ڕۆشن بوونەوەی هۆشیان و، بێدار بوونەوەوی دڵیان بەهۆی زانیاریی و ئیمانەوە: هەڵگەڕانەوەی (إنقلاب)یەکی سەدوهەشتا پلەییان بەسەردا دێ و، کەپێشتر چاوەڕێی ئافەرین و خەڵاتکردنی فیرعەونیان دەکرد، ئێستا بەهۆی زانیاریی ڕاست و، ئیمانی پتەوەوە، هێندە ئازاو ئازاد بوون و، هەستیان بە حورمەت و کەسایەتیی خۆیان کردوە، کە نەك هەر هیچ چاوەڕوانییەکیان لە فیرعەون نیە، بگرە لەهەڕەشە و گوڕەشە و کوشتن و هەڵواسین و ئەشکەنجەدانیشی بێ باکن، وەك لەسوورەتی (طه)دا خوای زانا لێی گێڕاونەوە، کە لەبەرانبەر هەڕەشەی فیرعەون دا گوتوویانە:

﴿ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ﴾ طه -٧٢-.

واتە: هەرچی پێت دەکرێ بیکە، چونکە هەرچی دیکەی، لەسنووری ئەم ژیانە دنیاییە دایە.

کەواتە: باهەوڵبدەین: بەهۆی عەقڵ هۆشیاریی و دڵ بێدارییمانەوە، بەزانیاریی و ئیمان، تەلیسمی سێکوچکەی: نەزانین و ترس و تەماع، بشکێنین و، سیفەتە بەرزەکانی: خۆڕاگریی و ئازایەتیی و ئازادیی، لەبەرانبەر ستەمکاران دا، وەدەست بێنین.

## بنەمای بیست و دووەم :

## هەمیشە ستەمكار و خۆشگوزەرانانی گەندەڵكار، دژی گۆڕانكاریی و چاكسازیی بوون

بێگومـــان هەركەسێك بەشـێوەیەكی نـاڕەوا، واقیع و هـــەل و مەرجێكیی ستەمكارانەی بۆخۆی ساز كردبێ، كە تێیدا بەهرەمەند بێ، حەز لەچارەی هیچ كەس ناكات، كە باسی گۆڕانكاریی و چاكسازیی بكات و، باسی لابردنی ستەم و گەندەڵیی و چەسپاندنی دادگەریی و یەكسانیی بكات، چونكە دڵنیایە كە لەئەنجامی گۆڕانكاریی و پاكسازیی و چاكسازییدا، بەزم و بازەڕە ناڕەوایەكەی لێ تێك دەچێ، پێشینانیش گوتوویانە: (دز بازاڕی ئالۆزی دەوێ) هەروەها گوتوویانە: (ڕاوچی خراپ، لە ئاوی لێڵ دا ڕاو دەكات).

بۆیە ئەو ستەمكارە خۆسەپێن و، سامانداره گەندەڵ و خۆشگوزەرانانە، كۆنە پارێزیی و لاسایی كردنەوەی كوێرانەی پێشووان و، دژایەتیی كردنی گۆڕانكارییان، كردۆتە پیشە!

ئەو ڕاستییەش كە كردوومانەتە سەرباسی ئەم بنەما گەورە وگرنگە قورئانییە، لەچەندان ئایەتی قورئان دا، خراوەتە ڕوو، بۆ نموونە:

١- ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴾ الزخرف -٢٣-.

واتە: وە هەر بەوشێوەیە - كەباسكرا - لەپێش تۆدا هیچ وریاكەرەوەیەكمان لەهیچ ئاوەدانییەك دا نەناردوە، مەگەر - حوكمڕانە - خۆشگوزەرەكانی گوتوویانە: ئێمە

باب و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێك بینیوەو، بە دڵنیایی هەر بەدوای شوێنەوارەکانی وانیش دەکەوین.

٢- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ سبأ -٣٤-.

واتە: وە هیچ وریاکەرەوەیەکمان لە هیچ ئاوەدانییەکدا نەناردوە، مەگەر (دەستڕۆیشتووە) خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: بێگومان ئێمە بەوەی پێی نێرراون، بێبڕواین.

بەڵێ، ئەوە عادەت و نەریتێکی چەسپاوی سەرجەم حوکمڕانانی خۆسەپێن و خۆشگوزەران و، دەوروبەرە مشەخۆرو گەندەڵەکەیانە، کە هەمیشە بەبیستنی دەنگی زوڵاڵی گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی و، نەهێشتنی ستەم و گەندەڵیی و، چەسپاندنی دادگەریی، قەڵس و نارەحەت دەبن و، کێچیان دەکەوێتە کەوڵ، ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە، کە پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) وە شوێنکەوتووە ڕەسەنەکانیشیان، گەورەترین ئامانجیان - وەك لەبنەمای سێیەم دا باسمان کرد - چەسپاندنی خوا بەیەکگرتن و یەکتاپەرستیی (توحیدالله) و، دادگەریی (عدل- قسط) بووە، کەهەردووکیان لەقازانج و بەرژەوەندیی خەڵك و جەماوەری چەوساوەو مافخوراوان و، بەزیان و نەهامەتیی حوکمڕانانی ستەمکارو، خۆشگوزەران و دەوروبەرو دەستە و دایەرەی گەندەڵ و مشەخۆریان، تەواو دەبن، بۆیە هەمیشە پێغەمبەران و شوێنکەوتووە ڕەسەنەکانیان، لەگەڵ دژایەتیی سەرسەختانەی حوکمڕانانی خۆبەزلگر (مستکبرین) و، سامانداڕانی خۆشگوزەران (مترفین)دا، کە بەبیانوو پاساوی ڕێزگرتن لەباب و باپیران و ئایین و کلتووری پێشینان و، لاسایی کردنەوەیان، ویستوویانە واقیع و هەل و مەرجە ستەمکارانە و قۆرخکارانەکەیان، بپارێزن و، وەك خۆی بیهێڵنەوە، ڕووبەڕوو بوونەوە!

شایانی باسیشە، کە هەڵوێست هەبوون لەبەرانبەر ستەمکارو خۆشگوزەرانانی خۆسەپێن و گەندڵ و مشەخۆردا - لەڕوانگەی قورئانەوە - نەك هەرپێویست

(واجب)ە، بگرە مەرجی سەرفرازیی و دەرباز بوونە، لەدنیا و دوارِۆژدا، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ﴾ هود -١١٦-.

واتە: دەبووایە لەسەدەکانی پێش ئێوەدا، کەسانێکی خاوەن عەقڵ و بەهابەرزەکان هەبوونایە، کە ڕێگریی بکەن لەخراپەکاریی لەزەمین دا - هیچ کەس نەبوو - جگە لەکەمێك لەوانەی دەربازمان کردن، بەڵام ئەوانەی ستەمیان دەکرد، هەر لەدوای ئەو ژیان و گوزەرانە (نارِەوایە) چوون، کەتێیدا خۆشگوزەران بوون، وە تاوانباریش بوون.

هەڵبەتە ئێمەش لەهەرێمی کوردستان و عێراق و، هەر وڵاتێکی دیکەی مسوڵماننشین دا، بەحوکمی مسوڵمان بوونمان و، خۆ بەشوێنکەوتووی پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) زانینمان دا، لەسەرمان پێویستە کەهەمیشە لەڕیزی خەڵك و جەماوەری چەوساوەو ماف پێشێلکراوو، لەسەنگەری دژی ستەم و خراپە و قۆرخکاریی دابین، ئەگەر بمانەوێ، شایستەی ناوی مسوڵمانەتیی بین و، لێمان بوەشێتەوە بڵێین: ئێمە شوێنکەوتووی بەرنامە و ڕێبازی پێغەمبەرانی خواین.

## بنەمای بیست و سێیەم :

## نیشتە جێ بوون لەشوێنی ستەمکاران داو، دووبارە کردنەوەی کردەوەو ڕەفتارەکانیان، نیشانەیەکی زەقی حوکمڕانانی خۆسەپێن و قۆرخکارە

یەکی دیکە لەو ڕاستییە مەزنانەی، دوایین کتێبی خوای بەرزی مەزن، لەبارەی حوکمڕانانی ستەمکار و قۆرخکار و، چینی ساماندار و مشەخۆر و گەندەڵی دەوروبەریانەوە، خستوویەتەڕوو، ئەوەیە کەئەوانە هەمیشە ئاکار و ڕەفتار و شێوەی ژیان و گوزەرانی ستەمکارو خۆشگوزەرانە پێشووە سەربەفەتارەت چووەکانیان، دووپات دەکەنەوە و، بەشوێن پێی وان دا دەڕۆن، وەك خوای تاك و پاك لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُواْ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴾ إبراهيم-٤٥،٤٦-.

واتە: وە ئێوە (ئەی ستەمکارە خۆبەزلگرەکان!) لەخانووبەرەکانی ئەوانەدا نیشتە جێبوون، کە ستەمیان لەخۆیان کرد، وە بۆتان دەرکەوتوە چیمان پێکردن، وەوێنەمان بۆتان هێنانەوە (لەوگەلە پێشووانە).

وە ئەوان هەرچی پیلانێك پێیان کرا، بەکاریان هێنا، بەڵام پیلان و نەخشەکانیان لەژێر ڕکێفی خوادان، هەرچەندە پیلانەکەیان واش بێ، کە چیا لابەرێ.

شایانی باسیشە، کە لە کۆمەڵگا هۆشیار و زیندووەکان دا - مەگەر چۆن ئەگەرنا - ڕێ بەحوکمڕان و بڕیاربەدەستان نادرێ، کەهەڵە و پەڵە و لادان و تاوان و شێوەی حوکمڕانیی ستەمکارانە و، ژیان و گوزەرانی خۆشگوزەرانانەی حوکمڕانە خۆ سەپێن و خۆشگوزەرانەکان، دووبارە بکەنەوە و، لەکۆشك و تەلارەکانیاندا دابنیشن! بەڵکو لەجیاتی چاولێکردن و کردنە سەرمەشقیان، دەیانکەنە جێگای پەندو عیبرەت لێوەر گرتن و، کۆشك و تەلارەکانیشیان دەکەنە مۆزەخانە!

بەڵام بەداخەوە لەعێراق و هەرێمی کوردستانیش دا، کۆشك و تەلارو جێگاو ڕێگایەکانی صەددام و، بەرپرسانی دیکەی ڕژێمی بەعسی دیکتاتۆری پێشوو، لەلایەن زۆرێك لەبەر پرس و حوکمڕانانی دوای ڕژێمەوە، بەمیرات گیراون و، تێیان دا نیشتە جێ بوون، بگرە زیادەشیان خراوەتە سەر و، بەماڵ و سامانی قۆرخکراو و بەگەندەڵیی وەسەرێك نراو، زیاتریش ڕازێنراونەوە و، زێدە ڕۆیی و زرق و بریقیان تێدا کراوە!

هەر بۆیەش بەندە هەرلە سەرەتاوە، کە ئەو دیاردە ترسناکەم لەژیان و گوزەرانی زۆربەی بەرپرس و بڕیار بەدەستانی عێراق و هەرێم دا بینی، ئەو ئایەتە بەپێزە قورئانییەم هاتەوە یاد و، هەر لەوکاتەوەش سەبارەت بەئایندەی عێراقی تازەی دوای (٢٠٠٣)و هەرێمی کوردستان و، ئەو چینە سیاسییە (الطبقة السياسية) حوکمڕانەی جڵەوی حوکمڕانییان کەوتە دەست! نیگەران بووم !

چونکە بێگومان یاساکانی خوا (سنن الله) لەژیانی بەشەردا، لایەنگیریی (إنحیاز) یان بەلای هیچ گەل و کۆمەڵێك دا تێدا نیەو، بۆ هەموو لایەك گشتگیرن و، هیچ کەس مافی ڤیتۆ(vito)ی لەبەرانبەریان دا نیە!

ئنجا دەربارەی واقیعی ئێستای خەڵکی عێراق و هەرێم، سێ هەڵوەستەی کورت لەبەردەم، ئەو دوو ئایەتە (٤٥-٤٦)ی (إبراهیم) دا دەکەین:

١- کە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾ چەمکەکەی: وێڕای نیشتەجێ بوون لەکۆشك و خانووەکانی ستەمکاران دا،

بەگشتی ڕەچاو کردن و دووبارەکردنەوەی، کردارو ڕەفتار و شێوەی ژیان و گوزەرانیشیان دەگرێتەوە.

٢- وەکە فەرموویەتی: ﴿وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ﴾ وە بۆتان دەرکەوتوە: چیمان پێکردن، یانی: ئەگەر ئێوەش وەك وان بکەن، هەمان جۆرە سزاتان دەدەین و، هەمان چارە نووس چاوەڕێتانە!

٣- وەکە فەرموویەتی: ﴿وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِندَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ﴾ یانی: وەك چۆن نەخشە و پیلانەکانی وان لەبەرانبەر ویست و دەستەڵاتی خوادا، دادی نەدان و، لەفریایان نەهات و، سەرەنجام لەبەین چوون، ئێوەش بەهێز و سوپاو ئاسایش و دەزگا هەواڵگرییەکانتان مەنازن و، فریو مەخۆن و بوغرا مەبن: ئەگەر هەر وەك ئەوان ڕەفتار بکەن، بێگومان هەر وەك وانیشتان بەسەر دێ، چونکە یاسای خوا(سنة الله) نەدەگۆڕێ، نەلادەدرێ.

وەك زاناوشارەزا فەرموویەتی:

﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا﴾ فاطر -٤٣-.

واتە: ئایا جگە لە یاسای پێشوان ( یاسای چەسپێوی خوا بەسەر پێشووان دا) چاوەڕێی چی دەکەن؟ هەرگیز گۆڕان لە یاسای خوادا نابینی، وە هەرگیز لادان لەیاسای خوادا نابینی.

## بنەمای بیست وچوارەم :

## هاندان و ورووژاندنی خەڵك و جەماوەر و چەواشەكردنیان، لەبەرانبەر هەوڵدان بۆ پاكسازیی و چاكسازیی دا، نەریتێكی كۆنی قۆرخكەرانی دەسەڵات و سامانە

ئەمیش یەكی دیكەیە لەو ڕاستییانەی، خوای بێ وێنە وهاوەڵ، لەچەند شوێنێكی قورئانی بەرز وبەپێزدا، خستوویەتە ڕوو، بۆنموونە:

١- ﴿ قَالُوٓاْ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُواْ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُواْ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴾ طه -٦٣،٦٤ -.

واتە: (دارو دەستەی فیرعەون) گوتیان: (خەڵكینە!) بێگومان ئەم دووانە جادووگەرن، دەیانەوێ بەجادووەكەیان لەسەر زەمینی خۆتان وەدەرتان بنێن و، ڕێبازە ناوەزەكەشتان نەهێڵن . بۆیە هەوڵ و پیلانی خۆتان كۆبكەنەوە، پاشان بەڕیز وەرن، بەدڵنیایشەوە: هەركەس ئەمڕۆ سەربكەوێ، سەرفرازە.

٢- ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴾ غافر-٢٦-.

واتە: وە فیرعەون گوتی: لێم گەڕێن، باموسا بكوژم و، با ئەویش لەپەروەردگاری بپاڕێتەوە، چونكە دەترسم بەرنامەكەتان بگۆڕێ، یان خراپەكاریی لەزەمین دا ئاشكرا بكات.

٣- ﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ المؤمنون -٢٤-.

واتە: دەستڕۆیشتووەکانی گەلەکەی (نووح) گوتیان: ئەمە جگە لەبەشەرێکی خۆتان ئاسا، هیچی دیکە نیە، دەیەوێ خۆیتان بەسەردا فەرز بکات.

وەك دەبیبین لەئایەتەکانی: (٦٣و٦٤)ی (طه) دا، دەستڕۆیشتووان و دارو دەستەی فیرعەون، خەڵك و جەماوەری میصر لە دژی مووسا و هارِوونی برای (سەلامی خوایان لێ بێ)، هان دەدەن و، دەیانوروژێنن، کە ئەوانە دوو جادووگەری زەبر دەستن و، دەیانەوێ لەسەر زەمینیی خۆیان وەدەریان بنێن و، ئەو ڕێبازو ئایینە ناوازەیەی فیرعەون بۆی داناون - کە خۆی بەپەروەردگار و پەرستراویان و، ئەوانیشی بەکۆیلەو ژێر دەست دادەنا - لێیان تێك بدەن!

هەروەها لەئایەتی (٢٦)ی (غافر) یش دا، بەهەمان شێوە: فیرعەون هەڕەشەی کوشتن لەمووسا دەکات و، بێباکییش بەرانبەر بەپەروەردگاری مووسا پێشان دەدات، پاشان بەوە پاساوی ویستنی کوشتنی مووسا دەداتەوە، کەمەترسیی ئەوەی لێدەکات: ئایین و بەرنامەکەیان لێ بگۆڕێ، یان ئاشووب و ئاژاوە لەوڵات دا بەرپابکات!

**بەڕاستی سەیرە!**

دوو پێغەمبەری پایەبەرزی خوا (مووسا و هارِوون) سەلامی خوایان لێ بێ، بەبەڵگە و موعجیزەی خواییەوە، ڕووبەڕووی فیرعەون و دارو دەستەکەی بوونەوە، تاکو ئەوخەڵك و جەماوەرە چەوساوە و ستەمدیدە بەکۆیلەکراوەیان، لەژێر چنگ دەربێنن، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ ﴾ طه -٤٧-.

واتە: بچنە لای (فیرعەون) بڵێن: ئێمە دوو نێردراوی پەروەردگارتین، دەجا بەنی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرە و، ئەشكەنجەیان مەدە، لەپەروەردگارتەوە (بەڵگەو) نیشانەیەكمان بۆ هێناوی، وە سڵاو لەو كەسەی شوێن ڕێنمایی (خوا) دەكەوێ.
كەچی فیرعەون و دەست و پێوەندە مشەخۆرەكەی، ویستوویانە: هەر ئەو خەڵك و جەماوەرە چەوساوە و بەكۆیلەكراوەیان، بەگژدا بكەن، كەئەوان بۆ دەربازكردن و ئازادكردنیان چوون و، لەسەر وانیش، لەگەڵ فیرعەون و دەستە و دایەرەكەیدا تێك گیراون!!

دیسان لەئایەتی:(٢٤)ی (المؤمنون)یشدا، زلەزلان و دەستڕۆیشتووانی گەلی نووح (سەلامی خوای لێ بێ)، خەڵك و جەماوەری لەدژ هان دەدەن و دەڵێن: ئەویش هەر مرۆڤێكی وەك ئێوەیە و، دەیەوێ خۆیتان بەسەردا هەڵكێشێ و، خۆیتان بەسەردا بەرز بكاتەوە!

هەڵبەتە ئەو جۆرە سیاسەتەش، لە حوكمڕانە ستەمكارو خۆسەپێنەكانی ئەم ڕۆژگارەی ئێستامان، لەبەرانبەر كەسانێك دا، كە هەوڵی گۆڕانكاریی و پاكسازیی و چاكسازیی تێداكردنی كۆمەڵگایەكانیان دەدەن، وەك ڕۆژی ڕوون دیارە و، ئەوەی گۆڕاوە، تەنیا شێواز و میكانیزم و جۆری ئەو تۆمەت و بوختانانەیە، كە لەلایەن حوكمڕانە قۆرخكارەكانی دەستەڵات و سامان (محتكري السلطة والثروة)ەوە، ئاراستەی هەوڵدەران بۆ پاكسازیی و چاكسازیی، دەكرێن.

دیارە هەر ئەوەشە هۆكاری هەوڵدانی بێوچانی حوكمڕانانی خۆسەپێنی ستەمكار، بۆ: لە نەزانیی و بێ ئاگایی دا هێشتنەوەی خەڵك و جەماوەرو چەواشەكردنیان، وە بەپێچەوانەشەوە: هەوڵ و هیممەت خستنە كاری پێغەمبەران (سەلامی خوایـــان لێ بێ) بۆ: هۆشـــیاریی و بێداریی خەڵك و جەماوەر و بەرچاو ڕوونكرنەوەیان و، پەیوەستكردنیان بەخواوە، چونكە: بێگومان خەڵك و كۆمەڵگای هۆشیارو بێدار و بەرچاو ڕوون و، پەیوەست بەخواوە، حوكمڕانە قۆرخكارەكانی دەستەڵات و سامان، زەفەریان پێ نابەن و، پێیان لەخشتە ناچن، خوای زاناوشارەزا لەبارەی هۆكاری زەفەر پێبردنی فیرعەونەوە، بەخەڵكی میصر، فەرموویەتی:

﴿فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ٥٤﴾ الزخرف -٥٤-.

واتە: (فیرعەون)، گەلەکەی بە(عەقڵ) سووك بینی (بۆیە چەواشەی کردن) ئەوانیش فەرمانبەرییان کرد، بێگومان ئەوان کۆمەڵێکی لادەر بوون.

بەڵێ، ستەمکارو خۆسەپێنەکان، تەنیا زەفەر بەخەڵکی بۆش و سووکەڵە دەبەن، هەر بۆیەش هەتا سەرئێسك دوژمنی پەیام وبەرنامەی پێغەمبەرانی خوا (سەلامی خوایان لێ بێ)، بوون، چونکە زانیویانە: ئەو پەیام و بەرنامەیە، هەناوو هەوێنی ژیانە و، ڕووحی ئینسانە و، مایەی ئەوەیە، کە نێوەڕۆك و کێشی پێ پەیدا بکات و، قەدر و حورمەتی خۆی پێ بزانێ و، سەرەنجام: نەك هەر خۆی هەرزان فرۆش نەکات، بگرە ڕازی نەبێ هیچ نرخێکی لەسەر دابنرێ و، هەر سەوداش بکرێ!

## بنەمای بیست و پێنج :

## داهاتوو بۆ پارێزکارانی پاکسازیی و چاکسازییکارەو، سەرەنجامی دنیاو دوارۆژی ستەمکاران شوومە

ئەمانیش دوو یاسا (سُنَّة)ی دیکەی خوای پەروەردگارن لەژیانی بەشەردا، کە خوای زاناو توانا، وەك دوو ڕاستیی، لەچەندان ئایەتی قورئانی بەرزی بەپێزدا، هەندێك جار بەشێوەی تێکهەڵکێش و، هەندێك جاریش بەجیاجیا، ڕایگەیاندوون، بۆ نموونە:

١- ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدٗا رَّابِيٗاۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴾ الرعد -١٧-.

واتە: (خوا) لەئاسمانەوە ئاوێکی دابەزاندوە، چەند شیوو دۆڵێك بەئەندازەی خۆیان گرتیانە خۆیان (ولێزماویان دروستکرد) ئنجا ئەو لێزماوە، کەفێکی هەڵگرت و بەرزی کردەوە، هەروەها لەو (کانزایان)ەش، کە بەمەبەستی دروستکردنی خشڵ، یان کەل وپەل، ئاگری دەخەنە ژێر (وقاڵی دەکەنەوە) کەف و خڵتەی شێوەی وی هەیە، بەو شێوەیە خوا وێنە بۆ هەق و بەتاڵ دێنێتەوە، ئنجا (سەرەنجام) کەف و خڵتەکە دەڕواو نامێنێ، بەڵام ئەوەی سوود بەخەڵك دەگەیەنێ (کە ئاوەکەیە) لەزەویدا دەمێنێتەوە، بەو شێوەیە خوا وێنان دێنێتەوە.

كەواتە: هەر قسەو بیر و ڕاو ئاكاروكردارێك بۆ خەڵك بەسوود بێ، بۆ وێنە: دادگەریی، وەك چۆن ئاو لەزەمیندا جێگیر دەبێ، ئەویش ئاوا لەژیانی خەڵك دا دەچەسپێ و دەمێنێتەوە، بەڵام قسە و بیروڕا و ڕەفتاری بێ كەڵك و زیانبەخش، وەك ستەم و خراپە، بەوێنەی پووش و پەڵاش و كەف و كوڵی لافاوو، خڵتەو خاڵ و ژەنگی لەكانزانیشتوو، دەڕواو ئاوە ئاو دەچێ!

٢- ﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦۖ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ الأعراف -١٢٨-.

واتە: وە مووسا بەگەلەكەی خۆی فەرموو: یارمەتی لەخوا وەربگرن و خۆڕابگرن، بێگومان زەمین هی خوایە، دەیكاتە میراتی هەركام لەبەندەكانی، كە بیەوێ، وەسەرەنجام (ی باش) هەر هی پارێزكارانە.

٣- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ ﴾ إبراهيم-١٣،١٤-.

واتە: وە ئەوانە بێبڕوان، بەپێغەمبەرانی خۆیانیان گوت: بەدڵنیایی لەسەر زەمینی خۆمان وەدەرتان دەنێین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینەكەمان، پەروەردگاریشیان سروشی بۆكردن، كە: بێگومان ستەمكاران دەفەوتێنین. وە بەدڵنیایی دوای وان ئێوە لەزەمین دا نیشتە جێ دەكەین، ئەو (موژدەیە)ش بۆكەسێكە، كە لە پایەی من بترسێ و، لەهەڕەشەی من بترسێ (نەك لە پایە و هەڕەشەی ستەمكاران).

٤- ﴿ .. فَٱصْبِرْۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ هود -٤٩-.

واتە: دەجا خۆڕاگربە، بەدڵنیایی سەرەنجام (ی باش) هی پارێزكارانە.

ئەوەی لەكۆی ئەم ئایەتانەش وەردەگیرێ، ئەوەیە كە بەپێی یاساكانی خوا (سنن الله) لەژیانی بەشەردا، سەرەنجام لەئاكامی ململانێ و كێشمەكێشی نێوان: هەق و ناهەق و، ئیمان و كوفر و، دادگەریی و ستەم و، چاكە و خراپەدا:

هەق و ئیمان و دادگەریی و چاکە دەچەسپن، چونکە مایەی سوود و بەرژەوەندیی خەڵکن لەدنیا و دوا ڕۆژدا و، بەتاڵ و کوفرو ستەم و خراپەش، چونکە بێ کەڵك و بگرە زیانبەخشن، وەك کەفی سەر ئاوو خڵتەی کانزا، دەڕۆن و فڕێ دەدرێن.

**بەڵام لێرەدا ڕاستییەکی گرنگ هەیە، نابێ لێی بێ ئاگابین:**

که دەڵێین: هەق و ئیمان و دادگەریی و چاکە، سەرەنجام دەچەسپێن و جێگیردەبن و، دژوپێچەوانەکانیان: بەتاڵ و کوفر و ستەم و خراپە، لەبەین دەچن، ئەوە بەو مانایە نیە، کە هەر لەخۆوە و، بەبێ هەوڵ و هیمەتی خەڵکی هەقخواز، ئەوە ڕوودەدات!

**چــونکـە:**

هەرکام لەکەف و کۆڵ و پووش و پەڵاشی سەر ڕووی لافاوەکەو، خڵتەو ژەنگی سەرکانزایەکانیش، هەر لەخۆوە، بەبێ جووڵەی ئاوە پاکەکەو، کانزایە چاکەکە، جیا نەبوونەوە ! بەڵکو پاش هاتنە خوارەوەی ئاوەکە و، هەڵسانی لافاوو، ئاگر درانە بەر کانزایەکان و، قاڵکرانەوەیان، ئەو کەف و کوڵ و ژەنگ و خڵتەیەی، کە سوودیان نەبوو، لێیان جیا بوونەوە و دەرکەوتن و، سەرەنجام بەدەم باوە چوون و تێچوون!

**کەواتـــە:**

لەواقیعی ژیانی بەشەریشدا، هەروایەو، پێویستە ئەهلی هەق بەهەقەکەیان بجووڵێن و، بێنە مەیدان و، خەڵك و جەماوەر: هەق و ناهەق و، دادگەریی و ستەم و، چاکەو خراپە، لەبەرانبەر یەکدی دا ببینن و، پێکەوە بەراوردیان بکەن، ئنجا ئومێدی ئەوە دەکرێ، کە چەسپاندنی هەق و دادگەریی و چاکە و، پووچەڵ بوون و نەمانی بەتاڵ و ستەم و خراپە، ڕووبدات، وەك خوای زانا و شارەزا فەرموویەتی:

﴿ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ ۚ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾ الإسراء -٨١-.

واتە: وە بڵێ: هەق هات و بەتاڵ لەنێو چوو، بێگومان بەتاڵ لەنێوچوویە.

بەڵێ، بەتاڵ و ستەم و خراپە، بۆش و قرپۆکە و، ڕاگرەکانی (مقوِّمات)ی مانەوەیان نین، بەڵام هەتا هەق و دادگەریی و چاکە، نەیەنە بەرانبەریان و، لەگەڵیان ڕووبەڕوو نەبنەوە، ڕووی دزێوو ناشیرین و، نێوە ڕۆکی پووچەڵ و گەندەڵیان، بۆ خەڵك ئاشکرا نابێ!!

**کۆتـــایی:**

لێرەش دا کۆتایی بەخستنە ڕووی ئەو بیست و پێنج بنەما قورئانییە دێنین، کە پێم وایە سەرنج دان و تێوە ڕامانیان و، پاشان لێتێگەیشتن و کارپێکردنیان، مایەی دەرباز بوونمانن، لەم واقیع و بارودۆخە نەخۆش و ناخۆشەی تێیکەوتووین، چ وەك خەڵکی هەرێمی کوردستان و، چ وەك خەڵکی عێراق و، چ وەك مسوڵمانان بەگشتی لە تێکڕایی جیهانی ئیسلام دا.

دوا پێداچونەوەی:

٥ / شەعبانی / ١٤٣٧ کۆچی

١٢ / مایبسی / ٢٠١٦ زایینی

تورکیا / مەلاطیـا

www.alibapir.com

ئینستیتیوتی

ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆ تویژینەوە

# ئالوگۆڕکردنی ڕوانگەکان

# بۆ ئایندەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست

٢٠١٥/١١/٥






بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لەسەرەتادا زۆر سوپاسی ئینیستیتیوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وە برای بەڕێزو خۆشەویستمان کاك د. دلاوەر عەلائەددین دەکەم، بۆ ساز کردنی ئەم کۆبوونەوەیە، کە ساڵانە دەیکا، بە حەقیقەت جێی ڕێزو پێزانین و دەستخۆشییە، ئەوانەی مشور دەخۆن لە چارەسەری کێشەکان، بەبێ لایەنانەو بابەتییانە، کەمن، کە پێم وایە کاك دکتۆر یەکێکە لەوانە.

بەڕێـــزان!

ئێمە لە هەل و مەرجێکداین، تا بڵێی هەستیارو دژوارە، چ بە لەبەر چاو گرتنی بارودۆخی نێو خۆمان، چ بەلەبەر چاو گرتنی بارودۆخی دەرەوەی خۆمان، چ لەسەر ئاستی ناوچەکە، چ لەسەر ئاستی دنیاش، بۆیە جێی خۆیەتی هەموو لایەك زۆر حیساب بۆ قسەمان بکەین، وە بەرپرسیارانە لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا مامەڵە بکەین، وە منیش وام بڕیار داوە، ماوەیەکە لە ڕاگەیاندندا قسەم نەبووە، لەبەر ئەوەی بارودۆخەکەم بە گونجاو نەزانیوە، گوتوومە بەهەر بارێکدا قسە بکرێ، ڕەنگە باش نیشانە نەپێکێ، بەڵام، کە برای بەڕێزمان دکتۆر دلاوەر بانگهێشتی کردین بۆ ئەم پانێڵە، بۆ قسە کردن لەبارەی قەیرانە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستانەوە، چۆن چارەسەریان بکەین؟ پێم خۆش بوو، بەتایبەتیش، کە هەر پێنج لایەنە سەرەکییەکە، نوێنەریان لێرەدا هەن، کەوەك کاك دکتۆر گوتی: ئومێدم وایە بگەینە نەخشە ڕێگایەك و بەرچاو ڕوونییەکی باش، بۆ ئەوەی بۆ داهاتوومان هەنگاو بنێین.

**من لە سێ تەوەردا قسە دەکەم:**

**تەوەرەی یەکەم: ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو:**

نەك بەو واتایەی کای کۆن بەبا بکەین و برینان بکولێنینەوە، بەڵکو دەبێ تەماشایەکی ڕابردوومان بکەین، بۆ ئەوەی هاندەرمان بێ بۆ چاککردنی واقیعی ئێستامان، وە بەرچاوڕوونیی بۆ داهاتوومان، ئێمە، ئەم قەوارە سیاسییەی هەرێمی کوردستانەمان، کە بۆ چارەکە سەدەیەك دەچێ لەسەر پێی خۆی وەستاوە، بە ئاسانیی بۆمان بەرهەم نەهاتوە، ئەوە هیچ کە بەرهەمی خەباتێکی دووردرێژی باشووری کوردستانە، کە پێم وایە ئەو خوێن و خەباتەی خەڵکی باشووری کوردستان خەرجی کردوە، زۆر بە زیادەوە بەشی دەوڵەتێکیشی دەکرد، نەك بەشی هەرێمێك، کەواتە: ئەم هەرێمە خەرجییەکی زۆری تێچووە، تاکو گەیشتۆتە ئێستا.

پاشان ئێمە ئەگەر بمانەوێ و ئیرادەمان هەبێ میللەتێکی دەستەپاچەو بێ ئیرادە نین، وە عەقڵیشمان باش ئیش دەکاو دەتوانین خۆمان لە قەیران و کێشەکان دەرباز بکەین، ئێمە لە ڕابردوودا کۆمەڵێك دەستکەوتی وامان دێنە بەرچاو، کە جێی شانازییمانن:

١- ئەم قەوارە سیاسییەمان لە مێژووی هاوچەرخی کورددا، بێ وێنەیە، کە قەوارەیەکی کوردستانی بۆ ماوەی چارەگە سەدەیەك لەسەر پێی خۆی بوەستێ، ئەوە دەستکەوتێکی گەورەیە.

٢- پاشان ئێمە کاتی خۆی کێشەو ناکۆکیی و دووبەرەکییمان هەبوون، بەڵام توانیمان بەسەریاندا زاڵ بین، هەڵبەتە بە هاوکاریی دۆستانی دڵسۆزیش، توانیمان ئەو برینانە قەتماغە بکەین، وە چاوپۆشیی لە ڕابردوو بکەین وە لاپەڕەی سپی لەگەڵ یەکدا هەڵدەینەوە.

٣- ئنجا ئێمە توانیمان چەند دامەزراوەیەك دروست بکەین، بەڵێ، کرچ و کاڵیی و ساواییان پێوە دیارە، بەڵام توانیمان کە پەرلەمانێکمان هەبێ، حکوومەتێکمان هەبێ، پەڕلەمان بە چەند خولەوە، حکومەت بەچەند کابینەوە، پاشان دەسەڵاتی دادوەریی و سەرۆکایەتیی هەرێم.

٤- وە ئێمە متمانەیەکی باشی نێودەوڵەتیی و هەرێمییمان بۆخۆمان بەدەست هێناوە، کە شتێکی کەم نیە.

٥- پاشان ئێمە توانیومانە سەقامگیریی سیاسیی بەرقەرار بکەین، وە گەشەیەکی ئابووریی باش لە کوردستاندا ڕوویداوە، بەبەراورد لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی عێراقدا.

٦- وە توانیمان بەرگریی لە کوردستان بکەین، هەڵبەتە بە هاوکاریی ئەوانەش، کە پشتگیرییان لێکردین، لەبەرامبەر شەڕی داسەپاوی تیرۆریستانی داعشدا.

کەواتە: ئێمە کاتێ ئاوڕ لە ڕابردوومان دەدەینەوە، هێندە خاڵی گەش دەبینین، کە ئومێدەوارمان بکەن و قەناعەتمان پێ بێنن، کە ئێستاش دەتوانین بەسەر کێشەکانمان زاڵ بین.

## تەوەری دووەم: قەیرانی ئێستامان:

هەڵبەتە، دەبێ بە ڕوونی قسە بکەین، پەنجە لەسەر کەم و کوڕییەکان دابنێین، قەیرانی ئێستامان دەرهاویشتەی کەم و کوڕییەکانی ڕابردوومانە، کە ئەگەر بە وردیی دەست نیشانیان بکەین، دەبێ بڵێین: کەم و کوڕییەکانی ڕابردوومان هەرچەندە زۆرن، بەڵام دەتوانین بڵێین: لە دوو شتدا کورت دەبنەوە:

### یەکەم: کرچ و کاڵیی دامەزراوەکانمان:

١- ئێمە پەرلەمانمان هەبووە، بەڵام نەمانهێشتوە پەڕلەمانێکی ڕاستەقینەو شوێنی دەرکردنی بڕیارو یاسا بێ، وە چاودێرێکی بێمنەت بێ بەسەر حکوومەت و کارەکانییەوە.

٢- لایەنە سیاسییە بڕیار بەدەستەکان نەیانهێشتوە حکوومەتەکەمان، حکوومەتێکی دەستکراوە بێ و، حکوومەتی هەموو لایەك بێت و، دادگەریی بچەسپێنێت و قۆرخکاریی تێدا نەبێ.

٣- پاشان دەسەڵاتی دادوەریی، خۆتان دەبینن لە چ وەزعێکدایە! زۆر شت دەکرێ و دەگوزەرێ، دەسەڵاتی دادوەریی لە بەرانبەریدا هیچ کارە نیە، لەبەر ئەوەی خۆمان نەمانهێشتوە، لەگەڵ ڕێزمدا بۆ دادوەرە بەڕێزەکان.

دووەم: ناتەبایی سیاسیی:

بەڵێ، سەقامگیریی سیاسییمان هەبووە، بەڵام زۆر ڕیشەدارو قووڵ نەبووە، هەر موداراماں لەگەڵ یەکدا کردوە، بۆ نموونە: نەمانتوانیوە بڕیارێکی کۆنکرێتی بدەین کە دەبێ پاراستنی هێمنیی کۆمەڵایەتیی و ئاشتیی کۆمەڵایەتیی خەتی سوور بێ و هیچ کەس تەجاوزی نەکات، کێشەو ململانێی سیاسیی، قاڵبێکی سەربازیی لەخۆی نەگرێ.

**تەوەری سێیەم: چارەسەر:**

هەڵبەتە من لێرەدا باس لە قەیرانە نێوخۆییەکان دەکەم، قەیرانە دەرەکییەکان زۆرن، شەڕی داعش، کێشەی نەوت لەگەڵ بەغدا، کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکان و... هتد، بەڵام من پێم وایە، ئەگەر بۆخۆمان ببین و لەنێو خۆدا ڕێك بین، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴾المائدة - ١٠٥-.

واتە: بڕوادارینە! ئاگاتان لەخۆتان بێ و وریای خۆتان بن! ئەگەر خۆتان ڕێگای ڕاست بگرن، ئەوەی کە گومڕایەو ناحەزتانە، زیانتان پێ ناگەیەنێ.

زۆر جاران گوتوومە: ئێمە هەمیشە لە درزو کەلێنەکانی خۆمانەوە، دوژمنان و ناحەزانمان زەفەریان پێ بردووین، وە بەپێی مەنتیقی قورئانیش، دەبێ هەمیشە گلەیی لەخۆمان بکەین بەر لەوەی ڕووی ڕەخنە لە خەڵکی

دیکە بکەین[١]، چونکە بەتەئکید ئەوەی، کە ناحەزتە، غەیری خراپە هیچی دیکەی لێ چاوەڕوان ناکرێ، بەڵام بۆخۆت، دەبێ دڵسۆزی خۆت بی، ئنجا ئەگەر لەنێو خۆماندا تەباو ڕێك بین، بەتەئکید حەصانەو مەناعەی ئەوەمان دەبێ، کە دوژمنانمان زەفەرمان پێ نەبەن.

ئنجا من پێم وایە چارەسەری ئەو قەیرانەی، کە ئێستا هاتۆتە دی لەنێوخۆدا، کە شڵەژانێکی باشی بۆ هەموو لایەك هێناوەتە دی، کە بە حەقیقەت دەبێ بەزەییمان بەخەڵکی خۆماندا بێتەوە: ئێمە هەژارەکانمان هەژار تربوون، دەوڵەمەندەکانیشمان بەشێکی زۆریان هەژار کەوتوون، پرۆژەکانمان ڕاوەستاون[٢]، خەڵك بێ کارو کەسابەتە، گەنجەکان سەری خۆیان هەڵدەگرن و بەرەو هەندەران دەڕۆن، ئەگەر باسی ئێش و ژان و موعاناتەکان بکەین زۆر زۆرن، ئەوانە دەبێ هاندەرمان بن، کە بە جیددیی بیر لە چارەسەریان بکەینەوە، وە نابێ لێیان گەڕێین، چونکە گرفت و کێشە، وەك تۆپەڵە بەفر وایە، کە خلۆری دەکەیەوە، ئەگەر لێی گەڕێی، تاکو بڕوا گەورەتر دەبێ، کێشەش دەبێ زوو بەدەمیەوە بچی، ئنجا من پێم وایە بە سێ قۆناغ، دەتوانین ئەم کێشەو قەیرانەی ئێستامان چارەسەر بکەین:

**قۆناغی یەکەم:** ئاسایی کردنەوەی بارو دۆخەکە: وەك کاك دکتۆریش باسی کرد، بەر لە هەموو شتێك ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکە، کە ئەویش لە کۆنترۆڵ کردنی ڕاگەیاندنەوە، دەست پێدەکات، زۆرم پێ ناخۆشە لە ڕاگەیاندنەکاندا، چ ڕاگەیاندنی حیزبیی، چ ڕاگەیاندنی لا بەلای حیزبیی، کە کۆمەڵێك کەناڵی ڕاگەیاندن هەن، بە پارەی حەرام و سامانی خەڵك کاردەکەن بەڕێوە دەبرێن، ئیشیان بریتییە لە تەشهیر پێکردن و ناو زڕاندنی خەڵك و سووکایەتیی کردن بە ڕەمزەکانی ئەم وڵاتەو، بە بەرپرسانی ئەم وڵاتە، ئنجا ڕەنگە ئەو لایەنەی

---

(١) وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾﴾ الشورى. واتە: وە هەر بەڵایەکتان بەسەر دێ بەهۆی کردەی دەستی خۆتانەوەیەو، لە زۆریش دەتانبووری و سزاتان نادات.

(٢) بەرپرسێکی شارەزا قسەی لەشەش هەزار (٦٠٠٠) پرۆژەی پەکخراو (معطل) دەکرد!

پشتگیریی ڕاگەیاندنێك دەكا، كە قسە بەبەرامبەرەكەی دەڵێ، نەزانێ بۆ خۆشی پێی سووك دەبێ!! خەڵك دەڵێ: ئەو بەرپرسەی تۆ هێندە قسەی پێ دەڵێی، كە خاوەنی چل پەنجا ساڵ خەباتە، ئەگەر ئەو خراپ بێ، تۆش هەر وەك وی وای، ئەدی بەیەكەوە نەبوون و ڕەفیق نەبوون؟! بە ڕاستیی ئەوە شتێكی زۆر خراپە، كە ئێمە دەستمان داوەتێ، بۆیە ئەگەر بمانەوێ بارودۆخەكە ئاسایی بكەینەوە، دەبێ ڕاگەیاندنەكان كۆنترۆڵ بكەین.

**قۆناغی دووەم: بە یاسایی كردنەوە، پاش ئاسایی كردنەوە:** ئنجا بە یاسایی كردن، پابەند بین بە یاساو عورفی سیاسیی خۆمان لەماوەی (٢٥) ساڵی ڕابردوودا، وڵاتی خۆمان پێ بەڕێوە بردوە.

**قۆناغی سێیەم: كۆبوونەوە لە كەش و هەوایەكی ئارامدا:** لە جەوێكی هێمن و ئارامدا كۆ ببینەوەو بەیەكەوە گفت و گۆی دڵسۆزانە بكەین، بۆ ئەوەی چارەسەر بۆ كێشەكانمان دیاریی بكەین.

## پێنج بنەمای گرنگ و پێنج هەنگاوی کردەیی، بۆ چارەسەریی قەیرانی نێوخۆی هەرێم

بـــەڕێـــزان!

**پێنچ بنەمایەکان:**

**من پێنج بنەمای گرنگم بۆ چارەسەری قەیرانی هەرێم، لەبەرچاو گرتوون، لەگەڵ پێنج هەنگاوی کردەییدا:**

**بنەمای یەکەم:**

ئەوەیە کە، با هەموو لایەکمان کەم و کوڕییەکانی خۆمان ببینین، وە دانیشیان پێدا بهێنین، لە حیکمەتدا هاتوە دەڵێ: {إذا أحب الله عبداً، أبصره بعيوب نفسه} هەتا عەیبی خۆمان نەبینین و دانیشی پێدا نەهێنین، بۆمان چاك ناکرێ، گوتراوە: {فهم السؤال نصف الجواب} بەڵێ: با کەم و کوڕییەکانی خۆمان ببینین، با هیچمان پێمان وانەبێ، لەسەرووی ڕەخنەوەین، بەخوا هەموومان کەم و کوڕییمان هەن، ئەدی ئەم واقیعە کردەی دەستی ئێمە نیە؟، وەك پەندە عەرەبییەکە دەڵێ: {يداك أوكتا، وفوك نفخ} بەدەستی خۆت گرێت داوە، بە زاری خۆت فووت تێکردوە.

کابرایەك تەماشای کرد، خەڵك بەپارە دەپەڕنەوە لە ڕووبار، گوتی: ئنجا چ مەجبوورم بە پارە بپەڕمەوە، مەشکەیەك، چووپێکی هێنا فووی تێکردو بە دەستی خۆی بەستی و، خۆی هاویشتە سەری، تابپەڕێتەوە، لەنێوەندی ڕووباردا چووپ بوو، یان مەشکە بوو، هەواکەی لێ دەرچووو کەوتە پەلەقاژەی مەرگ،

هاواری دەكرد: دەربازم بكەن! پێیان دەگوت: {يداك أوكتا، وفوك نفخ} بەدەستی خۆت گرێت داوەو، بەزاری خۆت فووت تێكردوە، ئەم واقیعەش، ئێمە نابێ هیچ كاممان شانی لەبەر دەربهێنین، بڵێ خەتای من نیە، بەڵكو كێ زیاتر بەرپرسیارە، زیاتر خەتابارە، كەواتە: با بوێرانە دان بە هەموو كەم و كوڕییەكانی خۆماندا بهێنین، (الإعتراف بالخطأ فضيلة)، چونكە ناكرێ ئێمە هەڵەمان نەبێت و، ئەم واقیعەشمان ئاوابێ !!.

**بنەمای دووەم:**

با چاودێرییكردنی خوا بەسەر خۆمانەوە ببینین.

بەڕێزان! ئێمە میللەتێكی مسوڵمانین خوای پەروەردگار دەفەرمویێ:

﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق.

واتە: هەركەس پارێز لە خوا بكات دەرووی خێری لێ دەكاتەوە.

با جارجار بیر لە خواو، لە قیامەت و، لە مێژوو بكەینەوە، ئێمە خاوەنمان هەیەو بەس خۆمان نین.

**بنەمای سێیەم:**

ئێمە میللەتێكی مسوڵمانین و خاوەنی عەقیدەو كلتوورێكی مسوڵمانەتیین، لە ئیسلام و قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت و بەهای زۆر گەورە گەورە هەن، كە دەتوانین سوودیان لێ ببینین، یەكێ لەوانە بریتییە لەوە كە وڵات بە دادگەریی بەرێوە دەچێ و فەراح دەبێ، وە بە زوڵم، ئینسانماڵی خۆشی لێ وەتەنگ دێ، خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص.

واتە: ئاوەدانییەكان لەبەین نابەین، مەگەر خەڵكەكەیان زاڵم بێ، ئێمە بە زوڵم وڵاتەكەمان لێ وەتەنگ دێ، وە بە دادگەری وڵاتەكەمان فەراح دەبێ.

بنەمای چوارەم:

دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەم وڵاتە پێویستیی بە هەمووومانەو کەسی لێ زیاد نیە، وە هیچ کاممان بەتەنێ بەش ناکەین، بۆ خزمەتی ئەم وڵاتە، ئەوەتا بەهەمووشمان نەمانتوانیوە وەڵامگۆی داخوازییەکانی خەڵك بین، چ جا لایەنێك یان دوو لایەن!.

بنەمای پێنجەم:

وە پاشان ئێمە دەبێ بڕیارێکی کۆنکرێتییمان هەبێ - وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا - کە دەبێ ململانێ سیاسییەکان نەهێڵین سەر بکێشێ، بۆ چارەسەری ئەمنیی و بیرکردنەوەی سەربازیی و زەخت و فشار لەیەکدی کردن، ئەمە ناگونجێ، ئێمە لەیەك وڵاتداین و وەك سواربووانی کەشتییەك واین، ئەو کەشتییە لە هەر شوێنێکیەوە کونی تێ ببێ، ئێمە هەموومان غەرق دەبین، ئەوە بە نیسبەت ئەو بنەمایانەوە، کە بە پێویستم زانی بیانخەمە ڕوو.

## پێنج هەنگاوە کردەییەکان:

ئنجا پێنج هەنگاوی کردەیی بە خێرایی باسیان دەکەم:

یەکەم: گێڕانەوەی حورمەت و شکۆ بۆ هەرێمەکەمان و قەوارە سیاسییەکەمان، لەم ڕۆژانەدا بەرپرسێکی یەکێ لە وڵاتە ئەورووپییەکان هات بۆلام، گوتی: پار ئەم کاتە شکۆی ئەو هەرێمەی ئێوە لە ئێستا زۆر گەورەتر بوو، ئێستا بچووك بوونەتەوە، گوتی: پێم عەجیبە! تەماشا دەکەم: کورد کە دژایەتیی یەکدی دەکا، زۆر بە توندیی دژایەتیی یەکدی دەکاو خەتی سوورتان نیە، وە گوتی: ئێوە حورمەتێکی چاکتان هەیە، بەڵام بە دەستی خۆتان لە دەستی دەدەن، ئێستا بۆتان نیە گلەیی لە کەسی دیکە بکەن.

قسەکانی جوان بوون و دڵسۆزانە هاتنە بەرچاووم، بۆیە من پێم وایە: دەبێ بەخێرایی ئەو زەرەرەی گەیاندوومانە بە هەرێمەکەمان، قەرەبووی بکەینەوە،

ئەویش بەچی؟ ئەو بڕیارانەی لە ئەنجامی هەڵچوون و کاردانەوەوە داومانن، هەموویان هەڵبوەشێنینەوەو بێینەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆمان، وە بڕیارە کاردانەوەکان، بە لەغو دابنێین.

**دووەم:** پێکهێنانی دەستەیەکی باڵا، کە لە هەر شوێنێك بنکەو بارەگای حیزبێك، یان دەزگایەکی ڕاگەیاندن، زیانی پێ گەیەنراوە، دەستەیەکی باڵا لە حیزبەکان پێك بێت، بچن سەردانی بکەن و جۆرێك لە شکۆو حورمەتی بۆ بگێڕنەوە.

**سێیەم:** بە زووترین کات سەرۆکی پەڕلەمان و وەزیرەکان بگەڕێنەوە بۆ کاری ئاسایی خۆیان، کەسێك کە خۆی زیاتر بە بەرپرسیار دەزانێ لەم وڵاتە، دەبێ دڵی گەورەتر بێ و لێبوردەیی زیاتر بێ و عەقڵی گەورەتر بێ، لە حەقیقەتدا کێ زیاتری لەلا بێ و زیاتری هەبێ، زیاتری لێ چاوەڕێ دەکرێ.

**چوارەم:** دەست پێکردنەوەی کۆبوونەوەکان بەبێ وەخراندن، بەڵام بەگیانی یەکدی قوبووڵکردن و بە ڕووحی دابەزین بۆ یەکدی، بەخوا بە ڕێزان! ئەگەر بۆ یەکدی دانەبەزین، دەبێ بۆ خەڵکی دیکە دابەزین، من زۆرجار گوتوومە: لەنێو خۆماندا بەوەندە ئیکتیفا دەکەین، سەلام لە یەکدی بکەین، بەڵام غەیری خۆمان دەڵێ: دەبێ دەستیشم ماچ بکەی! ئنجا من بۆ نەچم بۆ لای برایەکەی خۆم و دەستی نەگوشم.

**پێنجەم:** وە پاشان دوای ئەوەی بارودۆخەکە ئاسایی و یاسایی دەکرێتەوە، ئنجا وەگەڕ خستنی ئیرادەیەکی جیددیی بۆ چارەسەرێکی ڕیشەیی، کە ئەم وڵاتە بەدامەزراوە بکەین، یاسای تێدا سەروەر بێ، ئاشتیی کۆمەڵایەتیی هێندە سەقامگیرو کۆنکرێتیی بێ، هیچ کەس و لایەنێك بیر لەوە نەکاتەوە زیانی پێ بگەیەنێ.

وە با ئەم وڵاتە وابێ، کە خەڵك و میللەتەکەمان دڵی پێ خۆش بێ و ئومێدەوار بێ و خۆڕاگر بێ، ئەگەر بەبیرتان بێ لە سەرەتای نەوەدەکاندا، بارودۆخی ئابووریی زۆر لە ئێستا خراپتر بوو، بەڵام خەڵك بۆچی سەبری لەگەڵ دەگرتین؟ تەماشای بەرپرسەکانی دەکرد، تەماشای وڵاتەکەی دەکرد، دەیبینی هەموومان ئاستمان

لەیەك نزیكە، بەڵام بەداخەوە ئێستا لە ئەنجامی ئەوەدا كە قۆرخكاریی و دزیی و گەندەڵیی هەیە، كابرا تەماشا دەكا خۆی زۆر مەحرڕوومە، بەڵام بەرپرسان و كاربەدەستان بە جۆرێكی دیكە دەبینێ، هەڵبەتە هەموویان نا، بۆیە پێویستە ئێمە دوای ئەوەی، كە ئەم بارودۆخە ئاسایی و یاسایی دەكەینەوە، كۆببینەوەو بە جیددیی بیر لە چارەسەر بكەینەوە، هیچ كەسیش چاوی لەوە نەبێ، كە دەبێ هەر لایەنەكان بۆلای وی بێن، هەموو دەبێ بۆ لای یەكدی بێین و، خاڵە هاوبەشەكان لەبەینی خۆمان دابنێین لە بازنەیەكداو، هەموومان هەمووومان بۆیەك دابەزین و لەیەك نزیك بین.

ئومێدم وایە بەو شێوەیە بكەین، وە من یەك لەباری خۆشم وەك دڵسۆزێكی هەموو لایەك، لەیەك مەسافەدا وەستاوم و كۆمەڵی ئیسلامیی، كە من بەرپرسییم لەیەك مەسافەدا وەستاوە، بەرامبەر بە هەموو لایەك، بەڵام تۆ جاری وا هەیە هەندێ قەناعەتت هەیە، لەو لا نزیكترە، یان لەم لا، وە ئێمە ئامادەشین هەمزەی وەصڵ بین و پردی بەیەك گەیشتن بین، وەك هەوڵیشمان داوە لە ڕابردوودا، كە هەوێنێك بین بۆ تەبایی، بەكردەوە نەك بەقسە، ئێستاش لەخزمەتی هەموو لایەك داین بۆ ئەوەی ئەو قەیرانەی لەگەڵیدا دەستەو یەخەین، ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە، تێبپەڕێنین، وە خوا یاربێ تێشیدەپەڕێنین، من گەشبینم ئەگەر تەماشای ڕابردووی خۆمان بكەین، بەسەر گرفتی زۆر گەورەتردا زاڵ بووین، ئەمە هەر هیچ نیە لەچاو ئەوەی ڕابردوو، لە ڕابردوودا خوێنی زۆر لە بەینێدا هەبووە، خوا پشتیوان بێ بەسەر ئەو گرفتانەدا زاڵ دەبین، وە خوای پەروەردگار لەخۆمان ڕازی دەكەین و، خەڵك و میللەتەكەشمان ئاسوودە دەكەین.

والسلام علیكم ورحمة الله وبركاته.

# بەرهەمەکانی دانەر

تێبینی: بەپێی ڕیزبەندیی کاتی چاپکرانیان، ڕیزکراون.

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی١/١٩٨٤، چاپی٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان. چاپی١/١٩٨٥، چاپی٣/ ٢٠٠٦.

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەوچۆنە؟ چاپی١/١٩٨٨، چاپی٣ /٢٠٠١.

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون. چاپی١/١٩٩٠، چاپی ٥ /٢٠١٢.
تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیء فارسییش.

٨- کوردستان بۆ وێران بووء چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!. چاپی ١ / ١٩٨٩

٩- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری گاغووت. چاپی١/ ١٩٩٠، چاپی ٢ /٢٠٠٥

١٠- سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی١/١٩٩٠، چاپی ٣ /٢٠٠٥.

١١- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٢- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٣- بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئایندەیەکی گەش و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٤- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٦- ئیسلام و کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٨

١٧- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی١/١٩٩٩، چاپی ٢ /٢٠٠٧.

١٨- مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی ١-٤. چاپی١/ ٢٠٠٠، چاپی ٢٠٠٩/٢.

١٩- گەڕانەوە بۆ لای خوا "عز وجل". چاپی١/٢٠٠١، چاپی٥ /٢٠١٠.

٢٠- زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟!. چاپی١/٢٠٠٢، چاپی ٣ / ٢٠١١
تێبینی : بۆ زمانی عەڕەبیش وەرگێڕراوە.

٢١- بنچینە گرنگەکانی هەڵس وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا. چاپی ١ / ١٩٩٩ .
تێبینی: بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٢- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٣- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ چاپی١/٢٠٠١، چاپی ٢ /٢٠١٢.

٢٤- بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی١ /٢٠٠١، چاپی٣ /٢٠١٤
تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش.

٢٥- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی.، چاپی ١ /٢٠٠١.

٢٦- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٣.

٢٧- مەوسووعەی: ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، بەرگی یەکەم چاپی١/٢٠٠٢، بەرگی ١و٢ چاپی ٣/ ٢٠١٣

٢٨- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم. چاپی١/٢٠٠٢، چاپی ٦ / ٢٠١٦
تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش.

٢٩- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٠- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی١/ ٢٠٠١، چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣١- چۆن هەڵس وکەوت لەگەڵا خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢
تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٢- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٣- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك.چاپی ١/ ٢٠٠٢

٣٤- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٥- جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٣٦- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر). چاپی١/٢٠٠٥، چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .
تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٣٧- کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی١/ ٢٠٠٥، چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٣٨- ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٣٩- مەوسووعەی: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ١-٦، چاپی ١/٢٠٠٦-٢٠٠٨، چاپی٢/٢٠١٦.

٤٠- تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان، چاپی ٢٠٠٨/١، چاپی ٢٠١٥/٣.
تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٤١- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا، چاپی ١/ ٢٠٠٦.
تێبینی: بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە.

٤٢- بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٣- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٤- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٥- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی، چاپی ٢٠٠٦/١.
تێبینی: بۆ فارسییش وەرگێڕاوە.

٤٦- قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنماییەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٧- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٨- بانگەواز بۆ لای خوا، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٩- قوتابییان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!، چاپی ٢٠٠٨/١.

٥٠- خواناسیی، ئایین، ئیمان، چاپی ٢٠٠٢/١، چاپی ٢ / ٢٠٠٩.

٥١- واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە، چاپی ١/ ٢٠٠٨.

٥٢- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، چاپی ٢٠٠٨/١، چاپی ٢٠١٥/٢.
تێبینیی: بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە.

٥٣- با لەخزمەت قورئاندابین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لەقورئان

بەهرەمەند دەبین؟) وە (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بەقورئان)ە}، چاپی ٢٠٠٨/١و ٢٠١١، چاپی ٢ /٢٠١٥

٥٤- سروشت و پایەكانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا، چاپی ٢٠٠٩/١.

تێبینی: ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە.

٥٥- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، چاپی ٢٠٠٩/١، چاپی ٢٠١٣/٣.

٥٦- چەند بابەتێكی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا، چاپی ٢٠١٠/١.

٥٧- وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی/٢٠١٠.

٥٨- گەنج لە پرسە هەنووكەییەكاندا (چاوپێكەوتنی ناجیح حەمە فەرەج). چاپی ١ ٢٠١٠.

٥٩- كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦٠- حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦١- چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا، چاپی ٢٠١٣/١.

٦٢- خاتوون مەلاژن: ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسەرێكی ناوازە. چاپی ٢٠١٢/١.

٦٣- ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی. چاپی٢٠١٢/١.

٦٤- مەلای گەورە كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦٥- هەڵسەنگاندنێك لەبارەی: هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، چاپی ٢٠١٢/١.

٦٦- یادو بۆنەو جەژنەكان و هەڵسەنگاندنێك، چاپی ٢٠١٢/١.

٦٧- ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی، چاپی ٢٠١٢/١، چاپی ٢٠١٤/٣.

٦٨- مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی: ١-٤، چاپی ٢٠١٤/١-٢٠١٦.

٦٩- تەرجەمەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٠- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم، سوورەتی: (آل عمران)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧٢- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء)، چاپی ٢٠١٣/١.

٧٣- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدە)، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام)، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٥- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم: سوورەتی: (الأعراف)، چاپی ٢٠١٦/١.

٧٦- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال)، چاپی ٢٠١٦/١.

٧٧- هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش)، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٨- با هەڵەو لادانی پەڕگیران، بەرانبەر بەئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٩- پەڕگیریی: هۆکارەکانی، شوێنەوارەکانی، چارەسەری، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٠- ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی یەکەم/٢٠١٥.

٨١- سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٢- چەند مەڵۆیەك لەخەرمانی تەمەنم، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٣- بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دوارۆژدا، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٤- گیانی ژیان، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٥- چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٢٠١٥/٥/٣٠.

٨٦- مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا.

٨٧- دیبەیتی ساڵ: سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەکوردستاندا، چاپی ٢٠١٦/١.

٨٨- ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی هەرێم، گرفت و چارەسەر.

**کتێبە عەرەبییەکان:**

موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله.

کە لەچاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لەچاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە:

٨٩- الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق.

٩٠- الكتاب الثاني: تعريف الإيمان.

٩١- الكتاب الثالث: الإيمان بالله تعالى: الخالق الرب المالك الإله...

٩٢- الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة وبالجن.

٩٣- الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم.

٩٤- الكتاب السادس: القرآن العظيم.

٩٥- الكتاب السابع: الإيمان برسل الله وأنبيائه الكرام.

٩٦- الكتاب الثامن: خاتم النبيين محمد (صلى الله عليه وسلم): موجز سيرته وبراهين نبوّته.

٩٧- الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله.

٩٨- الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى.

٩٩- الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام.

١٠٠- الكتاب الثاني عشر: الإسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم.

١٠١- نقض فكرة التطرف. ط١/٢٠١٦.

١٠٢- ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية)، ط١/٢٠٠٦.

١٠٣- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم)، ط١/٢٠٠٦.

**ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن:**

١٠٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبە).

١٠٥- قەیرانە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان (پانێڵی ئەنیستیۆتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست)، ٢٠١٤/١١/٦.

١٠٦- كلمتان موجزتان حول مايجري على الساحة العراقية، (٢٠١٤ و ٢٠١٥).

# پێڕستە وشە

# نێـوەڕۆك

# ڕوانینێکی ئیسلامیانە بۆ واقیعی ئێستامان.

ئەم کتێبە ...

هەوڵێکە بۆ خستنە ڕووی بیروڕاو تێگەیشتنی بەندە بۆ واقیع و هەل و مەرجی دژوار و هەستیاری هەرێمی کوردستان وهۆکاری (قەیران و کێشەکانی و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان) •

ویستوومە دڵسۆزانە و بە ڕوونیی، ئەوەی بە ڕاست و باشی دەزانم، باسی بکەم، وەك بەشێك لە ئەرکی سەرشانم بەرانبەر بە خەڵك و وڵات •


نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هۆتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice




8000 دینار

